# هەڵەکوشندەکانی
# سەرکردایەتی سیاسی کورد

## هەولێر - کەرکوک - بەغدا



نووسین و ئامادەکردن:
سەرکەوت حمد ابراهیم

2018

هەڵەکوشندەکانی
سەرکردایەتی سیاسی کورد

نووسین و ئامادەکردن:
سەرکەوت حمد ابراهیم

بەرگ: ابراهیم صالح

# هەڵە کوشندەکانی سەرکردایەتی سیاسی کورد

ئامادەکردن و کۆکردنەوەی:
سەرکەوت حمد ابراهیم

ناوی کتێب: هەڵە کوشندەکانی سەرکردایەتی سیاسی کورد
ناوی ئامادەکار و نووسەر: سەرکەوت حمد ابراهیم
بابەت: ڕەخنەی سیاسی
نۆبەتی چاپ: یەکەم
چاپخانە:
تیراژ: ٥٠٠ دانە
نرخ:
ژمارەی سپاردن:

# پـێشـەکـی

ئەم کتێبە باسی مشتێک لەخەرمانی هەڵە کوشندەکانی سـەرکردایەتی سیاسی کورد بەتایبەت (پارتی، یەکێتی )دەکات، بەرامبەر بەدۆزی ڕەوای گەلەکەمان لە گشت پارچەکانی کوردستان بەتـایبەت (هەولێر، کەرکوک ، بەغـدا) ، ئەوەی لێـرەدا ئامــاژەم پێــی داوە  خــۆی لەعێـراق دەبینێـتەوە بەگشـتی، جگە لە و پەیوەنـدیە ناتەندروسـتەی سـەرانی هەرێـم بەوڵاتـانی هەرێمی و نێودەوڵەتی، بازرگانی نەوت و دیارنەمانی داهاتەکەی.

لەکاتێکدا دەرفەتە زێرینەکـانی گەلـی کـورد تائێسـتا نەقۆزراونەتەوە، بەهـۆی ململانێـی نـاوخۆ لەسـەر دابەشـکردنی بیـرە نەوتەکـان لەنێـوان بەرپرســە حیزبــی حکومیەکــان نەوت و دەســتکەوتە کەســی و حیزبــی لەپشکی حکومەتەکانی (هەرێم ، بەغدا).

بۆیە هـیچ دەرفەتێک نەمـاوە بۆ بەردەوام بـوونی ئەم سـەرکردایەتیە شکست خواردووە، ناکرێ و نابێ چاوەڕوانی موعجیزە لەو دەسـەڵاتدارانە بکرێ کە دەنگی ئازاد بەئاشکرا کپدەکەن، تاوانبارن بەخیانەتی نیشـتمانی و گەنـدەڵی دەیـان دۆسـیەی دژی بە مافەکـانی مـرۆڤ، شـکاندنی کەرامەتـی هـاوڵاتی کـورد، تیرۆرکردنـی ڕۆژنامەنووسـان بەتـایبەتی هەرسـێ کەیسـی (زەردەشت عوسمان، کاوە گەرمیانی، ویداد حسـێن) وەکو پەڵەیەکی ڕەش بەتەوێڵی بەرپرسانی یەکێتی و پارتیەوە دەمێنێتەوە بۆ هەمیشە.

لێرەدا مـن زۆر هەوڵـی بێ لایەنـی خۆمـداوە، بەڵام ئەگەر بێتە سـەر باسـی ئەوە بـۆ ئەوەنـدە ڕەخنەکانـت ڕووە بەرپرسـانی پـارتی و یەکێتیە،

چونکە تا ئەو زەمەنەی ئێمەی تێدایە یەکێتی پارتی بەرپرسی شکست و خیانەت گەلێکن بەرامبەر نیشتمان و گەل.

لەسەرەتای کتێبەکە باسی سیستەمەکانی فیدراڵی و کۆنفیدراڵی، ئۆتۆنۆمی، ریفراندوم، مادەی ١٤٠ دەستوری هەمیشەی عێراق، کردووە وەکو بەرچاو ڕوونیە بۆ خوێنەران کە هەردوو حکومەتەکانی(هەرێم ، بەغدا) پێشێلی دەستووریان کردووە، هەمیشە سەرکردایەتی عەرەب بە سونەو شیعەوە چەندان ئیمتیازاتی ماددی و مەعنەویان بەخیشوەتە سەرکردەکانی کورد بۆ دەستهەڵگرتن لە دۆزی ڕەوای کورد، ناوچە دابرێنراوەکانی هەرێم....

سەرکەوت حمد ابراهیم

زستانی ٢٠١٨

لەندەن

## فیدرالیزم

فیـــدرالیزم، وەک ئامرازێـــک بـــۆ هاوســـەنگـــی نێـــوان هێزەکـــانی دوورکەوتنەوە لەناوەند و نزیک بوونەوە لەناوەند لەکۆمەڵگادا، ئەمڕۆ کە لەبەرانبەر پرۆسەی تێکچوونی دەوڵەتە فرەنەتەوەییەکاندا باس و بەرگرییەکی زۆری لێوە دەکرێت. ئەگەر هەندێک لەم دەوڵەتانە پێشتر لەژێر زەختی "ڕاپەڕینی کتوپڕی نەتەوەکان"دا ڕوخان، ئەمڕۆکەش زۆر نەتەوە هەن کە لەژێر زەختی دەوڵەتەکان دان و بە ئاشکرا وەکو پەراوێزی پێوەندیدار بە نەتەوە، کەلەپوور و زمان ناسراون. سیاسەتی زۆربەی ئەو دەوڵەتانە لەڕاستیدا پێشگرتنە لەگەشەسەندنی ئاواتەکانی ئەم نەتەوانە. وڵاتانێک کە بە"کوورەی تواندنەوە" ناسرابوون، دواتر بەهۆی مانەوەی ئەو نەتەوانەی کە لەئەنجامی سیاسەتی تواندنەوەیاندا هەر وا لەسەر پێ بوون، ترسی ئەوەیان لێ نیشت کە نەکا دوای ژیانەوە و گەشەسەندنیان، بێزار بن لە"توێنەران"، یان ئەوەی کە دڵخوازانە بڕیار بدەن بۆ ناساندنی خۆیان بە "خۆ"گەلێکی ڕەسەن و خاوەن ڕەچەڵەکی تایبەت. سەردەمی ڕاگەیەنەر و پێوەندییەکان و هەروەها پەرەپێدانی ناتەواوی دامەزراوە دیموکراتیکەکانیش بۆ ناوچەکانی پەراوێز، چاوەڕوانیەکانی ئەم گروپانەی بەرز کردووەتەوە بۆ بەرزترین ئاست، بەتایبەت کاتێک کەزۆربەی ئەم نەتەوانە بەڕادەیەک گەورەن کە دەبێت لە بەرچاو بگیردرێن، هەر چەند زۆرتر ئاواتیان ئەوە بووە کە لەڕێکخستنە دێمۆکراتیکەکاندا بەشدار و هاوبەش بکرێن. بەڵام سەرەڕای ئەوەی کە ڕەنگە سەردەمی ئەوە کۆتایی پێهاتبێ کە دەوڵەتەکان داواکاریی یەکدەست بوونیان هەبێت، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا، لەهەندێک کۆمەڵگای فرە چەشنیدا

بەهۆی مانەوەی هەندێک بیرۆکەی سڕینەوە و توێنەرانە، ئەمە وتنی هاسانترە لەچاو جێبەجێ کردنی. هەرچۆنێک بێت، بارودۆخی تازە پێکهاتوو، دەوڵەتەکانی هاندا بۆ وەپێش گرتنی ڕێگایەکی نێوەنجی، واتە بەرگری لەفیدرالیزم وەک پێشگرتن لەجیابوونەوە.

لەم پێوەندییەدا، بیرمەندانی سیاسی سەبارەت بەدابەشکردنی دەسەلاتی سیاسی بەشێوەی ئەستوونی، بەگشتی باس لەدوو جۆرە پێکهاتەی حکوومەتی دەکەن، یەکتیکە (یونیتەری) و فیدراڵ. بەپێچەوانەی یەکتیکە. لەپێکهاتەی حکوومەتی فیدراڵدا جگە لەجیاکردنەوەی دەسەلاتی سێیانەی حکوومەتی، بەشێوەی ئاسۆیی، واتە دەسەلاتەکانی یاسادانان، جێبەجێکاریی و دادوەریی، بەپێی یاسای بنچینەیی فیدراڵ و هەرێمەکان، کارەکانی دەسەلاتی حکوومەتی دابەش دەکرێت لەنێوان حکوومەتی ناوەندیی و حکوومەتی هەرێمەکاندا. حکوومەتی فیدراڵ یان ناوەندیی زۆرتر لەسەر بابەتە گرنگەکانی پێوەندیدار بە بەرژەوەندیی گشتی یان هاوبەش وەکو ئاسایشی گشتی و سوپای وڵات، ئابووریی و بابەتەکانی پێوەندیدار بە دارایی و پارە، هێما نیشتمانیەکان و سیاسەتی دەرەوە بڕیار دەدات و حکوومەتی هەرێمەکانیش زۆرتر لەسەر ئەو بابەتانە کار دەکات کە لە باری هەرێمی و خۆجێییەوە گرنگایەتیان هەیە. ئەو یەکە بچووکانەی کە فیدراسیۆنەکە لەیەکیەتی ئەوان پێکدێت ئێستا بەهەر ناوێکەوە وەک ویلایەت (ستەیت) لەئەمریکا و هێند، کۆمار لە رووسیا، کانتۆن و پارێزگا و ... هتد، خاوەن مافی خودموختارین. یاسای بنچینەیی فیدراڵ یان گرێبەستی پێکهێنانی فیدراسیۆن، دابەشکردنی دەسەلات و سنوورەکان لەنێوان ناوەند و یەکەکاندا، دیاری دەکات. لەم سیستەمە حکوومەتیەدا

لەفیدراسیۆن، لەڕێگای پرۆسەیەکی فەرمی و یاساییەوە کەلەیاسای بنەڕەتیدا پەسەند کراوە، ڕێپێدراوە. لەم جۆرە دەوڵەتەدا گۆڕینی یاسای بنچینەیی بە ڕێکەوتنی ڕێژەیەکی دیار لەیەکەکان جێبەجێ دەکرێت. کەواتە سەروەریی یان دەسەڵاتی سیاسی لەنێوان حکوومەتی فیدراڵ و حکوومەتە هەرێمیەکان بەجۆرێ دابەش دەکرێت، کە هەر کامەیان لەهەرێمی خۆیدا سەربەخۆ بێت لەوی تر. بۆ ئەو وڵاتانەی کە کەلێنی کۆمەڵایەتی گرنگیان تێدا نییە و لەباری حەشیمەت و پانتاییشەوە زۆر گەورە نین بەشێوەی گشتیی حکوومەتی یەکتیکە بەکاردەهێنرێت. بەڵام ئەم جۆرە وڵاتانە لە جیهاندا بەڕێژەی قامکەکانی دەست بوونیان نییە و زۆربەی وڵاتان جۆری دووهەم، واتە فیدرالیزمیان هەڵبژاردووە کە لەم ڕێگایەوە هەم دیمۆکراسی بەدیبهێنرێت واتە حکوومەت بەخەڵکەوە نزیک بکرێتەوە و گرووپە کۆمەڵایەتیەکان بەشداریی بکەن لەکاروباری حکوومەتیدا، وە هەم هاسانکاریی بکرێت بۆ جێبەجێ کردنی ئەرکە جۆراوجۆرەکان.

مێژووی سیستەمی فیدراڵ دەگەڕێتەوە بۆ ئیسرائیلی کۆن و نزیکەی ٣٢٠٠ ساڵی پێش و پاش ئەوەش هەندێ دەوڵەتی تری وەکو حکوومەتی ماددەکان و حکوومەتەکانی پاش ئەوان لەئێرانی کۆن و دەوڵەت شارەکانی یۆنانی هێلینیکی و کۆماری رۆمی کۆن. چەمکی ئێستای فیدراسیۆن دیاردەی کۆتایی سەدەی ١٨ تا ناوەڕاستی سەدەی ٢٠ بوو. سەدەکانی ١٨ و ١٩ نوێنەرایەتی سەردەمێکی مێژوویيان کرد، کە فیدرالیزم سەریهەڵدا، تارادەیەک کەپێی گوتراوە "سەردەمی فیدرالیزم".

هه‌رچه‌ند هه‌ندێكی تر وه‌ک رایكه‌ر و برومه‌نز به‌هۆی ڕێژه‌یه‌كی زۆر به‌ فیدراڵی بوون، سه‌ده‌ی بیسته‌میان وه‌كو سه‌رده‌می ڕاستی فیدرالیزم ناودێر كرد. له‌ حكوومه‌ته‌ دیمۆكراتیكه‌كان دا، تا پێش ١٧٥٠ سویسرا فیدراڵ یان به‌ جۆرێک كۆنفیدراڵی بوو. سویس نموونه‌یه‌كی ده‌گمه‌نه‌ كه‌ له‌ ١٢٩١ به‌ملاوه‌ كۆنفیدراسیۆنی هه‌بووه‌ كه‌ به‌هه‌ر شێوه‌یه‌ک بووه‌ ماوه‌ته‌وه‌ تا ١٧٤٨ كه‌ به‌ شێوه‌یه‌كی مۆدێرن بنیاتنراوه‌ته‌وه‌. له‌ سه‌رده‌می مۆدێرندا كۆمه‌ڵێک شه‌پۆلی به‌ فیدرالیزم بوون بینراوه‌. ویلایه‌ته‌ یه‌كگرتووه‌كانی ئه‌مریكا یه‌كه‌م فیدراسیۆنی دیمۆكراتیكی نوێ بوو كه‌ له‌ ١٧٨٩ دا سه‌ریهه‌ڵدا. كه‌واته‌ فیدرالیزمی مۆدێرن پتر له‌ دوو سه‌ده‌ له‌مه‌وبه‌ر له‌ ئه‌مریكاوه‌ ده‌ستی پێكرد. هه‌موو ده‌وڵه‌ته‌ فیدراڵه‌كانی تر لاسایی مۆدێلی ویلایه‌ته‌ یه‌كگرتووه‌كانی ئه‌مریكایان كردووه‌ته‌وه‌، ئه‌گه‌رچی ئه‌وان ده‌با چاكسازییان كردبایه‌ بۆ گونجان له‌گه‌ڵ پێویستییه‌كانی خۆیان. له‌نێوان ساڵه‌كانی ١٨٥٠ – ١٩٠٠ دا كه‌نه‌دا (١٨٦٧) و دوو وڵاتی ئه‌وروپای ڕۆژئاوا واتا ئاڵمان كه‌ چوارچێوه‌ی فیدرالیزمه‌كه‌ی له‌ ١٨٧٠ له‌لایه‌ن "بیسمارک"ه‌وه‌ دانرا و ئوستریا (نه‌مسا) كه‌ پرۆسه‌ی به‌ فیدراڵ بوونی له‌ ده‌یه‌ی ١٨٩٠ دا تێپه‌ڕاند، بوون به‌ فیدراڵ. هه‌روه‌ها له‌ كۆتایی سه‌ده‌ی نۆزده‌ و سه‌ره‌تای سه‌ده‌ی بیسته‌مدا هه‌ندێ له‌ وڵاتانی ئه‌مریكای لاتین وه‌ک ئارژانتین ، برازیل ، میكزیک ، ڤێنیزۆێلا بوون به‌ فیدراڵ. له‌ نێوان ساڵه‌كانی ١٩٠١ – ١٩٥٠ دا شه‌ش ده‌وڵه‌ت: ئوستراليا (١٩٠١) ، یه‌كیه‌تی سۆڤییه‌ت ، یوگۆسلاڤیا له‌ ئه‌وروپا، هیندووستان (١٩٥٠) و پاكستان (١٩٥٦) له‌ ئاسیای باشوور وه‌كو فیدراسیۆن سه‌ریانهه‌ڵدا. له‌نێوان ساڵه‌كانی ١٩٥١ – ١٩٦٥ له‌ ئافریقا، نیجیریا (١٩٦٠) و كامیرۆن (١٩٦١) و تانزانیا (١٩٦٤) و له‌ ئاسیا مالیزیا (١٩٦٣) وه‌كو فیدراسیۆن

پێکهاتن. لە کۆتایی سەدەی بیست و سەرەتای بیست و یەک، هەندێ وڵاتی تر وەک : لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست ئیماراتی یەکگرتووی عەرەبی (١٩٧١) ، ئیسپانیا (١٩٧٨) بەلژیک (١٩٩٣) ، ئافریقای باشوور (١٩٩٦) و عێراق (٢٠٠٣) بوون بە فیدراڵ. زۆرینەی ئەو دەوڵەتانەی سەرەوە لەو وڵاتانەدا سەریانهەڵداوە کە لە سێ تایبەتمەندیی وەک گەورەیی لەباری جوگرافیاییەوە، جۆراوجۆریی کولتووری – کۆمەڵایەتی و زۆربوون و ترنجاوی حەشیمەت ، یەک یان دوو یان هەر سێکیان پێکەوە هەبووە.

هەرچۆنێک بێت، ئەورۆکە زۆربەی وڵاتە پان و بەرینەکان ، حکوومەتی فیدراڵییان هەیە. لە زۆرێک لە وڵاتانی بچووکیشدا کە جیاوازیی و کەلێنی کۆمەڵایەتییان هەیە کەڵک لە فیدرالیزم وەردەگیردرێت. گۆڕەپانی کار و کردەی فیدرالیزم بەربڵاوە. ئەلەزار لە ساڵی ١٩٨٧ دا ، ویڕای ئاماژە کردن بەناوی ٢٢ وڵاتی فیدراڵ، دەستەواژەی "وەرچەرخانی فیدراڵی" بەکارهێنا. لە ١٩٩٩ دا نزیکەی ١٨٠ وڵات هەبووە (نزیک بە ٥٢ لە سەدی خاکی جیهان) کە لە کۆی ٢٤ فیدراسیۆن، نزیکەی دوو ملیارد خەڵک یان ٤٠ لەسەدی حەشیمەتی جیهانیان لەخۆ گرتووە. لەو کاتەوە تاکو ئێستا چەندین وڵاتی دیکە ئەم سیستەمەیان هەڵبژاردووە. لە هەندێک نووسراوەدا ئاماژە بەفیدراڵی بوون دەکرێت وەکو تایبەتمەندی دیاری پێکهاتەی حکوومەتیی لە سەدەی ٢١ دا . لە درێژەدا فیدرالیزم وەکو میکانیزمێکی سەرەوەتر لەتەنیا حکوومەتێکی فیدراڵی و فیدراسیۆن، زۆرتر شیدەکرێتەوە.

## ١- پێناسە و بنەماکانی فیدرالیزم

وشەی "فیدرالیزم" ریشەکەی لە وشەی لاتینی foedus دایە کە بە واتای ڕێکەوتن، یەکیەتی و یەکگرتووییە. لەماوەی سەرهەڵدانی ئەمریکاوە، واتای ئەمڕۆکەی بەخۆیەوە گرت. مۆنتیسکیو وەکو "فیدرالیزم" بەکاری هێنا ، بەڵام چەمکەکە دەگەڕێتەوە بۆ سەدەی چواردەهەم. لە سەدەکانی ناوەڕاستدا، پێش سەردەمی مۆدێرن، جانز ئاڵتوسیوس (١٦٠٣) یەکەمین کەس بوو کە لەوە تێگەیشت فیدرالیزم بەڕاستی پێوەندی هەیە بە کێشەکانی وڵاتێکەوە و لەم بارەیەوە یەکەم دەقی لەسەر تیۆری فیدراڵ نووسی. بۆیە وەکو باوکی ڕاستەقینەی تیۆری فیدراڵی مۆدێرن ناسراوە. چەمکە فیدرالیستییەکان لە ڕێگای کۆمەڵێک تیۆری داڕێژی وەک ئاکویناس، کانت، هیوم ، سپینۆزا، مۆنتسکیو، ئالتوسیوس و ڕووسۆ دەگەڕێنەوە بۆ یۆنانیەکانی کۆن. ئەم تیۆر داڕێژانە و زۆرێکی تر، کاریگەریان هەبووە لەسەر بیری یەکەمین فیدڕالیستەکانی ئەمریکا و باسە بەرینەکانیان لەگەڵ "دژە فیدرالیستەکان" و ڕەخنەگرانی دیکە. بۆیە فیدرالیزم لە بنەڕەتدا بە داهێنانێکی ئەمریکایی دەزانرێت. لۆرێنس ترایب ئاماژە بە شەش بیرۆکەی زەقی سیاسی سیستەمی ئەمریکایی دەکات : نوێنەرایەتی، کۆماریخوازیی، فیدرالیزم و جیایی دەسەڵاتەکان، یەکسانی لە بەرامبەر یاسا، خودموختاریی تاکەکەسی و دادپەروەریی پێوەندیدار بە ڕێسای کار. هەروەها ئەوروپاییە مۆدێرنەکانیش بەشێوەی ئاسایی لەم چەمکە کەڵکیان وەرگرتووە، بۆ جەخت کردنە سەر لایەنەکانی خودموختاری یەکە ئەندامەکان.

فیدرالیزم لە بەربلاوترین واتایدا، ئاماژەیە بۆ پێوەندی خەڵک و یەکە سیاسییەکان لە یەکیەتیەکی بەردەوام، بەلام سنووردرادا، بەپێی ڕەزامەندی دوو لایەنە. حکوومەتە پێکهێنەرەکان دەبێت لانیکەم مافی پاراستنی تەواوەتی خاکی خۆیان، مافی نوێنەرایەتی لە دامەزراوەکانی حکوومەتی ناوەندیی و هەروەها مافی پاڵپشتی و پشتیوانی حکوومەتی فیدراڵیان لەخۆ لە بەرانبەر دەسدرێژی دەرەکیدا هەبێت. بۆیە لە تیۆری سیاسیدا، چەمکی فیدرالیزم ئاماژە دەکات بە سیستەمێکی سیاسی کە دەسەلات لە نێوان حکوومەتێکی ناوەندیی و یەکە پێکهێنەرەکانیدا دابەش دەکات، بەجۆرێک کە هەر ئاستێک لە دەسەلات سەرووەریی سەرەکی لە هەندێ بابەتی دیاردا هەیە. وڵات دابەش دەکرێت بە هەرێمگەلێکی جیاواز و خاوەن حکوومەتی تایبەت بەخۆ و خاوەن مافی یاسادانان و باج وەرگرتن بەپێی دابەشکردنی یاسایی دەسەلات لەنێوان حکوومەتی ناوەندیی و هەرێمەکاندا. سەرووەریی لەنێوان ئەم دوو ئاستەی حکوومەت دا دابەش دەکرێت و دەخرێتە چوارچێوە یاسایەکی نووسراو کەتەنیا بە شێوازگەلێکی تایبەت چاکسازیی تێدا دەکرێت، کە دەبێتە هۆی بەرزبوونەوەی ڕەوایی و زیاترکردنی ڕەزامەندیی سیاسی. لە سیستەمە فیدراڵەکاندا، ڕێبازە بنەڕەتیەکان لە ڕێگای وتووێژەوە دادەنرێن و جێبەجێ دەکرێن تاکو هەموو ئەندامەکان لە بڕیاردانەکان و دواتر جێبەجێ کردنیاندا بەشدار بن. کەواتە فیدرالیزم بریتیە لە تێکەڵێک لە خۆحکوومەتی (خودموختاریی) ، حکوومەتی سنووردار و حکوومەتی هاوبەش، کە ئاماژە دەکات بە پێکەوەبوونی دوو ئاستی سەربەخۆی حکوومەت کە هاوکات بەسەر هاوڵاتییاندا حوکم دەکەن. بە واتایەکی تر لە دەوڵەتی فیدراڵدا،

ناوەند خودموختاری یان سەروەریی تەواوی نییە، خودموختاریی یان سەروەریی بە شێوەیەکی بالانسکراو یان نابەرامبەر دابەش دەکرێت.

لەم پێوەندییەدا ، چاکترین پێناسەی کورت و بە کەڵک بۆ فێدرالیزم هی دانیەل ئەلەزارە : "حکوومەتی خۆ لەگەڵ حکوومەتی هاوبەش" . واتە فێدرالیزم تێکەڵێکە لە "خۆحکوومەتی" لەگەڵ "حکوومەتی هاوبەش" لە پێوەندیەکدا، بەپێی گرێبەست و پەیمانێک کە دابینکراوە بۆ دابەشکردنی دەسەلات. لە ڕاستیدا فێدرالیزم دابەشکردنێکی تری ئەستوونی یان جوگرافیایی شیاویەتیەکان و دەسەلاتەکانی، لە دوو ئاستی جیاوازی حکوومەتیشدا زێدە کردووە بە جیاکردنەوەی ئاسۆیی یان ڕێکخراوەیی دەسەلاتەوە. ئەلەزار فێدرالیزم وەکو "ئەو شێوازەی ڕێکخستنی سیاسی دەبینێت کە یەکەکان، حکوومەتەکان لەناو سیستەمێکی سیاسی بەریندا جیا دەکەنەوە بە جۆرێک کە ڕێگە بەهەر کامیان دەدرێت یەکیەتی سیاسی بنەڕەتی خۆی بپارێزێت" بەوتەی ناوبراو، سیستەمە فێدراڵەکان لە ڕێگای دابەشکردنی دەسەلات لەنێوان حکوومەتی ناوەندی و یەکەکان لە پەیماننامەیەکدا کە گەلاڵە کراوە بۆ پشتگیری لە بوون و دەسەلاتی هەموو حکوومەتەکان، ئەم کارە جێبەجێ دەکەن. لە ڕێگای پێویست بوونی ئەو سیاسەتە بنەڕەتیانەی کە دادەنرێن و جێبەجێ دەکرێن و لە ڕێگای وتوویژ بەشێوازی جۆراوجۆر، توانا بەهەموان دەدا بۆ بەشداریی لە بڕیاردانەکانی سیستەم و پرۆسەی جێبەجێ کردنی بڕیار. بەپێی بۆچوونی ئەلەزار ، نا-ناوەندیی کردن نێوەڕۆک و بنەمای فێدرالیزمە. بەپێی ئەو بۆچوونەی ئەلەزار، بنەما بنەڕەتیەکانی دەوڵەتی فیدڕاڵ ئەمانەن : هێزی دەوڵەتی فێدراڵ لە دەسەلاتی نیشتمانییەوە سەرچاوە ناگرێت بەڵکو لە دەسەلاتی

ڕەواوە کە بە گشتی خەڵک پێیان بەخشیوە سەرچاوە دەگرێت، هەردوو حکوومەتی نیشتمانی و حکوومەتە پێکهێنەرەکان بە تەنیا خاوەنی ئەو دەسەڵاتەن کە پێیان سپێردراوە، و هەموو حکوومەتەکان سنووردار دەکرێنەوە بە یاسای بنچینەیی نیشتمانی هاوبەش. رایکەر (١٩٧٥) لە پێناسەی فیدرالیزمدا دەڵێت : "فیدرالیزم ڕێکخراوێکی سیاسیە کە تێیدا چالاکیەکانی حکوومەت لە نێوان حکوومەتە ناوچەییەکان و حکوومەتی ناوەندیی دابەش دەکرێن بە جۆرێک کە هەر کام لەوانە هەندێ چالاکی هەیە کە بڕیاری کۆتاییان لەسەر دەدات". بە واتایەکی تر فیدراسیۆنەکان لە حکوومەتە پێکهێنەرەکان یان حکوومەتە ناوچەییەکان و حکوومەتی ناوەندیی پێکدێن و هەر دوو ئاستی حکومەت، لە هەندێ بواردا دەسەڵاتی بڕیاردانی کۆتاییان پێدەبەخشرێت. لە خاڵەکانی یاسای بنچینەییدا دەبێت لانیکەم بەڕوونی ئاماژە بکرێت بە بوارێکی بڕیاردانی کۆتایی بۆ هەر جۆرێکی حکوومەت (ناوچەیی یان ناوەندیی). بەشێوەی یەکلایەنە هیچکام لە دوو ئاستی حکومەت (ناوچەیی یان ناوەندیی) ناتوانن ئەم شیاویەتییەی بڕیاردانی دیاریکراو بگۆڕن. بە واتایەکی تر گۆڕانی یاسای بنچینەیی پێویستی بە ڕەزامەندی هەردوو ئاستی حکوومەت دەبێت. رایکەر بۆ خۆی ئاماژە بەوە دەکات کە فیدراسیۆن دەرەتانێکی بەربڵاو دەهێڵێتەوە بۆ ناکۆکی و گۆڕان لەناو گرووپی هەرێمە پێکهێنەرەکانی سیستەمی فیدراڵی : لانیکەم، دەسەڵاتدارانی فیدراسیۆن تەنیا لە بوارێکی سنووردارکراوی بەرتەسکدا دەتوانن بڕیار بدەن، لانی زۆر، ئەوان دەتوانن لە هەموو بوارێکدا بڕیار بدەن جگە لە بوارێک. بە شێوەیەکی نموونەیی، نیشاندەرەکانی فیدرالیزم دەبێت ئەم جیاوازیانە پیشان بدەن.

لە پێناسەی "ویێر" دا (١٩٦٦) یاسای بنچینەیی فیدراڵ بە شێوەیەکی یاسایی، دەسەڵات لەنێوان حکوومەتێک بۆ وڵات بە گشتی و حکوومەتگەلێک بۆ بەشگەلێک لە وڵات دابەش دەکات، بە شێوەیەک کە هەر حکوومەتێک بەشێوەی یاسایی لەناو چوارچێوەی خۆیدا سەربەخۆیە. لە پێناسەی کارل "فریدریش" دا (١٩٦٨)، لە باری تەکنیکەوە، فیدرالیزم ئاماژە دەکات بە پێوەندی یاسایی لەنێوان حکوومەتی نیشتمانی و ویلایەتەکان وەکو یەکەکانی یەکیەتی. ئەمە سیستەمێک لە ڕێساکانە بۆ دابەشکردنی بەرپرسایەتیەکانی سیاسەتی گشتی لەنێوان ڕێژەیەک ئاژانسی حکوومەتی خودموختاردا. ئەمە سیستەمێکە کە تێیدا ئەو دەوڵەتانەی کە تا ئێستا سەربەخۆ بوون پەیوەندیان پێکەوە کردووە بۆ پێکهێنانی حکوومەتێکی هاوبەش بۆ هەموو ویلایەتە یەکگرتووەکان کە هێشتا نایانەوێت شوناسیان لەدەست بدەن. لە ڕاستیدا ئەمە پرۆسەیەکە کە لە ڕێگای ئەوەوە گروپەکان یەک دەگرن بۆ جێبەجێکردنی ئامانجگەلێکی دیاریکراو، لە کاتێکدا کە تایبەتمەندیی گرووپیی جیاوازی خۆیان دەپارێزن.

سێلن و ڤاندێڤیر جەخت لەسەر دابەشکردنی سیاسەتی گشتی دەکەن و دەڵێن سیستەمێکی فیدراڵ ئەو سیستەمەیە کە دەسەڵاتی ئەم سیاسەتانە دابەش بکات لەنێوان حکوومەتە پێکهێنەرەکان و حکوومەتی ناوەندیدا. جێننا بێندار (٢٠٠٩) پێویستیەکانی "فیدراسیۆنی گەورە" دیاری دەکات، کە بریتین لە سنوورگەلێکی جوگرافیایی و دەسەڵاتێک کە ناکرێت بە شێوەیەکی یەک لایەنە هەڵوەشێتەوە لەلایەن ویلایەتە پێکهێنەرەکان و حکوومەتی ناوەندیەوە. کەواتە دەسەڵاتی باج وەرگرتن، ڕێکخستنی

پـۆلیس، بەڕێوبـەرایـەتـی سـامانە سروشـتییەکـان، ئاسایشـی نیشـتمانی، دادوەریـی، چـاودێریی تـەندروسـتی، پـەروەردە و کۆمـەڵێک بـواری پێـوە دیداری دیکە بە بابەتەکان. بە شێوەی تـەواو جیاواز لـە نێـوان فیدراسـیۆنە جیاوازەکاندا هاوبەش دەکرێن و ئینجا بڵاو دەکرێنەوە.

بەپێی ئەو پێناسانەی سەرەوە، ڕاڤە جیاوازەکان لـەسـەر فیدرالیزم هـەنـدێ بنـەمـای هاوبـەشـیان هەیـە. یـەکـەم ئـەوەی کـە، فیـدرالیزم جۆراوجـۆریی کۆمـەڵگا مرۆییـەکـان لـەبـەرچـاو دەگرێت. دووهـەم، لـەبـەر چاوگرتنی ڕاستییەکانە، بەو واتایەی کە فیدرالیزم لە هـەمـان کاتدا کە ڕێز دەگرێت لـە ڕاستییە جۆراوجۆرەکان، ماف و گـەرەنتی پێویستیشیان پێ دەدات. سێهەم ئەوەی کە، فیدرالیزم هەوڵی یەکیەتی دەدات بێ ئـەوەی کـە پێویسـت بـێ ئـەم یـەکیـەتییـە ببێتـە هـۆی تێکـەڵ بـوون. لـەبـەرچـاوگرتنی هاوکاتی جۆراوجۆریی و یەکیەتی و یان گەرەنتی کردنی پێکەوە ژیان، بە هۆکـاری هـەبـوونی فیـدرالیزم دێـتە ئـەژمـار. فێـدرالیزم بـەردەوام وەکـو پرۆسـەیەکـی پێکهاتـەیی بـۆ دڵنیابوونـەوە لـە دیمۆکراسـی نـەگۆڕ لـەو کۆمەڵگایانـەدا کـە بـە قـووڵایی دابـەشـکراون شـیدەکرێتـەوە، لـە راسـتای هێڵـەکـانی پێوەندیـدار بـە ڕەگـەز و نـەتـەوەوە. بـەمجۆرەیە کـە ئـەندامانی پێکهێنەری فیدراسیۆن، وێڕای نـەبوونی سـەربـەخۆیی ڕەهـا لـە کۆمـەڵگای یـەکپارچـەدا ناتوێنـەوە. بۆیـە لـەنێوان جۆراوجـۆری خـەڵکی وڵاتێـک و فیدرالیزمدا، پێوەندی ئەرێنی هەیە و هەندێ لە بیرمەندانی سیاسـی لـەسـەر ئەو باوەڕەن کە پێکهاتە سیاسیەکانی هەر وڵاتێک دەبێـت فرەچـەشـنبوونی کۆمـەڵگا لـەبـەرچـاو بگـرن و لـەم بـوارەدا زۆرتـرین کـەڵک لـە فیـدرالیزم وەرگیـراوە. کـەواتـە فیـدرالیزم لـە واتـای سـەرەتاییـدا ڕێگـە چارەیـەکـی

سیاسی- جوگرافیاییە واتە جیاکردنەوەی دەسەڵاتی سیاسی بەشێوەی جۆگرافیایی کە پێڕەوی لە یاسایەکی بنچینەیی دەکات. هەروەها فیدرالیزم کۆمەڵێک بیرۆکە، بایەخ و جیهان بینیە کە دەربڕی فەلسەفەیەکە لەسەر بناخەی پاراستنی جۆراوجۆریی و یەکیەتی، لە یەک کاتدا. جۆرێک ئاشتی و پێکەوە بوونە لە پێکهاتەیەکدا کە لەسەر بنەمای "هەڵسەنگاندن و هاوسەنگی" پێکهاتووە لەوەها پێکهاتەیەکدا دەسەڵات ڕێژەییە و بە دەسەڵاتەکانی تر سنووردار دەکرێتەوە.

## بنەما سەرەکیەکانی فیدرالیزم :

بەپێی ئەو باسانەی سەرەوە، فیدرالیزم هەندێ بنەمای هەیە و فیدراسیۆن بناخەکەی لەسەر ئەو بنەما سەرەکیانەیە کە بە شێوەی ئاسایی لە یاسای بنچینەیی فیدرالدا دیاری دەکرێن. لەبەرچاو نەگرتنی ئەم بنەمایانە بە واتەی ناڕاست یان درۆیینە بوونی فیدرالیزمە. هەندێ لەو بنەمایانە بریتین لە : جیاکردنەوە و بەخشینی دەسەلات ، خودموختاریی، هاوبەشیی، گونجاویی ئەرکەکان و ڕاهاتوویی. سەبارەت بە جیاکردنەوە و بەخشینی دەسەلات، یاسای بنەڕەتی فیدرال بریتی دەبێت لە ریسای روون بۆ دابەشکردنی شیاویەتیەکان و دەسەلاتەکان لە نێوان لانیکەم دوو ئاستی دەولەتدا واتە حکوومەتی هەریمەکان و حکوومەتی ناوەندیی (فیدرال). یاسا بنچینەییە فیدرالەکان، خودموختاریی هەر کام لە حکوومەتە هەریمیەکان بە فەرمی دەناسن. خودموختاری یان ئوتونۆمی بەو واتایەیە کە لە یەکەکانی پێکهێنەری پێکهاتەی دەولتێکی فیدرال هەر کام هەندێ دەسەلاتی سپێردراویان هەیە. ئەوان لە زۆر بواری خودموختارن: ئۆرگان و دامەزراوەی خۆیان هەیە، یاساو رێکخستنی خۆیانیان هەیە: یاسای بنچینەییان هەیە: حکوومەتە هەریمیەکان مافی خۆڕێکخستنیان هەیە کە بە پێی ئەوە هەر کام لەو حکوومەتانە خاوەن دەسەلاتی سێیانی دەبەن، کە سەربەخۆیە لە دەسەلاتی فیدرال. واتە مافی دانانی یاسا، جێبەجێ کردن و دادوەرییان هەیە، بە شێوەی ئاسایی لە ولاتانی فیدرالدا دامەزراوەیەک وەک "دادگای بالا" لە سەرەوەی هەرێمەکان دەبێت کە کێشەی نێوان یاسای بنچینەیی و یاسا ئاساییەکان، لێکدەداتەوە.ئەوان لانیکەم هەندێ ئۆتۆنۆمیان لە باری داراییەوە هەیە، واتە ئەوان رەنگە باجەکان زیاتر

بکەن و سەربەستانە بڕیار بدەن لەسەریان. کەواتە یەکە پێکهێنەرەکان، تایبەتمەندی یاسای خۆیانیان هەیە. حکوومەتە خودموختارەکان وەکو دەوڵەتەکانی خاوەن سەروەرین، بەبێ کە دەوڵەتی خاوەن سەروەری تەواو بن. هیچ جۆرە چاوەدێریی زنجیرەپلەیی و یان هیچ مافێکی سەرپەرشتی سەبارەت بە بڕیاری حکوومەتەکان لەلایەن دەوڵەتی فێدراڵەوە جێبەجێ ناکرێت. ئەمە بەو بۆنەوەیە کە سەروەریی ئەوان سنووردار دەکرێتەوە بە بنەمای سێهەم، واتە بنەمای راهاتوویی.

هاوبەشیی نێوان دوو ئاستی یاسایی راهاتوو، لایەنێکی حکوومەتی فیدڕاڵ و بەتایبەت "فێدرالیزمی لێکهەلپێکراوەیی" ە . هاوبەشیی لە بنەڕەتدا، لابەو واتایەیە کە تایبەتمەندییە یاساییەکانی یەکەی ناوەندیی و یەکەکانی پێکهێنەر بێگانە نین لە یەکتری. بەپێچەوانەوە، ئەوان زۆر بە چڕی لە یەکدا تێکالاون و پێوەند دراون بۆ پێکهێنانی بەندوباوێکی یاسایی. بەپێی بنەمای هاوبەشیی، هەر کام لە یەکە فێدراڵەکان دەبێت لەلایەن نوێنەرانی خۆیانەوە لە بڕیارەکانی دەوڵەتی فێدراڵدا کە پێوەندییان بە کۆی فێدراسیۆنەوە هەیە، ئامادەبن و بەشداریی بکەن. ئەم بەشداری کردنە دوولایەنەیە، واتە لە خوارەوە بۆ سەرەوە و لە سەرەوە بۆ خوارەوە.لەلایەکەوە، یەکەکانی پێکهێنەر بەشداری دەکەن لە پرۆسەی پێناسەکردن، و جێبەجێ کردنی ڕێسا و سیاسەتەکانی فیدراڵ: بەتایبەت بەشداریی لە ڕێگای سیستەمی دوو ئەنجومەنییەوە ، کە ئەنجومەنی دووهەم زۆرتر لە نوێنەرانی هەموو یەکەکانی فیدراڵ یان گرووپە کۆمەڵایەتیەکان و زۆربەی کات بە ڕێژەی بەرابەر بۆ هەر یەکە پێکدێت، دەسەڵاتی دەسپێکردنی یاسادانان، مافی راوێژ کردن لەگەڵیان پێش

پەسەندی ڕێکخستنێکی فیدراڵ یان پێش گرێبەستێکی نێودەوڵەتی، بۆیان هەیە دادگای پێوەندیدار بە یاسای بنجینەیی بەکار بهێنن، و گرنگتر، ئەرکی جێبەجێ کردن و پێشەوەبردنی یاساکانی فیدراڵ. لە ڕێگای ئەم ئامرازانە و گەلێک ئامرازی دیکەش، یەکەکانی پێکهێنەر ڕاستەوخۆ لە پرۆسەی پێناسەکردن وجێبەجێکردنی ویست و سیاسەتی یەکەی فیدراڵدا بەشدار دەبن. لەلایەکی ترەوە، یەکەی فیدراڵ هەروەها دەتوانێ لە هەندێ ڕێگاوە بەشداری بکات لە دانان یان جێبەجێ کردنی یاسا و ڕێکخستنەکانی یەکەکانی پێکهێنەر. ئەو ناتوانێ بەتەواوەتی بێ لایەن بمێنێتەوە لە جێبەجێ کردنی خودموختاری یەکەی پێکهێنەردا. یەکەی ناوەندیی نابێت تەنیا هەبوون و خودموختاری یەکەکانی پێکهێنەر بناسێت، بەڵکو دەبێت لە ئاستی نێودەوڵەتیدا هەر بە ڕادەی ئاستی نیشتمانی حکوومەت، ڕێزی تەواو و جێبەجێ کردنی کاری ئاسایی، دەسەڵاتەکان و ڕێکخستنەکانیان لەلایەن یەکە پێکهێنەرەکانەوە، گەرەنتی بکات. بە واتایەکی تر یەکەی فیدراڵ بە جۆرێک لە پرۆسەی فۆرمولەکردن و جێبەجێ کردنی ویستی یەکە پێکهێنەرەکاندا بەشدار دەبێت.

لەسەر بنەمای شیاویەتی ئەرکەکان، ئەرکێک کە یەکە بچووکەکان دەتوانن جێبەجێ بکەن نابێت بسپێردرێت بە یەکەی گەورەتر. لە پەنای ئەمەشدا بنەمای ڕاهاتوویی هەیە، بەو واتایە کە دەسەڵاتەکانی یەکەکانی پێکهێنەر و ئەو ڕێگایانەی کە ئەوان لەم دەسەڵاتانە کەڵک وەردەگرن، پێڕەوی پێویستیەکانی بەندوباوی یاسایی سەرەوەن، واتە ئەوەی لەلایەن یەکەی فیدراڵەوە پێکهاتووە. یاسا و بڕیارەکانی یەکەی فیدراڵ پێویستیهێنەرە بۆ یەکەکانی پێکهێنەر و زۆربەی کات ڕێکخستنەکانی

فیدراڵ، لە بابەتی ناکۆکیدا، لە سەرەوەی ڕێکخستنەکانی ویلایەتەوە دەبن. بەوەشەوە، مێژووی پێوەندیدار بە یاسای بنجینەیی ئەمریکا و سویس پیشان دەدات کە تیۆریەکانی: "هەڵوەشاندنەوە" یان "دەستێوەردان"، ڕێگە دەدەن بە یەکەکانی پێکهێنەر بۆ دژایەتی کردن لەگەڵ جێبەجێ کردنی پێوەرێکی فیدراڵ مە ئەوان پەسندی ناکەن و سەروەریان پێشێل دەکات.

کەواتە فیدرالیزم بریتییە لە تێکەڵێکی تایبەتی خۆحکوومەتی (خودموختاری )، حکوومەتی سنورداری (راهاتوویی ) و حکوومەتی هاوبەش ( بەشداری کردن ). دوو ئاستی حکوومەتیی، بە شێوەیەک لەیەک نزیک و گرێدراوی یەکترن. بەبێ یەکەکانی پێکهێنەر، یەکەی فیدراڵ ناتوانێ هەبێت. بەبێ دووهەمی، یەکەمیش ناتوانێ خودموختار بێت. هەر دوو دەبێت لە ڕێگای زنجیرەیەک لە شێوازە تایبەتەکان پێکەوە کار بکەن، بە مەبەستی جێبەجێ کردنی ئامانجە پێوەندیدارەکانیان. ئەو بنەما سەرەکییانەی فیدرالیزم بە گوێرەی پێویست لە باری یاساییەوە، گرنگایەتی و کاریگەرییان هەیە. یاسا بنچینەییەکانی دەوڵەتە فیدراڵەکان بە شێوەی فەرمی، پێویستیی ئەم بنەمایانە دیاری دەکەن، لە ڕێگای پێناسەکردنی واتاکانیان، لە ڕێگای پشتگیری کردن لە پێکەوە هەڵکردن و بەهێزترکردنی دوو لایەنە و گەڕەنتی کردنی جێبەجێ کردنیان.

## ٢- یاسای بنچینەیی فیدراڵ

یاسای بنچینەیی کلیلێکە بۆ پێکهێنانی حکوومەت و ئەو یاسا بنەڕەتییە کە نە تەنیا دەسەڵاتەکان و بەرپرسایەتیەکانی دەوڵەت دیاری دەکات، بەڵکو ویستی خەڵکیش پیشان دەدات. فەلسەفەی سیاسی خەڵک و باروودۆخی مەعنەویی سەردەمیان، لە ڕێگای یاسای بنچینەییەوە پیشان دەدرێت. لەگەڵ گۆڕانی فەلسەفەی سیاسی خەڵک، یاسای بنچینەییش دەگۆڕدریت. بە وتەی گێتێل: کۆی ئەو بنەما بنەڕەتیانەی کە فۆرمی دەولەتێک دیاری دەکەن پێی دەگوترێت یاسا بنچینەییەکەی. "بۆ مەکلڤەر یاسای بنچینەیی" ئەو یاسایەیە کە دەولەت ڕێنوێنی دەکات و ویستی بەرفراوانتر لە ویستی دەولەت پیشان دەدات". بۆ وۆلسی ئەمە" کۆیەکە لە بنەماکان کە بەپێی ئەوانە دەسەڵاتەکانی حکوومەت و مافەکانی خەڵک دیاری دەکرێن و پێوەندی نێوان ئەو دووانە ڕێکدەخرێت. ئالبێرت ڤێن دسی یاسای بنچینەیی وەک شێوازی جێبەجێ کردنی دەسەلاتی بالا لە دەولەت" پێناسە دەکات. پێناسەی هێرمەن فاینەر لە یاسای بنچینەیی وردبینانەترە": یاسای بنچینەیی هەندێ ماددە و خاڵە لە ڕێساکان کە دابەشکردنی کارکردەکان، دەسەڵاتەکان و ئەرکەکان لە نێوان ئاژانسگەلی جۆراوجۆر و نووسینگەکانی حکوومەت و پێناسەکردنی پێوەندیەکانی نێوان ئەمان و خەڵک ڕێکدەخات. "بە واتایەکی تر" سیستەمێکی دامەزراوەیی سیاسی بنەڕەتی" ڕێکدەخات. یاسای بنچینەیی ڕەنگە تاقە بەڵگەنامە بێت و هەروەها ڕەنگە هەندێ ڕێسا، بنەما و پەیمان بێت. کەواتە یاسای بنچینەیی دەبێت ئەم تایبەتمەندیانەی هەبێت: دەبێت ئاماژە بە دەسەڵاتەکانی حکوومەت و ئۆرگانە جیاوازەکانی حکوومەت وەک

یاسـادانان، جێبـەجێکـاریی و دادوەریـی بکـات، لـە فیدراسـیۆندا یاسـای بنچینـەیی دەسـەلاتـەکـان دابـەش دەکـات لـە نێـوان دەسـەڵاتـی فیـدراڵ و یـەکـەکانـدا، یاسـای بنچینـەیی هـەروەهـا ئامـاژە دەکـات بـە مافـەکـان و ئەرکەکانی هاووڵاتییان.

یاساکانی بنچینەیی رەنگە نووسراوەیی یان نەنووسراوەیی و پتەو یـان نـەرمونیـان بـن. بـۆ نموونـە ویلایـەتـە یـەکگرتووەکـانی ئـەمریکـا و هیندوستان یاسای نووسراویان هەیە و ئینگلیز نموونەی کلاسیکی یاسای بنچینەیی نەنووسراوەیە. نیوزلەند و ئیسرائیل دوو وڵاتی ترن کە یاسای بنچینەیی نەنووسراوەیان هەیە. زۆرێک لەنووسەرانی یاسازان، بەتایبەت لۆرد جیمز یاسا بچینەییەکان بەپێی شێواز گەلێک کە لە رێگای ئەوانەوە دەگۆڕدرێن، بە پتەو ونەرموونیان پۆلێنبەندی دەکەن. یاسای بنچینەیی ئینگلیز وەکو نموومەی کلاسیکی نەرموونیان وەسف کراوە، لەبەر ئەوەی کـە دەتـوانرێ لـە رێگـای ئاسـاییەوە و لـە لایـەن پارلـەمانـەوە چاکسـازیی برێت. ئەگەر بەپێچەوانەوە، یاسای بنچینەیی تەنیا بە شێوازێکی تایبەتی و نائاسـایی چاکسـازیی تێـدا بکرێـت وەک یاسـای بنچینـەیی ویلایـەتـە یـەکگرتـووەکـانی ئـەمریکا کـە لـە رێگـای زۆرینـەی دوو لـە سـێی هـەردوو ئـەنجومـەنـی پارلـەمـان وێـڕای پـەسـەنـدی لـەلایـەن سـێ لـە چـواری ویلایەتەکانەوە چاکسازیی دەکرێت، ئەوە پێی دەگوترێت یاسای بنچینەیی پتەو. یاسای بنچینەیی نەرمونیان دەکرێ چاکسازیی تێدا بکرێت وەکو یاسایەکی ئاسایی لە رێگای ئاساییەوە. کەواتە لە ژێر یاسای بنچینەیی نەرموونیاندا جیاوازیەک لە نێوان یاسای ئاسای یاسای بنچینەییدا نییە، بە گوێرەی شێوازی گۆڕانیان. لێرەدا دەسەڵاتی یاسادانان لە سەروەریە و

هیچ کەسێک نییە بۆ پرسین لە نایاسایی یان لە دژی یاسای بنچینەیی بوونی هەر یاسایەک کە لەلایەن دەسەڵاتی یاسادانەوە دادەنرێت. بەڵام لە ژێر یاسای بنچینەیی پتەودا، لە نێوان یاسای بنچینەیی و یاسای ئاساییدا جیاوازیی هەیە. یاسای بنچینەیی لە بارودۆخێکی بەرزتر دایە بە گوێرەی یاسای ئاسایی. لێرەدا یاسای بنچینەیی لە سەرەوەیە و هەر یاسایەک کە لە دژی خاڵەکانی یاسای بنچینەیی بێت دووری لێدەکرێت و هەڵدەوەشێتەوە. نەتەنیا ئەوە، بەڵکو لێرەدا دەسەڵاتی یاسادانانیش، دەسەڵاتی یاسادانانی بانتر یان سەروەر نییە، سەروەریتی بە یاسای بنچینەییە.

یاسای بنچینەیی فیدراڵ جیاوازە لەگەڵ یاسا بنچینەییەکانی نا – فیدراڵ هەروەها کە ئەوانە هەندێ کارکردی تایبەت جێبەجێ دەکەن. ناوەڕۆکی گرنگی یاسای بنچینەیی فیدراڵ دابەشکردنی دەسەڵاتەکانی یاسادانانە لە نێوان دەسەڵاتی رەوای ناوەند و یەکە پێکهێنەرەکان. یاسای بنچینەیی دەبێت ئاماژە بکات بە بنەماکانی فیدرالیزم ( خودموختاریی، راهاتوویی، بەشداری کردن). باوکانی دامەزرێنەری یاسای بنچینەیی ئەمریکا، کە ئەمڕۆکە هیشتا بەهێزە، رازی بوون بەوەی کە کێشەی نێوان پێویستی ئابووریی بۆ یەکیەتیەکی بەهێزتر و پێویستی سیاسی مانەوەی سەروەری ویلایەتەکان تەنیا دەکرێ لە رێگای داهێنانی پێکهاتەیەکی دەوڵەتی بە تەواو نوێ چارەسەر بکرێت: دوو ئاستی حکوومەت – ویلایەت و یەکیەتی – هاوکات کار دەکەن لەسەر هاووڵاتی. بیرۆکەی پێکەوە بوونی دوو حکوومەت، لە ناو یەک جوگرافیادا و یەک بەندوباوی یاسایی، کە هەر کامەیان خاوەن یاسای بنچینەیی، دامەزراوە، یاسا و

باجەکانی خۆیانن و هاوکات بە سەر یەک حەشیمەتدا کار دەکەن، بیرۆکەیەکی نوێ و لە راستیدا شۆڕشگێڕانە بوو لە کۆتایی سەدەی هەژدەیەمدا.

لە باری کارکردییەوە ، یاسا بنچینەییەکانی فێدراڵ وەکو یاسا بنچینەییە ئاساییەکان نین. لە زۆربەی دەوڵەتە نافێدراڵەکاندا، بۆ نموونە وەکوو فەڕانسە، یاسای بنچینەیی زۆربەی کات وەکو زنجیرەیەکی سادەی یاسا سیاسییەکان چاوی لێدەکرێت، کە بایەخی یاسایی کەمیان هەیە. بەڵام یاسا بنچینەییەکانی فێدراڵ بە رێکوپێکی کارکرد گەلێکی تایبەت جێبەجێ دەکەن. وێرای جیاوازیەکانی نێوان ئەوانە – رەنگە لە شێواز، پێکهاتە، کارکرد و وشەکاندا – هەندێ خاڵی هاوبەش هەن کە تەنیا یاسا بنچینەییەکانی فێدراڵ سەروکایان لەگەڵیاندا هەیە. سێ خاڵی سەرەکی دەکرێ لێرەدا ئاماژەیان پێ بکریت: پێناسەکردنی یەکە پێکهێنەرەکان، دابەشکردنی دەسەڵاتەکان لە نێوان یەکەی ناوەندی و یەکەکانی تر، رێکخستنی بەرنامەیەک بۆ چارەسەرکردنی ناکۆکیەکان. یەکەم، یاسایەکی بنچینەیی کە ئاماژە نەکات بە هیچ یەکەیەکی پێکهێنەر بە سەختی دەتوانێ یاسایەکی فێدال بێت. یاسا بنچینەییەکانی فێدال تەنیا یاسای یەکەی ناوەندیی نین و بە پێچەوانەوە هی هەردووکی ئاستەکانن. بەشێوەی ئاسایی خاڵگەل و بەشگەلێکی زۆریان هەیە لە پێوەندی لەگەڵ حکوومەتی فێدال و یاساکانی پێوەندیدار بە یەکەکانی پێکهێنەر. دووەم، یاسا بنچینەییەکانی فێدراڵ، دەسەڵاتەکانی دەوڵەت لە رێگای وەسفی شیاویەتیە تایبەتەکانی یەکەی فێدراڵ و یان بۆ یەکەکانی پێکهێنەر دابەش دەکەن. ئەمە باوەڕ ناکرێت کە هەر یەکەیەکی پێکهێنەر سەروکاری هەیە لەگەڵ

هەر بابەتێ کە بۆی گرنگە و دەیهەوێت. هەروەها بە شێوەی بەرابەر قبووڵ ناکرێت کە یەکەی فیدراڵ ملهوڕانە بیهەوێت هەر بابەتێک ڕێکبخات کە بە شیاوی بزانێت. دەسەڵاتەکان، شیاویەتیەکان و بەرپرسایتەکان دەکرێن بە دوو بەش یان دەنرێنە هاوبەشی لە نێوان دوو ئاستی حکوومەت و ئەمە تاڕادەیەکە، کە یاسای بنچینەیی ئەم دابەشکاریە دیاری بکات. سێهەم، یاسا بنچینەییەکان فیدراڵ دەبێت ڕێگایەک دیاری بکەن بۆ چارەسەرکردنی ناکۆکیەکانی نێوان یاسا جۆراوجۆرەکان و هەروەها نێوان یەکەکان لە گەڵیەک و لەگەڵ حکوومەتی فیدراڵ. دادگای پێوەندیدار بە یاسای بنچینەیی و دادگای باڵا بە ئەگەرەوە زۆر شیاون بۆ جێبەجێ کردنی ئەم کارە.

وێرای ئەم کارکردانەی سەرەوە. یاسای بنچینەیی زۆربەی فیدراسیۆنەکان بە روونی یانە ناراستەوخۆ پێشترێتی و گرینگی یاسای بنچینەیی رادەگەینێت. پرۆسەی چاکسازیی، دەوری پێشنیارنامەی یاسایی، مافەکان و ماددەکانی پێوەندیدار بە جیابوونەوە بە فەرمی لە یاسادا ئاماژەیان پێ دەکرێ. لە ڕێژەیەکی کەم لە فیدراسیۆنەکاندا لە یاسای بنچینەییدا راستەوخۆ مافی یەک لایەنەی جیابوونەوە ناسراوە، لەوانە سۆڤییەتی پێشووکە دواتر هەندێکیان لێی جیا بوونەوە. لە فیدراسۆنەکانی دیکەدا تەنیا لە ڕێگای یاساییەوە دەکرێ جیا ببنەوە. هەروەها و بەتایبەت دەسەڵات و پرۆسەی دادوەریی دەبێت لە یاسادا روون بکرێتەوە. دادگای باڵا، دادوەری کۆتاییە لە پێوەندی لەگەڵ یاساکانی یاسای بنچینەیی. دادگای یاسای بنچینەیی بۆ راڤەی یاسای بنچینەییە. بازنەی کاروباری کۆمەڵایەتی و ئابووریی وەک چالاکیگەلی بەربڵاو لەلایەن هەردوو

ئاستەوە جێبەجێ دەکرێن بەڵام بە شێوەیەکی گشتی، یاسای بنچینەیی ئەوە دیاری دەکات کە کاروباری کۆمەڵایەتی وەکو پەروەردە، خزمەتگوزاریی تەندروستی، کار و ئاسوودەیی، بە حکوومەتە خۆجێییەکان بسپێردرێت. لە هەندێ یاسای بنچینەییدا خاوەن شیاویەتی "پاشماوەی دەسەلاتەکان" واتە ئەوانەی کە لە یاسادا دیاری نەکراون ،دیاری دەکرێت. لە هەندێ فیدراسیۆندا لە ئەستۆی ناوەندە و لە هەندێکی تردا لە ئەستۆی یەکەکان یان هەردوولادایە.

جێی ئاماژەیە کە رەنگە وشەی بەکارهێنراو لەلایەن یاسای بنچینەییەوە زۆر گرینگیی نەبێت. پێویست نییە کە سیستەمەکانی دەوڵەتی فیدراڵ بە ناوی راستەقینەیانەوە بانگ بکرێن. ئەوان رەنگە ئاماژە بە چەمکەکانی تر بکەن، بەو جۆرەی کە سویسرا لە ١٨٤٨ بەملاوە خۆی بە "کۆنفیدراسیۆن" ناو دەبات ( ئەگەر چی لەو کاتەوە فیدراڵی بووە). ئەوان ئاماژە بکەن بە وشەگەلێک وەک یەکیەتی و یەککگرتوو، یان ئاماژە بکەن بە "رێگای کۆمەڵگایی" بۆ جێبەجێ کردنی شیاویەتیەکان. ئەوەی کە گرنگە تەنیا ئەوە نییە کە یاسای بنچینەیی چی دەڵێت و چ وشە و ناوێک بەکار دەهێنێت، بەڵکو ئەوەیە کە ئەوان جێبەجێی دەکەن، تەنانەت بەبێ وتن، ئەگەر یاسا وەکو نۆرم بە شێوەی سەرەکی ساختی ( درۆ) بێت، ئەمە دەتوانێت ناوگەلێکی ساختە و درۆیینەش بەکار بهێنێت. بە واتایەکی تر، فیدرالیزم رەنگە بە چاکی هەبێت و شتگەلێک جێبەجێ بکات کە هەن، بەبێ ئاماژە کردن بەوشەی فیدراڵ. بەپێچەوانەوە، بەتەنیا ئاماژەکردن بە وشەی فیدراڵ سیستەمی دەوڵەتی فیدراڵ پێکناهێنێت، ئەگەر چی بەشێوەی ئاسایی ئاماژەی پێ دەکرێت.

## دەسەڵاتی یاسادانان:

دەسەڵاتەکانی یاسادانان دەورێکی سەرەکیی لەدارشتنی سیاسەتی گشتی لە دیموکراسیدا، دەگێڕن. بەگشتی پارلەمانەکان دوو جۆرن، دوو ئەنجومەنی یان تاک ئەنجومەنی. کاتێک دوو ئەنجومەنی یاسادانان هەیە پێی دەگوترێت بیکامرالیزم. زۆر کەم لەوڵاتان دەسەڵاتی یاسادانانی تاقانەیان لەئاستی نیشتمانیدا هەیە. نیوزلەند لە١٩٥٠ و دانیمارک لە ١٩٥٤ بەملاوە، لەناو ئەو وڵاتانەدان کە دەسەڵاتی یاسادانانی یەک ئەنجومەنیان هەیە. زۆربەی وڵاتان بەتایبەت وڵاتانی دیموکراتیک، دوو ئەنجومەنیان هەیە بۆ دڵنیابوونەوە لە سیستەمێکی شیاوی چێک و بالانس، بۆ دیتنی ئەوەی کە ئەنجومەنی خواروو تووشی هەڵە نەبێت. ئەنجومەنێکیان دەسەڵاتی زۆرتری هەیە بە گوێرەی ئەوی تر و زۆربەی کات یەکێک لەئەنجومەنەکانی یاسادانان لەڕێگای هەڵبژاردنی ڕاستەوخۆوە هەڵدەبژێردرێت و ئەوی تر بەشێوەی ناڕاستەوخۆ هەڵدەبژێردرێت. لەپلەی یەکەمدا بیکامرالیزم بەرگری لەمەیلی ملهوڕانەی تاک ئەنجومەنی دەکات. لەپلەی دووەمدا، ئەنجومەنی دووەم دەتوانێ چاکسازیی و پێداچوونەوە بکات و کاریگەری بەدواخستنی لەسەر ئەنجومەنی خوارتر هەبێت و لەو ڕێگایەوە دەکرێ بەرگیری بکات لەهەر جۆرە یاسادانانێکی بەپەلە. بەبێ وەها لەمپەرێک تاک ئەنجومەنی لەڕێگای دەمارگرژی توندی ئایوورەییەوە بەم لاو و ئەولادا لار دەبێتەوە. لەپلەی سێهەمدا، ئەنجومەنی دووهەم، بۆ قازانجی کەمینەکان و چینە پیشەییەکان، پێویستە. لەپلەی چوارەمدا، ئەنجومەنی دووەم کەڵکی زۆر و چاکی هەیە بۆ فیدراسیۆن. ئەنجومەنی خوارەوە نوێنەری خەڵکە، لەکاتێکدا کە ئەنجومەنی سەرەوە،

نوێنەری یەكە پێكهێنەرەكانە. بەبێ ئەنجومەنی دووەم شوناسی یەكەكان لەفیدراسیۆندا دەكەوێتە مەترسییەوە.

دامەزراوەی ئەنجومەنە دووانییەكانی دەسەڵاتی یاسادانان. لە ئینگلیزەوە لەگەڵ پێشتریتی ئەنجومەنی گشتی یان خەڵك بەسەر ئەنجومەنی لۆردەكان دەستی پێ كرد و ئەمەو لە سەرتانسەری جیهاندا قبوول كراوە. نۆمەن دەڵێت دەسەڵاتی یاسادانانی دووانە بەچاكتر دەزانرێت، لەبەر ئەوەی كە ئەوان دەتوانن بەرژەوەندیە ناوچەییەكان و هەروەها ئەو كەمایەتیانە، كە لە پرۆسە ئاساییەكانی هەڵبژاردندا چاوپۆشیان لێدەكرێت، پیشان بدەن. هەروەها دەڵێت بڕێكی جێی سەرنج كات بۆ باسكردن لەسەر شیاویەتیەكانی یاسایەك، لەلایەن هەردوو ئەنجومەنەوە، تەرخان دەكرێت، كەواتە لە بڕیاردانی بەپەلە پێشگیری دەكرێت. ئەنجومەنی دووەم ڕەنگە لەسەر بنەمای نەتەوەیی، ئایینی، ئابووریی یان دیكەی دابەشكاریەكانی كۆمەڵگا بێت. لە وڵاتانی جیاوازدا ڕێگای جۆراوجۆر بۆ هەڵبژاردنی ئەندامانی ئەم ئەنجومەنە هەیە وەك، هەڵبژێراردن، دیاری كردن، یان بە میرات پێگەیشتن یان تێكەڵێك لەمانە. لە ئینگلیزدا، ئەنجومەنی لۆردەكان پێكدێت لەئەندامانێكی دیاریكراو بەپێی بنەماكا میراتییەكان لەلایەن مەلەكەوە. لە ئوستراليا و ئەمریكا (لە ١٩١٣ بەملاوە) و سویس ئەندامانی ئەنجومەنی دووەم لەلایەن خەڵكەوە ڕاستەوخۆ هەڵدەبژێردرێن. هەندێ وڵاتی وەك ئاڵمان لەلایەن كابینەی یەكەكانەوە هەڵدەبژێردرێن. لە كەنەدا لەلایەن دەسەڵاتداری گشتی وڵات و سەرۆك وەزیرانی فیدراڵەوە دیاری دەكرێن. لە ئەمریكای (پێش ١٩١٣) و نەمسا بەشێوەی ناڕاستەوخۆ لەلایەن یاسادانانی یەكەی پێكهێنەرەوە

هەڵدەبژێردرێن. لەهەردووکی هیند و ژاپۆندا بەشێکیان هەڵدەبژێردرێن و بەشێکیان دیاری دەکرێن. لەمالیزیا، بەلژیک و ئیسپانیا شێوازێکی تێکەڵ هەیە. هەرچۆنێک بێت، بەپێ شێوازی هەڵبژاردنیان، رادەی نوێنەرایتی کردنی ناوچەیی لە ڕاستیدا جیاوازە. ئەوانەی لەلایەن یەکەکانەوە هەڵدەبژێردرێن زۆرتر نوێنەرایەتی یەکەکە دەکەن و بەرژەوەندی دەپارێزن تا ئەوانەی لەلایەن حکوومەتی فیدراڵەوە وەکو نوێنەری یەکەکان دیاری دەکرێن. سێنای ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا کە ڕاستەوخۆ هەڵدەبژێردرێ زۆر دەسەڵاتدارترە بەگوێرەی ئەنجومەنی خوارتر کەپێی دەگوترێت ئەنجومەنی نوێنەران. پێشنیار کراوە کە ئەگەر هەردوو بنەماکانی دیاری کردن و میراتیی و هەروەها زاڵیەتی ئەنجومەنی سەرەوە بەسەر ئەنجومەنی خواروودا نادیمۆکراتیکن، ئەنجومەنی سەرەوەی ئایدیال ئەوەیە کە ڕاستەوخۆ هەڵبژیردرێن یان بەشێکی لەلایەن ئەنجومەنی خوارووەوە هەڵدەبژێردرێت و بەشێکی لەلایەن دەسەڵاتی جێبەجێکاریی و یاساداناني یەکەکانەوە دیاری بکرێت، وەکو ئەوەی لەهێندوستان دەبیندرێت.

بەگشتی کارکردەکانی دەسەڵاتی یاسادانان بریتین لە: کارەکانی یاسادانان، کۆنترۆڵی بووجە، کارکردەکانی جێبەجێکاریی پێوەندیدار بەدەسەڵاتی یاسادانان، کارکردگەلی پێوەندیدار بە دادوەریی دەسەڵاتی یاسادانان، کارەکانی هەڵبژاردن و دیاریکردنی کۆمیسیۆنەکان. هەروەها، کارکردەکانی ئەنجومەنی دووەمیش بریتین لە: لێکدانەوە و پێداچوونەوە بەسەر ئەو پێشنیارنامانەی کە لەلایەن ئەنجومەنی خوارووەوە نێردراون: دیاریکردن و ناساندنی ئەو پێشنیارنامانەی کە جێی باسکردن نین و

ناکۆکییان لەسەر نییە، بەهۆی دەستەبەرکردنی بیروڕای نیشتمانی لەسەر پێشنیارنامەکە دەبێت پەسەندکردنیان بخاتە دواوە. بەڵام بەدواخستن نابێت لەکاتی وەرگرتنی وەرگرتنی بیروڕای نیشتمانی، زۆرتر بخایێنێت. ڕەنگە دژایەتی لەگەڵ پێشنیارنامەیەک بکرێت، بەڵام نابێت بەجۆرێک بێت کە ببێتە بەربەستێک لە پەسەندکردنی هەر یاسایەکی پێکەوتوودا.

بۆ دەسەڵاتی یاسادانانی حکوومەتی فیدراڵ یان هاوبەش دەبێت دوو پێوەر لەبەرچاو بگیردرێن: یەکەم، نوێنەرایەتی کردنی جۆراوجۆریی ناوخۆیی وڵات لەدامەزراوەکانی فیدراڵ و لەناو فیدراسیۆندا و دووەم، کارامەیی بڕیاردانی حکوومەتی فیدراڵ. زۆربەی فیدراسیۆنەکان بنەمای بیکامێرالیزمیان بۆ یاسادانانی فیدراڵ بەپێویست زانیوە. لەنزیکەی ٢٤ فیدراسیۆنێکدا کە ڕۆناڵد واتس لە ١٩٩٩ دا ناوی بردوون تەنیا ٢ دانەیان بیکامراڵ نەبوون: ئەمارەتی یەکگرتووی عەرەبی و میکرۆنێزیا. زۆرتر گریمانە دەکرێت نوێنەرایەتی یەکە پێکهێنەرەکان لەچوارچێوەی پێوەری دووەمدا یەکسانە، بەڵام لەڕاستیدا هەندێ لەوڵاتان وەکو ئەمریکا و ئوستراليا وا نییە و لەوانی دیکەدا بەپێی وڵات جیاوازیی دەبینرێت و بەپێی قەبارە و حەشیمەت و ڕادەی نایەکسانی یەکەکان، نوێنەرایەتی تا ڕادەیەک ڕێژەییە یان یەکە سەرەکی و گەورەکان نوێنەری یەکسانیان هەیە و بچووکەکان نوێنەری کەمتر. بەڵام زۆرتر هەوڵ دراوە کە بەرژەوەندی یەکە ناوچەییە بچووکەکان و گرنگیی کەمایەتیەکان و دەرئەنجامی نایەکسانی لەنوێنەرایەتیدا لەبەرچاو بگیردرێت.

ئەزموونی حوکمڕانی لە هەرێمی کوردستان ئەوەی سەلماندوە، کە پارتی تا ئەو جێگایە بڕوای بە دەستور و یاسا هەیە کە هەموو دەسەڵات

و جومگە سەرەکیەکانی سەرەوەی حوکمڕانی (هەر سێ دەسەڵاتەکە + وەزارەتەکان) لە هەرێمی کوردستان لە ژێر هەیمەنەو دەستی خۆیدابێ، و ئەوەندەش بڕوای بە هاوبەشی و سازان هەیە لەگەڵ خەڵکی کوردستان و هێزو لایەنە سیاسیەکان، کە پشتگیری لە دید و بۆچون و سیاسەتی گشتی پارتی بکەن، لەوە بترازێ پارتی بە مەنتقی هێزی جۆراوجۆر ڕووبەڕووی رکابەر و نەیارەکانی دەبێتەوە بۆ بێدەنگکردنی ئەوان و خۆسەپاندنی خۆی.بەمانایەکی تر پارتی دیموکراتی کوردستان تا ئەمڕۆش بڕوای بە فرەیی و  هاوبەشی راستەقینە نیە لە حوکمڕانی، و ناتوانێ کار لەگەڵ خاوەن راوبۆچونە جیاوازەکاندا بکات لە پرسە گرنگ و هەستیارو سەرەکیەکانی دەستوری، یاسایی، سیاسی، ئابوری و دارایی و کارگێڕی،

هەربۆیە چەندین جار گۆران- یەکێتی، یەکگرتوو، کۆمەڵ، لەسەر پرسی هەموارکردنەوەی یاسای سەرۆکایەتی هەرێم، بە راشکاوی پێیان ڕاگەیاندن : دەسەڵاتی جێبەجێکردن بە جۆرێ کۆنترۆڵ کراوە لە لایەن پارتیەوە، کە بواری بۆ هاوبەشی راستەقینەی نەهێشتۆتەوە بۆ هێزو لایەنە براوەکانیتر، ئێمە متمانەمان بەم جۆرە شەراکەت و حوکمڕانییە نیە، چونکە هاوسەنگی تێدا نیە، و هەمو جومگە هەستیارو سەرەکیەکانی جێبەجێکردن لە هەرێمی کوردستان لە دەستی پارتی دایە، و دەسەڵاتی جێبەجێکردن هەیمەنەیەکی تەواوی بەسەر دەسەڵاتەکانی تردا هەیە، متمانەش کاتێک دروست دەبێ، کە هاوسەنگی راستەقینە دروست بێ لە نێوان هەرسێ دەسەڵاتەکە، و هاوسەنگی نێوان هێزەکانی ناو دەسەڵاتەکانیش گوزارشتی تەواو بکات لە فرەیی و هاوبەشی راستەقینە، و دوانەی دەسەڵاتی جێبەجێکردن کە پێکهاتووە لە سەرۆکایەتی هەرێم و

ئـەنجومـەنـی وەزیـران کـە بـە ناحـەق ئێسـتا لـەدەسـتی پارتیدایـە بـە (٣٨) کورسییەوە، پێویستە لەم قۆناغەدا لە دەستی یەک حیزبدا نەبێ. ئەوەی لە ٢٠١٥/١٠/١٢ دا ڕوویدا چاوەڕوانکراوبو، و دەرکەوت گۆران لـەسـەر حـەق بوو لەم مەسەلەیە، و بێ متمانەیی و ترسەکەش لەشوێنی خۆیدا بوو.

پارتی ئەمجارەشیان بە بڕیاری مـەکتـەبی سیاسـی لـە (٢٠١٥/١٠/١٠) ، وبەم هەنگاو و کردارە چەکداریە لە (٢٠١٥/١٠/١٢) کێشـە و قەیرانـەکانی لە هەرێمی کوردستان زۆرتر و ئاڵۆزتر و قوڵتر کردوە.

جێبـەجێکردنـی بڕیـاری مـەکتـەبی سیاسـی پـارتی بـە هێـزی چـەکداری پارتی، بۆ ڕێگری لە سەرۆکی پەرلەمان و وەزیرەکانی لیسـتی بزوتنـەوەی گۆڕان لـە دەوامی ڕەسـمی خۆیان لـە هـەولێری پایتـەخت، و پـەکخستنی پـەرلـەمـان و شـەلکردنـی حکومـەتـی هـەرێمـی کوردسـتان، دواتـریش داگیرکردنی پەرلەمان و وەزارەتەکان بەهێزی چەکداری پارتی بـە تـەواوی ئەم ڕاستیانەی خوارەوەی سەلماند:

یەکەم: پارتی تا ئەو ڕادەیە بڕوای بە دەستورو یاسا هەیە، کە دەستور و یاسـا پارێزگـاری لـە دەسـەڵاتە بنچینەیـەکـانی بکـات، ئـەو دەسـتورو یاسایانەش کە پارتی بڕوای تـەواوی پێی هـەبوە و دەبـێ، ئـەو دەسـتور و یاسایانەیە کە پارتی دەستی باڵای هەبوە و دەبێ لـە دانـان و دەرکردنیـان ... پارتی کە زانی چوار لایەنەکە سورن لە سەر چارەسەرکردنی قـەیرانی یاسای سەرۆکایەتی هەرێم بەشێوەی یاسایی و لـە ڕێگـای پـەرلـەمانەوە، پارتی بە بڕیاری مـەکتـەبی سیاسـی و هێزی چـەکداری خۆی پـەرلـەمانی کوردستانی داگیرکرد و لەکاریخست.

دووەم: پارتی بڕوای بە دانوستانی هاوسەنگ و شارستانیانە نیە بۆ چارەسەرکردنی کێشەکان لە گەڵ هێزو لایەنەکانی کوردستان، پارتی تا ئەو شوێنەش بڕوای بە دانوستان هەیە کە پارێزگاری لە باڵا دەستی خۆی بکات لە ئاستی هەرێمی کوردستان، و داوا سەرەکیەکانی خۆی بە شاندی بەرامبەر بسەلمێنێ، بە پێچەوانەوە، پارتی هەمو بژاردەکانی لە بەردەم کراوە دەبێ، بە بژاردەی بەکارهێنانی هێزی چەکداریشەوە بۆ جێبەجێکردنی مەرامەکانی خۆی.

سێیەم: پارتی تا ئێستا بڕوای بە دەستاو دەستکردنی دەسەڵات نیە، لەم ڕووەشەوە کە تێگەیشت لایەنەکان مل بۆ داوا ناڕەوا و نایاسایەکانیان نادەن لە پرسی یاسای سەرۆکایەتی هەرێم، پارتی کودەتای چەکداریان بەسەر شەرعیەتدا کرد، و ئەو پۆستانەی کە بە دەنگی خەڵکی کوردستان و لە هەڵبژاردنەکاندا بەدەستیان هێنابوو، لەلایەن پارتییەوە داگیرکران و پڕکرانەوە. جا لێرەدا پرسیارەکە ئەوەیە، زەمان چیە کرداری داگیرکردنی دەسەڵاتەکان لە داهاتوودا لە لایەن پارتیەوە بەردەوام نابێ، و بەشێوەیەکی هەمیشەیی ڕونادادتەوە، لە دژی ئەو هێز و لایەنانەی کە ناکۆکی و جیاوازیان لەگەڵ پارتیدا دەبێ، لە سەر پرسە سەرەکیەکان، بە تایبەتی ئەگەر ئەمەی ڕوویدا لە ٢٠١٥/١٠/١٢ بۆ پارتی بچێتە سەر، و بە سەلامەتی لێی دەربچێ!؟.

چوارەم: بڕیاری مەکتەبی سیاسی و کرداری چەکدارانەی پارتی جگە لەقەیرانی لەکارخستن و داگیرکردنی پەرلەمانی کوردستان، کێشە و قەیرانێکی شاراوە و خەفەکراوی تری ئاشکرا کرد و تەقاندەوە، ئەویش قەیرانی داگیرکردنی دەسەڵات و جومگە سەرەکیەکانە لە هەولێری

پایتەخت بە هێزی چەکداری پارتی. داگیرکردنی ئەو دەسەڵات و جومگانە تازە نیە، لانیکەم بۆ دەساڵ دەچێ پارتی دەستی بەسەریاندا گرتوە و هێزو لایەنە سیاسیەکانی کوردستانیش ئەو ڕاستیە دەزانن کە ئەو دەسەڵات و جومگانە داگیرکراون لەلایەن پارتیەوە، لەبەر ئەوەش بێدەنگ بوون، چونکە تێگەیشتنیان هەبووە بۆ وەزعی سیاسی کورد لە ئاستی عێراق و ناوچەکە. و بە هەستێکی بەرپرسانە مامەڵەیان لەگەڵ دۆخەکە کردوە، پارتیش لە جیاتی ئەوەی کار بکات بۆ ئاسایکردنەوەی وەزعی هەولێری پایتەخت، دۆخەکە و بێدەنگی هێزە سیاسیەکانی کوردستانی قۆزتوەتەوە بۆ بەرژەوەندی حیزبی خۆی.

ئەمڕۆش پرسیارەکە ئەوەیە، تا کەی پارتی درێژە بە سیاسەتی داگیرکردنی دەسەڵات و جومگەکان ئەدات لە هەولێر و کوردستان بەگشتی ، و تاکەی هێزو لایەنە سیاسیەکانی کوردستان بێدەنگ ئەبن لە ئاستی ئەم سیاسەتە.

## یەكێتی و پەرلەمان:

هەر لە دوای کودەتاکەی پارتی لە ئۆکتۆبەری ٢٠١٥ کە بووە هۆی داخستنی پەرلەمان و ناشرینکردنی پرۆسەی سیاسی لەهەرێمی کوردستان، هاوکات بووە هۆکارێکیش تا بەتەواوی دنیابینی و ئاراستەی بیرکردنەوەی هێزە سیاسیەکانی هەرێمی کوردستان لەناوخۆ و دەرەوەی حیزبە سیاسیەکانیش ساغ بکاتەوە کە تێڕوانینیان بۆ حوکمڕانی لەکوردستان چۆنە و لایەنگیری لەچی مۆدێلێک ئەکەن.

سەرەتا هەژمونەکە زۆر بەهێزبوو بەتایبەت لەهەنگاوەکانی یەکەمی هەمواری یاسای سەرۆکایەتی هەرێم بۆ گۆڕینی سیستمی حوکمڕانی، تەنها ئەوانەی بەڕاستگۆیی دژی بوون بەرامبەری وەستانەوە و کەمینەش بون، بۆیە نەتوانرا دانیشتنی پەرلەمان دوابخرێ، بەڵام دوای ئەوەی پارتی پەرلەمانی داخست، وردە وردە ئەوانەی کە بەناچاری و بە درۆ دوای پرۆسەکە کەوتبون ڕوی ڕاستەقینەیان ئاشکرابوو، ئەگەر یەکێ بتوانێ هەمو لێدوانەکانی ئەوانە لێباتەوە کە ئێستە  بە غەڵەتی ئەزانن بەئاشکرا دەرئەکەوێ کە چۆن ئاڕاستەی قسەکانیان گۆڕانی بەسەردا هاتووە.

لەسەرەتا ئەیانوت ئەم داوایە هی ئێمەشە و داوای گۆڕینی یاساکەیان ئەکرد. دوایی وتیان کاتەکەی باش نەبووە و نەئەبوو ئەو کارە بکرایە و کاتی نەبو. ئێستەش ئەڵێن غەڵەت بوو نابێ دووبارەی بکەنەوە.

ئەوانەی خوارەوەش لەپەرلەمان لە سەرەتاوە هەڵگری ئەم پەیامە بوون و پاش ماوەیەک لەلایەن بەرپرسەکانیانەوە لە یەکێتی بە (قاز) ناوبران بەوەی گوایە بێ گەڕانەوە بۆ مەکتەب سیاسی کە نەیانویستووە ببنە قاز و گەر قازبونتان ناوێ ئاواتان لێ بەسەردێ  و لەگەڵ ئەوەی کە بۆ مێژووی خۆیان گەر بۆ حیزبەکەشیان نەبێ ببنە خاوەنی (شانازی) لە بەشداری گۆڕینی سیستمی حوکمڕانی دیارە ئەوەی یەکەمیان هەڵبژاردووە و نایانەوێ غەڵەتەکە دووبارەبکەنەوە.

لەدەرەوەی ئەم چەواشەکاریە بەردەوامە وەک ئەڵێن بۆ خۆدزینەوە لە ئەسلی مەتڵەب، بەتایبەت ئێستە یەکێتی ئیعلانی کرد کە ئەوان دۆخەکەیان چاککردۆتەوە دوای ئەوەی خەڵک تێکی داوە ئێمە بوینە هۆی چاک کردنەوە، دەرگای پەرلەمان دەکەینەوە

پـەككخسـتنی نابـەجێـی پـەرلـەمـان بـۆ بزوتنـەوەی گـۆڕان و خەڵكـە زۆرینەكەی هەرێمی باشوور ، جگە لە شكستی دەسـەڵاتی بـەڕێوەبردن و بێ نـرخ كردنـی مـۆڕاڵی كـاری پیشـەیی و لـەدەسـتدانی سـەروەرییـەكـانی یاسایە بۆ پرۆسـەی بـەڕێوەبردن لـە سیاسـەتی وڵاتدا ، شـكاندنی شـكۆ و شەرمێكی گەورەشە بۆ گەلێكی ماندوی پڕتێكۆشان و دروست بـوو لـەنێو كوانـوی خـەبـاتی شۆڕشـێكدا كـەمانـەوەی دەسـەڵاتی بـۆ خـۆی كردۆتـە ئامانج!.

بێگومـــان لـــەم گۆشـــە نیگـــای بینینـــەوە، هـــیچ جـــۆرە كـــار و بەرپرسیارێتییەك بۆ سەرخستنی شۆڕش و پرۆسـەی بـەنـاو شۆڕشـگێڕی لـە هـەرێمـەكـەدا مانـای نامێنێت و تـەواوی پرۆسـە سیاسـیەكـەی هـەرێم دەچێتـە خانـەی ملكـەچ بـوون بـە دەسـەڵات و شـۆڕبونەوەی قـوڵ و خـزان بـەحیـزب ، ئـەو سروشـتـە خـوڵقێنراوەی لەگـەڵ دونیابینینـەكـانی تـاك لەدەسەڵاتی باڵادا بۆ خولاندنەوە لە دەوری دەسـەڵاتی خـۆیی لـە چەشـنی سـەرۆك و سـەركـردەی پفهەڵـدراو بـە خواسـتی دەسـەڵاتی كـەسـی و بەرژەوەندیەكانی بـۆ لـە خشـتەبردن و دەرخسـتنی شـێوازی بـەخشـندەیی گـوتراوی حیـزب و شـاردنەوە و ڕووكـەشـكردنی ڕووی دیكتاتۆریـەتـی خۆسەپێن و زۆرەملێییە بۆ گەل!.

پرسی پەرلەمان، پرس و ترسێكی دیاریكراوی یاساییە لـەنێو فۆرمێكی جـەمـاوەری و دەوڵـەتـداری دیـاریكراودا، كەگشـت لایـەنـە سیاسـیەكـانی هەرێمی كوردستانی وەك هێزێكی ناوەند بـەبڕیـار و چاودێریی ملكـەچ بـە پـەیڕەوێكـی بـەڕێوەبـردن دروسـتكردوە بـۆ دەسـەڵاتی جێبـەجێكـار و بەڕێوەبەر لە سیستمی بەڕێوەبردنی وڵاتدا بۆ ئـەو چـوار چێوە یاساییەی

کە بۆتە ئامانجی کارکردن بۆ گەیشتن بەسەروەریەکانی خەڵکی کوردستان !.

پەرلەمانی کوردستان گەرچی بە بڕیارێکی تاک لایەنەی حیزبی کاڵفامانە، بە جۆری کودەتایی سەربازی پەک و پەراوێز خرا. جێ بەجێ کار و داڕێژەرانی ئەم پلان و فەرمانە حیزبییە تاک لایەنە، بوونە هۆکاری ڕاستەوخۆی ڕاگرتن و بەخشینی ڕەوایەتی نارەوا و سەنگ و قورسایی بڕیاری یەکلایکەرەوەی دۆخەکە بە ویستی ڕۆچونێکی دیاریکراو لە پێناو جێبەجێکردنی پلانی ڕاستەوخۆی تاک دەسەلاتی قۆرغکار بۆ مانەوە و ئومێدی گەیشتن بە گرتنە دەستی زۆرینە و مانەوەی زاڵمانەی چەمک و تێکۆشانی مێژووی خەڵکی کوردستان بۆ سەرکەوتن و دروستکردنی سروشتێکی لێبوردەیی بۆ لەبیرچوونەوەی تاوانەکانی ڕابوردو بە پاساوی دروستبوونی جۆرێک لە پیرۆزی و شکۆمەندی پلە وپۆستە بالا و داتاشراوەکانی داهاتوو کە حیزب بە پیشتیوانی هێزی ئاسایش و بەناو ئاشتی حکومەتی هەرێمی کوردستان دەستەبەری دەکات ، کە بەداخەوە گشت ئەمانە متمانەی دەستبەکاربونیان لەژێر چەتر و یاسایی خودی ئەو پەرلەمانە هەڵبژێردراو و ستافی سەرۆکایەتیەدا وەرگرتووە بۆ ڕەوایێتی کارکردن و بەرپرسیارێتی پاراستن و بەڕێوەبردنی وڵات لەژێر سوێندێکی یاسایی شەرەفدا بۆ پاراستن و بەڕێوەبردنی وڵات!.

خولی چوارەمی هەڵبژێردراوی پەرلەمانی کوردستان بە خولی یاسایی و ڕسک و بزێوی دەستبردن بۆ کارە بێ یاساییەکانی حیزبەکانی ڕابوردی هەرێمی کوردستان ناوزەند دەکرێت کە لە نێو خۆیدا دەست بردنێکی دروستە بۆ " دروستکردنەوەی پرۆسەی ڕاستەقینەی دەوڵەتداری

لە چوارچێوە یاساییەکەیدا .وەک بەرنامەی کار لە نێوەندی پرۆژەکانی بزوتنەوەی گۆڕاندا بۆ هەرێمی کوردستان و سیستمی دەوڵەتداری " . بێگومان بۆ خستنە سەر ڕێ و ڕێچکەی یاسایی و هەنگاوەکانی داهاتووی سیستمی بەڕێوەبردنی پەرلەمانی و ناوەرۆکی ڕاستەقینەی یاسا و دروستکردنی دۆخی ئامادەسازی بۆ خولەکانی داهاتووی پەرلەمان و بەردەوامی گۆڕانکاری لەدوای قۆناغی دروستبوونی ئۆپۆزسیۆنەوە بۆ هەنگاو هەڵگرتنی زیاتر و کێشمەکێشمی سەرخستن و ململانێی بەرەوپێش بردن لە پرۆسە دیموکراسیەکەیدا بۆ پەرلەمان و ئەگەری پتەوکردنی دەنگ و ڕێژەی دەنگدەران و بەردەوامی و جیاکاری لە پێشبڕکێی دیموکراسیانەی بەرەو پێشچون بۆ دروستبونی دۆخێکی ئاسودە و سەرکەوتوتر لە ڕابوردوی دابەشکراو بە سیستمی پەنجا بە پەنجای زەرد و سەوز!.

لە پێناو سەرخستن و گەشەکردنی پرۆسەی دیموکراسی و یاسایی لە نێو ئاوەزی پڕ بڕوا و بزوێنەری ڕاستەقینە، بۆبەردەوام بوون و کۆششکردن لە پاراستن و مانەوە بۆ ڕێزگرتن لە ماندوبونی جەماوەری گۆران و تەواوی دەنگدەرانی هەرێمی کوردستان ، بەرز نرخاندن و رەوایێتی دەنگ و پرۆسەی هەڵبژاردن و گەڕاندنەوەی سەنگی دەنگدەرانی خەڵکی کوردستان بۆ بەڕێوەبردنی وڵات بەرچاوبگرن و هیچ جۆرە پاساو و ئەگەرێکی دواندن لە کڕین و فرۆشتن و گەمەی سیاسی بەرامبەر لە پێناو گۆڕینەوەی دەنگی خەڵک و بەهێزکردنی هیچ جۆرە پێگەیەکی کەسی و حیزبی لە دەسەڵاتە باڵاکانی حیزبدا مەکەنە بەربەست بۆ کارکردن و دەستەبەرکردنی خواستی دیاریکراو و هەستان بە بچوککردنەوەی

پەرلەمان و دەنگی پڕ ئازاری نێو سندوقەکانی هەڵبژاردنی راستەقینەی خەڵک بۆ کاراکردنەوەی پەرلەمان.

بێگومان دەبێت ،کەیسی پەرلەمان وەک پەراوێز و لەکارخستنی بەڕێوەبردن ، بێ هیچ دوان و باسێکی حیزبی هەتەکە و گۆتەکەی سیاسی بخرێتەوە ژێر دەست و باوەشی خودی ستافی بەڕێوەبردنی پەرلەمانی کوردستانەوە بۆ یەکلاییکردنەوە و چارەسەری یەکجاری و چەسپاندنی سەروەری یاسا بۆ دوور خستنەوەی ڕێگاکانی پینەکردنی کێشە یاساییەکان ، کە خۆی لە دەستوری هەرێم و یاسای سەرۆکایەتی و لێکۆڵینەوە و چاودێریکردنی دەزگا جێ بەجێ کارەکانی حکومەتی هەرێمە بۆ دانیشتوانەکەی کە ئەمانەش هۆکار و خوڵقێنەری ئەم دۆخە قێزەونە بوون بۆ شکستی حوکمڕانی خەڵکی کوردستان. بۆیە دەبێت لەدەست بڕیاری بەرکەووتوانی حیزب و بۆماوەکانی لە گەورەکردنی زیاتری دەسەڵاتی مۆتەکەی سەرکردایەتیەکانی دەسەڵاتی پاوانخواز و زاڵبونیان بۆ فەرمانڕەوایی و بڕیاردان دەربازبین و تێیان بگەیەنن کە پرەنسیپی گۆڕان کارکردنە بە تەواوی بڕگە یاساییەکانی بەڕێوەبردن و گەڕاندنەوەی شکۆی بێ مەرجی نرخ و بەهایە بۆ پەرلەمان و ئەندامەکانی لەم خولەدا و دەرگایەکیشە بۆ جیاکردنەوە و بنەبڕکردنی کاری سیاسی و یاساییە لە وڵاتدا، بێدەنگ کردن و گەڕاندنەوەی دۆخی دابەشکردن و دەنگی بڕیار و گوتاری سیاسیە لە بڵندگۆی هەردوو زلپارتی پارتی پاگرەدا بۆ خەڵکی کوردستان.

## دەسەڵاتی جێبەجێکاری:

چەمکی ڕاپەڕاندن یان جێبەجێکاریی بە واتای ئەو لقەی حکوومەتە کە ویستی دەوڵەت دادەبەزێنێت و جێبەجێی دەکات. لە حکوومەتی دیمۆکراتیکدا، یاساکان ویستی خەڵک پیشان دەدەن و دیپارتمانی جێبەجێکاریی دەبێت هەبێت بۆ جێبەجێ کردنی ئەوانە، بەپێی دەنگ و بیروڕای دەسەڵاتی دادوەریی. لەواتای بەربڵاویدا دەسەڵاتی جێبەجێکاریی بریتییە لە هەموو ئەو ئاژانس و بەرپرسانەی کە ڕاستەوخۆ پێوەندییان هەیە بە بەڕێوەبەرایەتی رۆژانەی وڵاتەوە. لە واتای بەرتەسکی خۆیدا، دەسەڵاتی جێبەجێکاریی بریتییە لە فەرمانبەرە گرنگەکانی دەوڵەت، جگە لەوانەی کە دەکەونە ناو بازنەی دەسەڵاتی یاسادانان و دادوەرییەوە. کارکردەکانی دەسەڵاتی جێبەجێکاریی بریتین لە: ڕاگرتنی یاسا و ڕێسا و کاروبارە ئیدارییەکان، کاروباری پێوەندیدار بە هێزە چەکدارەکان، کاروباری دیپلۆماتیک، قازانجی گشتی و خزمەتگوزاری کۆمەڵایەتی، فەرمانگەکانی پێوەندیدار بە دارایی و بەرنامەداڕشتنی ئابووریی، کاروباری فریاکەوتنی، کاروبارەکانی پێوەندیدار بە یاسادانان و دادوەریی دەسەڵاتی جێبەجێکاریی.

سێ فۆرمی دەسەڵاتی جێبەجێکاریی هەیە: جێبەجێکاریی رواڵەتی یان فەرمایشی، ڕاستەقینە یان سیاسی و بەردەوام. جێبەجێکاریی فەرمایشی ئەوەیە کە هەموو دەسەڵاتەکانی هەیە لە باری یاساییەوە، بەڵام هیچ کەڵکی لەو دەسەڵاتانە وەرناگرێت کە بە کردەوە لەلایەن کەسان یان ئۆرگانەکانی ترەوە، واتە جێبەجێکاری ڕاستەقینە، جێبەجێ دەکرێن. ئەو یان ئەوان(ئەگەر چەند کەس بن) سەرۆکی دەوڵەتن وەکو پاشا یان

مەلەکەی ئینگلیز یان ئەنجومەنی سەرۆکایەتی لەهەندێ وڵاتدا یان سەرۆک کۆمار (وەکو سەرۆک کۆماری هیندووستان). لەپشتەوەی جێبەجێکاری فەرمایشی جێبەجێکاری راستەقینە هەیە کە ئەنجومەنی وەزیرانە. ئەگەرچی لەزمانی یاسای بنچینەییدا سەرۆک کۆمار سەرۆکی یاساییە بەڵام لەراستیدا (ئەو/ ئەوان) زۆرتر کاریان پەسەند کردنە. جێبەجێکاری فەرمایشی (نۆمینالْ) رەنگە راستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ هەڵبژێردرێت، رەنگە دیاری بکرێت یان بەمیرات پێی بگات. بۆ نموونە مەلەکەی ئینگلیز یان جێگرەکانی وەکو مافی زکماکی دەکەونە سەر تاج و تەخت. دەسەڵاتداری گشتی (فەرماندەری گشتی) لەکەنەدا و ئوسترالیا لەلایەن مەلەکەی بەریتانیاوە دیاری دەکرێن. سەرۆک کۆماری هیندووستان بەشێوەی ناڕاستەوخۆ هەڵدەبژێردرێت. لەجۆری سیستەمی فیدراڵی پارلەمانتاریدا ئەم جۆرەی جێبەجێکاریی لە پەنای جێبەجێکاری سەرەکیدا هەیە، بۆ نموونە هیندووستان و عێراق.

جێبەجێکاری سیاسی، دەسەڵاتی جێبەجێکاریی سەرەکییە. ئەم جێبەجێکارە سیاسەتی دەوڵەت دیاری دەکات و هەڵیدەسووڕێنێت و بەشی بەڕێوەبەرایەتی و فەرمانگەیی کۆنترۆڵ دەکات. لێرەدا شێوەی جۆراوجۆر بۆ دیاریکردن هەیە. لەئینگلیزدا ئەنجومەنی وەزیران جێبەجێکاری سیاسییە. لەهێندوستانیش وەکو ئینگلیز ئەنجومەنی وەزیران جێبەجێکاری سیاسییە و ئەندامانی لەلایەن سەرۆک کۆمارەوە هەڵدەبژێردرێن، بە لەبەرچاوگرتنی سیستەمی پارڵەمانتاری، واتە دەبێت حیزبە سەرەکیەکان لەبەرچاو بگیردرێن. لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا سەرۆک کۆمار جێبەجێکاری سیاسییە و راستەوخۆ لەلایەن خەڵکەوە هەڵدەبژێردرێت و

جێبەجێکاری نۆمینال لەم وڵاتەدا نییە. لە سویسرا و عێراق جێبەجێکاری سیاسی لەلایەن دەسەلاتی یاسادانانەوە هەڵدەبژێردرێت. سیاسی بۆخۆی چەند جۆرە: رەنگە بەپێی ئەوەی کە جێبەجێکاری سیاسی بەرپرسیارە لە بەرانبەر دەسەلاتی یاسادانانادا یان نا، پارلەمانتاری یان سەرۆکایەتی بێت. هەروەها، جێبەجێکاری سیاسی رەنگە تاک بێت یان کۆ. ئەگەر دەسەلاتی رەوای جێبەجێ کردن بسپێردرێت بە تاکەکەسێک وەکو سەرۆک کۆماری ئەمریکا، ئەوە جێبەجێکاری تاکە. ئەگەر بشسپێردرێت بە چەند کەس، ئەوە جێبەجێکاری کۆیە یان فرەجێبەجێکار. لەسویسرا، ئەنجومەنێکی فیدراڵ هەیە بریتی لە حەوت کەس و لە سۆڤییەتی پێشوودا لێژنەی سەرۆکایەتی بریتی بوو لە سی و سێ ئەندام. کەواتە لەسویس و یەکیەتی سۆڤیەتی پێشوودا جێبەجێکاری بەکۆمەڵ دەبینرێت یان بینراوە.

جێبەجێکاری دایمی (بورۆکراسی یان فەرمانگەیی) کە پێشی دەگوترێت خزمەتگوزاریی مەدەنی بەردەوام یان ئیداریی گشتی، جەستەیەکی بەرین و ئەو بەرپرسیارانە لەخۆ دەگرێت کە پۆستێکی دایمییان هەیە، بەلام خۆپارێزی دەکەن لەهەر بەشداریەکی چالاکانە لەژیانی سیاسیدا. گۆڕینی حکوومەت خزمەتگوزاریەکانی ئەوان ناخاتە ژێر کاریگەرییەوە. کارگێڕانی ئەم بەشە بەشێوەی ئاسایی لەخزمەتگوزاریەکاندا لەسەر بنەمای لێهاتوویی لە تاقیکاریەکی رکابەرانەدا دادەمەزرێن. ئەوان لەتەمەنێکی دیاریکراودا دەچنە ناو خزمەتگوزارییەوە و لە تەمەنێکی بەساڵچوویشدا خانەنشین دەبن. ئەوان لەناو چەندین بەشدا لەژێر بەرپرسایەتی وەزیرێکی سیاسیدا رێکدەخرێن. بەگۆڕینی جێبەجێکاری سیاسی گۆڕانکاری کەمتر لێرەدا دەبینرێت، بەپێچەوانەی

هەندێ وڵات وەک ئێرانی سەردەمی کۆماری ئیسلامی کە بەگۆڕینی جێبەجێکاری سیاسی زۆرینەی جێبەجێکارانی بەردەوامیش دەگۆڕدرێن.

## دەسەڵاتی دادوەریی:

دەسەڵاتی دادوەریی یەکێکی تر لەسێ ئۆرگانە گرینگەکانی حکوومەتە و دەورێکی گرنگ دەگێڕێت لەناو ناکۆکیانەیدا کەلە فۆرمولەکردن و جێبەجێکردنی سیاسەتەکاندا پێش دێن. دەسەڵاتی دادوەریی نوێنەرایەتی لایەنی ئەخلاقیی حکوومەت دەکات. ئەم دەسەڵاتە دادپەروەریی گەرەنتی دەکات و لە بەرانبەر ملهوڕی حکوومەتدا پارێزگاریی لەتاکەکان دەکات. وێناکردنی دەوڵەتێکی ژیار و خاوەن شارستانی بەبێ سیستەمێکی دادوەریی کارامە ئەستەمە. یاسا کۆمەڵگا لە ئانارشی و بێ سەروبەرەیی دەپارێزێت. لە نەبوونی دەسەڵاتی دادوەریی بێلایەندا، هاووڵاتییان لەبەرانبەر مەترسی خزمەتکارانی گشتی وەکو سەرپێچیەکەرانی یاسا بێ پەنا دەبن. ئەگەر ئەم دەسەڵاتە بەجوانی و شیاو کار بکات، حکوومەتیش بەشیاوی و چاکی کار دەکات. بۆیە لۆرد جەیمز برایس دەنووسی: "هیچ پێوانەیەک بۆ تاقیکردنەوەی چاک بوونی حکوومەت لەتاقیکردنەوەی کارامەیی سیستەمی دادوەریی چاکتر نییە."ئەم دەسەڵاتە پارێزەری بێلایەنی مافەکانە بەتایبەت مافی مەدەنی. ئاسایش و ئاسوودەیی هاووڵاتییان پێبەستەی بازنەیەکی گەورەی کارامەییە کە بەوە دادپەروەریی لەدەوڵەتدا جێبەجێ دەکرێت. لەم پێوەندییەدا جۆرج واشنگتۆن گوتوویە کە:"جێبەجێ کردنی دادپەروەریی کۆلەکەی پتەوی حکوومەتە." کارکردەکانی دەسەڵاتی دادوەریی بریتین لە: راڤەکردنی یاسا،

کاروباری یاسادانانی پێوەندیدار بە دەسەڵاتی دادوەریی، پارێزگاریی لەیاسای بنچینەیی، پارێزگاریی لەئازادییە مەدەنییەکان و راوێژکاریی.

لەوڵاتانی دیمۆکراتیکدا، لەهەر دوو سیستەمی پارلەمانتاری یان پرێزدێنتاڵدا ئەم دەسەڵاتە سەربەخۆیە. چارلەز لۆییس مۆنتسکیو یەکەم بیرمەندی سیاسی بوو کە پێویستی دوور راگرتنی دەسەڵاتی دادوەریی لە دەستێوەردانی دەسەڵاتەکانی جێبەجێکاریی و یاسادانانی، زەق کردەوە. هەر بەم شێوەیە لاسکی جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە" سەربەخۆیی دەسەڵاتی دادوەریی لە جێبەجێکاریی، بۆ سەربەستی پێویستە" بەپێچەوانەوە ئەمە دەبێتە بەشێکی حکوومەت لەژێر کۆنترۆڵی گروپ و حیزبی زۆرینە لە دەسەڵاتی یاسادانانندا. ئەوە، تەنیا دەسەڵاتێکی دادوەریی سەربەخۆیە کە دەتوانێ بەشێوەیەکی کاریگەر رووبەرووی دەسەڵاتی جێبەجێکاریی بە هەڵەداچوو، ببێتەوە. دەسەڵاتێکی دادوەریی بێ دەست ناتوانێ پارێزەری یاسای بنچینەیی و ئازادیە مەدەنیەکانی خەڵک بێت. بۆیە ئەم دەسەڵاتە دەبێت پلەیەکی بەرزی بێلایەنی، جێگە و پێگەدار، راستی و بێ کەموکوڕیی، و لە سەرەوەی هەموویانەوە سەربەخۆیی دادوەریی و دۆزگەریی هەبێت. بۆیە نابێت گرێ بدرێت بە ئامرازی گەندەڵی سیاسی و ملهوڕی دەسەڵاتی جێبەجێکارییەوە. مەرجە پێویستەکان بۆ سەقامگیربوونی دەسەڵاتی دادوەریی سەربەخۆ بریتین لە: شێوازێکی دروستی دیاریکردنی دادوەرەکان، مسۆگەربوونی بارودۆخی خزمەتگوزاریی بۆ دادوەرەکان، پۆست و بەرپرسایەتی درێژخایەنی خزمەتگوزاریی، مووچەی چاک، دادوەران دەبێت زۆر شیاو و خاوەن توانست بن. ئەگەر دەسەڵاتی دادوەریی و ئەو دادوەرانەی کە یاساکان

راڤە و بەکاردەهێنن، ئەو تایبەتمەندییانەی سەرەوەیان نەبێت هیچ یاسایەک، تەنانەت ئەگەر بەقسەش باش بێت بۆ خەڵک، ناتوانێ ئاسوودەیی بۆ خەڵک بەدی بێنێت. لەولآتانی دیمۆکراتیکدا زۆرترین هەوڵ دەدرێت بۆ پاراستنی پێگەی سەربەخۆی ئەم دەسەڵاتە.

## پێوەندی دەسەڵاتی یاسادانان و جێبەجێکاریی: سیستەمی پارڵەمانتاری و پریزدێنتاڵ

سەبارەت بە پێوەندی دەسەڵاتی یاسادانان لەگەڵ ئۆرگانەکانی تری حکوومەت بەتایبەت دەسەڵاتی جێبەجێکاریی، دەبێت بگوترێت کە دەوری سەرەکی دەسەڵاتی یاسادانان، فاکتۆری بەرپرسایەتییە بەئاراستەی خەڵکدا. کەواتە ئەمە دەبێت ئەوەندە توانایی هەبێت کە دەسەڵاتی جێبەجێکاریی لە بەرانبەریدا بەرپرسیار بێت. لەهەندێ وڵاتدا وەک بەریتانیا و هێندوستان لێژنەی سەرۆکایەتی دەسەڵاتی جێبەجێکاریی حکوومەت، واتە کابینە، لەناو دەسەڵاتی یاسادانانەوە دێتە دەرەوە. ئەندامانی کابینە، زۆربەی کات لەحیزبی زۆرینەی ناو دەسەڵاتی یاسادانان

دەکێشرێنە دەرێ. واتە، دەسەڵاتی جێبەجێکاریی لە خودی دەسەڵاتی یاسادانانەوە سەرچاوە دەگرێت و جێبەجێکاری پارڵەمانتاری بەرپرسیارە لە بەرانبەر دەسەڵاتی یاساداناندا و تا ئەو کاتەی لە سەر دەسەڵات دەمێنێتەوە کە متمانەی دەسەڵاتی یاسادانانی هەبێت. ئەمە بەشێوەی ئاسایی پێی دەگوترێت سیستەمی پەرلەمانتاری حکوومەت. لە سیستەمی پارڵەمانتاریدا دەسەڵاتی جێبەجێکاری بریتییە لە سەرۆک کۆمار (یان

مۆنارش وەکو ئەوەی لە ئینگلیزدا هەیە یان ئەنجومەنی سەرۆکایەتی لە هەندێ وڵاتدا ) کە بەشێوەی ئاسایی و بەرواڵەت سەرۆکی یاسایی دەوڵەتە. پاشان سەرۆک وەزیران دێت کە سەرۆکی راستەقینەی حکوومەتە. سەرۆک وەزیران لەلایەن وەزیرەکانەوە یارمەتی دەدرێت کە بەرپرسایەتی وەزارەتخانە تایبەتیەکانیان لە ئەستۆیە (وەک وەزارەتی ناوەخۆ، بەرگری، تەندروستی و هتد).

سەرۆک وەزیران لەگەڵ وەزیرەکان پێکەوە پێیان دەگوترێت کابینە یان ئەنجومەنی وەزیران. لەم فۆرمەی حکوومەتدا حیزبی زۆرینە لە دەسەڵاتی یاسادانان‌دا پشتیوانی لە کابینە دەکات کە لەلایەن سەرۆک وەزیرانەوە سەرکردایەتی دەکرێت. ئەگەر، حیزبی زۆرینە متمانەی خەڵک لە دەست بدات، دەسەڵاتی جێبەجێکاریش، دەسەڵاتی لە دەست دەدات. ئیتر حکوومەت دەڕوخێت و خەڵک دەبێت حکوومەتێکی نوێ هەڵبژێرن. لە سیستەمی پارلەمانتاریدا چارەنووسی دەسەڵاتی یاسادانان و جێبەجێکاریی پێکەوە گرێدراون. بە گشتی تایبەتمەندیەکانی سیستەمی پارلەمانتاری بریتین لە: هاوئاهانگی نزیکە لە نێوان دوودەسەڵاتی جێبەجێکاریی و یاسادانان، دەسەڵاتی جێبەجێکاریی بەرپرسیارە لە بەرانبەر یاسادانان، سەرۆکی دەسەڵاتی جێبەجێکاریی تەشریفاتییە و جیایی نێوان دوو دەسەڵات کەمترە. لەلایەکی ترەوە، دەسەڵاتی جێبەجێکاریی لە سیستەمی سەرۆکایەتیدا (پریزدینتاڵ) جیاوازە. بە پێچەوانەی پارلەمانتاری، لەم سیستەمەدا جیایی نێوان دەسەڵاتی جێبەجێکاریی و یاسادانان زیاترە ، بەڵام هەر کامیان وەک چاوەدێرێک بۆ دەسەڵاتی ئەوی تر کار دەکات. خەڵک هەردووکیان بە جیاوازیی و لە

کاتی جیاوازدا هەڵدەبژێرن. لەم سیستەمەدا ، سەرۆک کۆمار بۆخۆی دەسەڵاتی جێبەجێکاری بەڕێوەبەرایەتی دەکات و جێگری سەرۆک کۆمار کە ئەویش نوێنەرێکی هەڵبژێردراوە پێڕەوی لەو دەکات .

سەرۆک کۆمار هەر کەسی پێ شیاو بێت دەتوانێت دیاری بکات بۆ ناو کابینە. ئەندامانی تری کابینە بۆیان نییە نوێنەرانی هەڵبژێردراو بن، بەڵام دیاریکردنیان دەبێت لەلایەن دەسەڵاتی یاسادانانەوە پەسند بکرێت. دەسەڵاتی جێبەجێکاری زۆربەی بڕیارە سیاسیە گرنگەکان دەدات، بەڵام ئەوانە بابەتگەلێک دەبن بۆ پەسندکردن لەلایەن دەسەڵاتی یاسادانانەوە. هەروەها دەسەڵاتی جێبەجێکاری ، مافی ڤیتۆی هەیە لەسەر هەندێ پێشنیار نامە کە لەلایەن دەسەڵاتی یاسادانانەوە پەسەند کراون.

کەواتە دەسەڵاتی یاسادانان و جێبەجێکاری لە سیستەمێکی سەرۆکایەتیدا لە بارودۆخێکی یەکساندان. ئەم سیستەمە زۆرتر گەڵاڵە کراوە بۆ پێشگیری لە زاڵبوونی دەسەڵاتێکی حکوومەت بە سەر ئەوی تردا، بەڵام لێرەدا سیستەمی پشکنین و هاوسەنگی (چێک و بالانس ) هەیە. کە لەکاتێکدا کە لە سیستەمی پارلەمانتاریدا دەسەڵاتی جێبەجێکاریی زاڵە بەسەر دەسەڵاتی یاسادانانددا. چۆن دەسەڵاتی جێبەجێکاریی جیایە لە دەسەڵاتی یاسادانان، دەسەڵاتی جێبەجێکاریی بەرپرسایەتی راستەوخۆی نییە. هەروەها بەپێچەوانەی سیستەمی پارلەمانتاری، دەسەڵاتی جێبەجێکاری لە سیستەمی سەرۆکایەتیدا مافی راگرتنی دەسەڵاتی نەگۆری هەیە و بەهاسانی ناکرێ وەلا بنرێت، مەگەر لە رێگای شێوازێکی سەختی پێوەندیدار بە راگەیاندنی تاوان لەلایەن دادگاوە. بۆ ئەم سیستەمە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا چاکترین نموونەیە. دەسەڵاتی یاسادانان

(کۆنگریس لە ویلایەتە یەکگرتووەکاندا) وەک چاودێریکی دەسەڵاتی سەرۆک کۆماریی کار دەکەت. هەر وەک وییر دەڵیت: پێوەندی دەسەڵاتی یاسادانان و جێبەجێکاری لە ویلایەتە یەگرتووەکانی ئەمریکا بارودۆخێکی یەکسانی هەیە . بە گشتی تایبەتمەندیەکانی سیستەمی پرێزدێنتاڵیش بریتین لە :جیایی زیاتری نێوان دەسەڵاتی جێبەجێکاری و یاسادانان، دەسەڵاتی جێبەجێکاریی لە بەرانبەر یاساداناندا بەرپرسیار نیە، سەرۆکی دەسەڵاتی جێبەجێکاریی راستەقینەیە(رئال).

لە حکوومەتی پارلەمانتاریدا لە هەندێ وڵاتی وەک ئینگلیز، بەهۆی هەبوونی فەلاقە یان "شەلاخی حیزبی" کە بۆ پەسەندی یاساکان لە ئەنجومەنی نیشتیمانیدا و راگرتنی زۆرینە لە یەک هێڵدا بەکار دەهێنرێت، بە پێویست دەسەڵاتی جێبەجێکاری کۆنترۆڵی زۆرتری بە سەر یاساداناندا دەبێت کەچی لە پرێزدێنتاڵدا وا نییە چونکە دەسەڵاتی جێبەجێکاریی لە کۆنگرێسەوە نایەتە دەرێ. لە ئەمریکادا دابەشکردنی دەسەڵات لە نێوان سێ لقی حکوومەتی گشتییدا پشتگیری دەکات لە هەر کارێک کە بە هۆی قۆرخ گکردنی دەسەڵاتەوە بێت، لە رێگای دابەشکردنی دەسەڵات لە نێوان لقە دامەزراوەییەکان ( چێک و باڵانس) و هەروەها لەنێوان دەسەڵاتداران (فیدرالیزم). لە هەردوو ئەنجومەنی نوێنەران و پیران (سینا) خەڵکی ناو ئەو هەرێمانە دەبێت نوێنەرایەتی بکرێن. لە هەندێ ِ وڵاتدا وەکو هیندووستان ئەگەرچی یاسای بنچینەیی جیایی سفت و پتەوی دەسەڵاتەکانی وەکو وڵاتی ئەمریکا نەناسیووە وە هەرچەند ئاماژە بە پۆلێنبەندی سێینەی کارکردەکانی هەر سێ دەسەڵات وەکو سێ لقی جیاوازی حکوومەت دەکرێت، بەڵام وێرای پارلەمانتاری بوونی، ئێستاکە

لەو وڵاتەدا قازانجی سیاسی دۆکترینی جیایی دەسەڵاتەکان بەشێوەی بەربڵاو ناسراوە. ئەوە لە کاتێکدایە کەلە وڵاتێکی وەک ئینگلیز ئەم جیاییە نابینرێت، وێرای ئەوەی کە باشترین جۆری ئازادی مەدەنی پارێزراوە و دادوەرە ئینگلیزیەکانیش قەت ناکەونە ژێر کاریگەری دەسەڵاتی جێبەجێکارییەوە.

هەر لەم پێوەندییەدا پێویستە ئاماژە بکرێت بەشێوازی راستەوخۆ و ناڕاستەوخۆی هەڵبژاردن. کاتێک خەڵک راستەوخۆ نوێنەرانی خۆیان هەڵدەبژێرن سیستەمەکە پێی دەگوترێت هەڵبژاردنی راستەوخۆ. لێرەدا خەڵک دەچنە بەر سندۆقەکان و دەنگ دەدەن بەو پاڵێوراوەی کە دەیانهەوێت و ئەو پاڵێوراوەش کە زۆرینەی دەنگەکانی هێناوە، سەرکەوتووە. ئەم شێوازە کە بە ساکاربوونی دیاری دەکرێت، لە هەڵبژاردنی ئەنجومەنی نوێنەرانی دەسەڵاتی یاسادانانی زۆربەی وڵاتانی دیمۆکراتیکی جیهاندا، بەکاردەهێنرێت وەکو ئەنجومەنی گشتی لە ئینگلیز یان هیندوستان. لەهەڵبژاردنی ناڕاستەوخۆدا، دەنگدەران، لەڕێگای راستەوخۆوە پاڵێوراوانی خۆیان هەڵنابژێرن. ئەوان سەرەتا دامەزراوەیەکی نێوەنجی کە پێی دەگوترێت"کۆلێژی هەڵبژاردن" هەڵدەبژێرن، کە هەڵبژاردنی نوێنەرەکانیان پێ دەسپێردرێت. بۆیە لەشێوازی ناڕاستەوخۆدا" هەڵبژاردنی دوو قۆناخی هەیە". سەرۆک کۆماری ئەمریکا لەم رێگایەوە هەڵدەبژێردرێت. خەڵک راستەوخۆ دەنگ نادەن بەسەرۆک کۆمار و ئەوان لەهەردووکی ناوەند و ویلایەتەکاندا رێژەیەک لەنوێنەرانی خۆیان هەڵدەبژێرن و ئەو نوێنەرانە کۆلێژی هەڵبژاردن پێکدەهێنن، کە لەکۆتاییدا سەرۆک کۆمار هەڵدەبژێرن. لە

هێندوستاندا سەرۆک کۆمار، ئەندامانی ئەنجومەنی سەرەوەی حکوومەتی ناوەندیی و ئەنجومەنی سەرەوەی ویلایەت بەشێوەی ناڕاستەوخۆ هەڵدەبژێردرێن.

## کۆنفیدراڵیزم وەک زاراوە

هەروەکو دەزانرێت کۆنفیدراسیۆن زاراوەیەکی نوێ نییە، بەڵکو سیستەمێکە کەلەگۆڕانکاری سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتی و هتد.. لە پەیوەندی نێوان دەوڵەت، کۆمەڵە، یەکێتیەکان و تەنانەت لەنێوان خێڵ و تیرەکانیشدا پەیڕەو دەکرێ. لەم چوارچێوەیەدا هەروەکو چۆن کۆنفیدراسیۆن شێوەیەکی پەیوەندی نێوان دەوڵەتەکانە، لەهەمانکاتدا وەک مۆدێلێکی ڕێکخستنی چین و توێژە کۆمەڵایەتیەکانیش دەبینرێت، ئەو دەزگایانەی لەیەک پێکهاتەی ناوەندی پێکدێت پێی دەڵێن یونیتار (ناوەندی)، ئەو پێکهاتانەی لەدوو یان سێ ناوەند زیاتر ئاواکراوە و دوا گوتە هی ناوەندی فیدراڵە، بەقەوارەی فیدراڵ ناودەبرێت، ئەو پێکهاتانەش کەلە چەندین قەوارەی تایبەتی سەربەخۆ پێکدێن و لەچوارچێوەی پرەنسیپ و پەیوەندی هاوبەشدا بەیەکەوەن، و دوا بڕیاریش بۆ ناوەندە سەربەخۆکان دەگەڕێتەوە بە کۆنفیدراڵ بەناو دەکرێن. تاوتوێ کردن و بەراوردکردنی ئەم سێ چەشنە پێکهاتەیە لەبواری چۆنێتی پێکهاتەکەیان و میکانیزمی بڕیار وەرگرتن و بەڕێوەچوون ڕەنگە سوودبەخش بێت، سیستەمی یونیتار (ناوەند) هەر تەنیا پێکهاتەیەکی تایبەت بەدەوڵەت نییە، بەڵکو دەشێ ڕێکخستنێک یان پێکهاتەیەکی سیاسی و کۆمەڵایەتی ناوەندی (مرکزی) بێت، بەبێ هاوبەشێتی و وەرگرتنی بۆچوونی هیچ لایەک، لەلایەن ناوەندێکەوە بڕیار دەدرێت، پڕاکتیزەکردنیشی بەهەمان شێوە لەلایەن خودی ناوەندەکەوە دەبێت.

لەسیستەمی فیدراسیۆنیشدا زیاتر لەناوەندێک بوونی هەیە، فیدراسیۆن پشت بەدوو پێکهاتەی سەرەکی دەبەستێت:

یەکێکیان: پارچە بچووکەکانە، ئەوەی تریش گوزارشت لەگشت دەکات، هەربۆیە پێکهاتەی فیدراسیۆن و فیدراڵی بەیەکەوەن، ئەگەر پێکهاتەی جێی باسی دەوڵەت بێت، ئەوە میکانیزمی هاوبەش لەچوارچێوەی دەستوور دەستنیشان دەکرێت، بەدەر لەو دەسەڵاتەی دەستوور بەفیدراسیۆنەکانی بەخشیوە، دوا بریار هی پێکهاتەی فیدراڵە، کۆنفیدراسیۆن هەر وەک چۆن ناوەندی (یونیتار) نییە، ئەو لایەنە جیاوازانەی فیدراڵیش لەخۆوە دەگرێت، لەسیستەمی کۆنفیدراسیۆن زیاتر لەناوەندێک بوونی هەیە، لەجیاتی لەیەکچوونی ئەو ناوەندانە دەشێ لەنێو پرەنسیپی هەمەڕەنگیدا لەیەکتر جیاوازبن. کاتێک کۆنفیدراسیۆنی دەوڵەتەکان جێگای باس بێ ئەوە لەجیاتی دەستوور لەڕێگەی پەیماننامەکانەوە، پەیوەندی نێوان ناوەندە جیاوازەکان دەستنیشان دەکرێت. بەپشتبەستن بەم پێکهاتە فرە لایەنانەوە، پرۆسەی بڕیاردان بەڕێوەدەچێت، لەبڕیار وەرگرتندا دوا هەڵوێست لای ئەو یەکینانەیە کە کۆنفیدراسیۆن پێکدێنن، لەم بوارەدا زۆر لە لایەنەکانی لەپێکهاتەی فیدراسیۆن جیاوازترە. لەکۆنفیدراسیۆندا ناوەندیبوون زیاتر دابەش دەکرێت. لێرەدا وەک فیدراسیۆن پەیوەندی نێوان پارچە و گشتی جێگای باس نییە، بەڵکو بڕیاری سەربەخۆی هەر ناوەندێک و بڕیاری هاوبەشی گشتیان بەیەکەوە بە بنەما وەردەگیرێت، بەهۆی چۆنێتی میکانیزمی بڕیار وەرگرتنەوە بەهای کۆنفیدراسیۆن کەم نابێتەوە، دەشێ چەندین دەوڵەت بۆ ماوەیەکی کورت و کاتی لەنێو پەیوەندی کۆنفیدراڵیدابن، بەڵام ئەو کۆنفیدراسیۆنانەی خاوەن گەوهەرێکی جڤاکی و ئابوورین، تاکتیکی نین، ستراتیژین. لە کۆنفیدراسیۆندا هاوپشتی، گونجاوی، جموجۆڵ و بەرێوەچوونی خودی هەرناوەندێک بەباشترین شێوە ستراتیژییە، بەڵام لە

بواری پێکهاتە، بڕیار وەرگرتن، چاودێریکردنی کارەکانیان و جێگیرکردنی میکانیزمی ناوخۆ ( سیاسی و جڤاتی و کولتووری و ئابووری ) ناوەندەکان بە شێوەیەکی سەربەخۆ بەڕێوەدەچن، دەستپێشخەری هی یەکینە سەربەخۆکانە، پێناسەی سەرەکی کۆنفیدراسۆن پێویستی بەمەیە، واتا هەم لەلایەنی پێکهاتە، هەم لەلایەنی بڕیار وەرگرتن و چۆنێتی جێبەجێکردنی، جیاوازیەکانی خۆی لەگەڵ پێکهاتە ناوەندیە وشکەکان نیشاندەدات.

لەنێو زانستی سیاسی رۆژگاری ئەمرۆمان کاتێک ئەم زاراوە و پێکهاتانە بەکاردەهێنرێن یەکسەر دەوڵەت بەبیری مرۆڤدادێت، بۆنموونە کاتێک باس لە پێکهاتەی (یونیتار) ی ناوەندی دەکرێت ، دەوڵەتی نەتەوەیی ناوەندی بەبیر مرۆڤدا دێت. پێکهاتەی سیاسی یونیتاری (ناوەندی) جگە لەکۆمەڵگەی سەرەکی دەرفەت به جێگرتنی پێکهاتە سیاسیەکانی دیکە نادات، ناشێ و مەحاڵە پێکهاتەیەکی سیاسی جێگای خۆی لەنێو چوارچێوەی پێکهاتەی یونیتاردا بگرێ کە یەکێتی و یەک پارچەییەکەی تێکبدات. تەنانەت ئەو پێکهاتانەی لە دەرەوەی سنووری بەڕێوەبردنی دەوڵەتیش دەمێنێت (رێخراوەکانی کۆمەڵگەی مەدەنی، وەرزشی، زانکۆکان) بەشێوەیەک لە شێوەکان بە دەوڵەت دەبەسترێنەوە، هیچ رێکخستنێک یان گۆڕەپانێک ناتوانێت بەشێوەیەکی سەربەخۆ کاربکات. میکیانیزمەکانی بریار وەرگرتن، بەگوێرەی یەک ناوەند شێوەیان گرتووە، هەروەکو لەنموونەی تورکیادا دەبینرێ سەپاندنی یەکڕەنگی ( ناوەند) لەبواری کلتوریشدا جێگای باسە، بەڵام رەتکردنەوەی کلتووری جیاواز لەلایەن دەوڵەتەوە ناچاری نییە.

هــەرچــی ســـەبـــارەت بـــەفیدراســـۆنەکانـــە ڕەوشـــی جیـــاوازترە، لەکۆنفیدراسیۆن زیاتر دەتوانرێ بگوترێ کە نزیک  بەپێکهاتەی یونیتارە. تاڕادەیـەک ئـەمریکا بـەمجـۆرە بـەڕێوەدەچـێ، هـەندێکیشـیان بـەشـێوەی ناوچـەی ئۆتۆنـۆمن و بـەرەو پێکهاتـەی ئەیالـەت هـەنگـاو دەهـاوێژن و تایبــەتمــەندێتیــەکــەیان پــەیڕەوکردنــی شــێوەیەکی نــاوەندیبوونــە لــە کاروبـارەکانیـان، لـەبـواری فـەلسـەفـەی بـەڕێـوەبـردن و سیاسـت هـیچ جیـاوەزیـەکیـان لەگـەڵ پێکهاتـە نـاوەندیـەکاندا نییـە، وەکـو کۆنفیدراسـیۆن تایبـەتمـەنـدێتی جیـاواز لـە خـۆوە نـاگرن ، پشـت بەپێکهاتـەی نـاوەنـدی دەبەسـتن، لەگرفتەکانیاندا دەسپێشخەری هی ناوەندە.

هـەندێ کـارو چالاکی هـەن کـە هـەرگیز نـاوەند بۆ فیدراسـۆنەکانی جێناهێڵێ: بۆ نمونە ئاسایشـی نیشـتیمانی، پـەیوەنـدی دەرەوە، بـەکارهێـنانی هێـزە چـەکدەرەکـان ...هتـد کـەکۆلـەکـەی سـەرەکین بـەدەسـت نـاوەنـدەوە دەمێنێتەوە. بەهۆی نیگەرانیەکانی  پێویست بینینی بەهێزی ناوەندگەرایی، بەدەست ناوەند دەهێڵدرێتەوە. ئەو هەڵوێستە بەبنەما دەگرن کەدەڵێ دەبێ ناوەند بـەهێزبێت، بۆئـەوەی کاتێک گیروگرفت لەپارچـەکان دەردەکەوێت تاوەکو دوابریار هی تۆبێت. هەربۆیە بەهۆی ئەم لۆژیکەوە هـەندێک ئـەرک هەیە هەر لەسـەرەتاوە  پێکهاتەی فیدراسیۆن دەستبەرداری لێناکات .

هــەرچــی بــەگوێرەی لــۆژیکی کۆنفیدراســیۆنە ئــەمانــە دەگــۆڕێن ، لەکۆنفیدراسـیۆندا پێکهاتەیـەکی فرە لایـەنی جێی باسـە، هـەندێ جار ئـەم پێکهاتە جیاوازانە لەیەکێتی دەوڵەتەکان پێکدێت، هـەر لەسـەرەتاوە هێزێکی کەڵەکەبوو لەئارادا نییە، سیستەمێکە کە ناوەندە سەربەخۆ و ئۆتۆنۆمـەکان

لەمیانەی پەیماننامەوە ئاوایدەکەن، ناوەندیبوون بەپێی پێویست لەپێناو نیشاندانی هێز یان هاوبەشێتی پێکدەهێنرێت.

سیتەمێکە کە لەبوارەکانی ئابووری و تەندروستی و پەروەردە بەشێوەیەکی هێشوویی بەکاردەهێنرێ و سوودی لێ دەبینرێت، ئەمە لەناوەڕۆکی فەلسەفەی یەکگرتنیدا هەیە، هەڵبەتە کۆنفیدراسیۆن لەپێناو ئەو ئامانجانە ئاوا دەکرێت، واتا کۆنفیدراسیۆن جگە لەیەکینەکانی یەکێتیەکە پێکهاتەیەکی سەرووی چەتر ئاسا لەخۆوە ناگرێت، هەر ناکۆکی و گرفتێک دەربکەوێت دەستپێشخەری دەدرێتە یەکە یەکەی پێکهاتەکان.

لەکۆنفیدراسیۆنی دەوڵەت هەروەکو چۆن ناوەند (یونیتارەکان) دەتوانن جیا ببنەوە دەشێ بەشداری لەهەندێک لایەنی پەیماننامەشدا نەکەن، واتا وەکو دەوڵەت دەتوانێت جێگەی خۆی لەهەندێ ڕێککەوتن و بڕیاردا نەگرێت، مافی جیابوونەوەی لەکۆنفیدراسیۆن بەو واتایە نابێ کەی ئارەزووی بێ بڕیارەکان پێکبهێنێ یان بە پێچەوانەوە، لەهەمانکاتدا نابێ لەچوارچێوەی راوەستەی (پارچەکردن) و بەلاداکێشانی کۆنفیدراسیۆندا بێ، چونکە لەمیانەی یەکێتیەکی دڵخوازانە و خۆبەخشانە هاتوونەتە لای یەکترەوە. کاتێ بخوازێ دەتوانێت دەربکەوێت، بەڵام لەکاتی یەکبووندا وابەستەی کۆنفیدراسیۆن و بنەماکانێتی.

ئەگەر سەرنج بدرێ دەبینرێ کە لەباسکردنی تەواوی ئەم پێناسانە باس لە پێکهاتەی سیاسی، میکانیزمی بڕیاردان، لەپێشینەی میکانیزم و پێکهاتەکان و مافی چاودێریکردن کراوە، زیاتر هەوڵدرا لەچوارچێوەی پێکهاتەی سیاسی تاوتوێ بکرێ، چونکە بەگوێرەی زانستی سیاسی و یاسای دەوڵەتەکان ئەم زاراوانە بەمجۆرە تاوتوێدەکرێن. لەم پێناسانەش

زیاتر پێویستە ئێمە لەمیانەی نرخاندن و لێکۆڵینەوەوە چەمکی کۆنفیدرالیزمی خۆمان ڕوون بکەینەوە کە ڕێکخستنێکی دووری دەوڵەتە. تەنها لەپێناو ڕوونکردنەوە سیستەمی کۆنفیدرالیزمی دیموکراتی و نیشاندانی جیاوازیەکانی لەگەڵ سیستەمەکانی دیکە ئەم زاراوەیەمان تاوتوێکرد، چونکە سیستەمی ڕێبەرایەتیمان دەوڵەت نییە، ناتوانین لەمیانەی بەدەزگابوون و کولتووری سیاسی پشت بەستوو بەدەوڵەت بجوڵێینەوە، ناتوانین لەسنوورەکانی دەوڵەتگەرایی بمێنینەوە، هەربۆیە پێویستە لەمیانەی زاراوە کۆمەڵگەراییەکانی خۆمانەوە درێژە بە بابەتەکان بدەین و ڕوونکردنەوەی زاراوەکانی دەوڵەت تەنیا بۆ بەراوردکردن تاوتوێ بکەین، هەڵوێستێکی پێچەوانە پێکهاتەی کۆنفیدرالیزمی دیموکراتیک دەخاتە نێو سنوورە دەوڵەتگەراییەکان. لەم بوارەدا ئاماژەکردن بەم خاڵە سوودمەندە، چەندەی باس لەم بابەتە بکرێت دەرک بەوە دەکرێ کە دەبێت کۆنفیدرالیزمی دیموکراتیک وەکو کۆمەڵگای دەرەوەی دەوڵەت و بەگوێرەی زاراوە کۆمەڵکاری (کۆمینالّ)یەکان باس بکرێ. بەئامانجی گوزارشت کردن لەزاراوەی خۆمان بەشێوەیەکی سنووردار و بەرتەسکیش بێت سیستەمە سیاسیەکانمان تاوتوێکرد.

## مێژوو و ڕاستینەی کۆنفیدرالیزم سەبارەت بە کۆمەڵگا و بونیادەکانی

لە کۆنفیدراسیۆنی خێڵەکان بەدواوە بەدرێژایی مێژوو لە قۆناخە جیاوازەکاندا کۆنفیدراسیۆن لەبواری کرداری بەڕێوەچووە، لەلایەک پێکهاتە ناوەندیە پلەداریەکانی دەوڵەت پێشخراوە، لەلایەکی دیکەشەوە وەک ڕێکخستنێکی جڤاکی و بەڕێوەبردنی کۆنفیدراسیۆنەکان جێگای خۆیان گرتووە. لەم چوارچێوەیەدا ئەگەر بڵێین مێژووی سیاسی مرۆڤایەتی تەنیا بەهەژمونگەرایی دەوڵەتدا تێپەڕیوە هەڵەیە، بەپێچەوانەوە بەو ئەندازەیەش سیستەمی کۆمەڵکاری (کۆمینال) دیموکراتی ئازادیخواز و یەکسانیخواز لەئارادابوون.

کۆنفیدراسیۆنی خێڵەکان، ئەو دەوڵەتشارانەی دیموکراسی ڕاستەوخۆیان پەیڕەو دەکرد، مەزهەبە مرۆییەکان و گروپە سۆفیگەراییەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست (عەلەوییەکان و خەوارجەکان و ئیسماعیلیەکان و قرمتیەکان) ... هتد، ئەو بەکۆمەڵگابوونانەی لەدەوروبەری پێغەمبەر و ئەولیاکان پێکهاتووە، قۆناغی سەرەتایی ژیانی کڵێسای مەسیحیەکان ئەگەر ناوەندی پراکتیکی فیدراڵ و کۆنفیدرالی بەڕێوەبەرایەتی درێژایی مێژووی ڕۆژهەڵاتی ناوین بن، نموونەگەلێکی کۆمین، ئەنجوومەن و کۆنفیدراسیۆنی درێژایی چاخی ناوین لەئەورووپا (ئەنجوومەنی شارەکانی ئیتالیا، کۆنفیدراسیۆنی سویسرا، کۆمۆنەکانی پاریس، ئەنجوومەنی شارۆچکەکانی ئەمریکا، سەکسیۆنی (کەرتی) گەڕەکەکانی ئیسپانیا) و ... هتد. چەندین نموونەی تریش دەتوانرێ نیشان بدرێ. دەشێ دەوڵەتی نەتەوەیی لەم دوو سەد ساڵەی دوایی باڵادەست بووبێت، بەڵام مێژوو بریتی نییە لەم دیاردەیە، لەماوەی چوارسەد ساڵە

قۆنـــاغی تێپـــەڕبوونی دەرەبەگايـــەتی بـــۆ ســـەرمايەداری دەكرێـــت ، ئەزموونەكانی كۆنفیدراڵیزمی (كۆمیناڵ) كۆمەڵكاری مرۆڤايەتی گوزارشت لـە پراكتیكی زینـدوو و فـراوان دەكـات، لەكاتێكدا هەنـدێك بیرمەنـد بـاس لەهەنگاونان بەرەو سیستەمی دیموكراتی كۆمیناڵ دەكەن، بەهۆی هەندێك فاكتەرەوە تێپەڕبوون بۆ سیستەمی سەرمايەداری دێتەئاراوە، لە قۆناغێكدا كـە هـەرە زێـدە دەوڵـەتی نەتـەوەیی و بەسـەرچوونی بووەتـە ڕۆژەڤ و مـژاری گفتوگـۆ كـردن، پێهـەڵگرتنی كۆنفیدراسـیۆن راسـتیەكە دەركـی پێدەكرێ. هەروەكو بڵێین ئەمڕۆ لەنێو لێپرسینەوەیەكی مێژوویی داین.

وەک زاراوە ئـەو كۆنفیدراسـیۆنانەی دیمـوكراتن و پشـت بـە پێكهاتـە ديموكراتییەكان دەبەسـتن بـە كۆنفیدراسـیۆنی دیموكراتیانـە بـەناو دەكرێن، لێـرەدا جیاوازیـەكی بـەمجۆرە هەیـە كۆنفیدراسـیۆنی دەوڵەتـەكان نییـە، كۆنفیدراسیۆنی پێكهاتە دیموكراتیەكانە، سیستەمی بەیەكەوە بوون جێگای باسە، ئەگەر خوازیاری پێناسەكردنی كۆنفیدراسیۆنی دەوڵەتەكان بووینایە ئـەوەی سـەرەتا ئاماژەمـان پێكـرد تێـری دەكـرد. واتـا دوای ئـاواكردنی دەوڵەتـەكان دەتـوانی بـە پەیماننامەیـەكی هاوبـەش كۆیـان بكەیتـەوە، بـەگوێرەی خاڵـە هاوبەشـەكانی پەیماننامەكـە كۆنفیدراسـیۆنی دەوڵەتـەكان پێكبهێنـرێ، بـەڵام كاتێـك بـاس لـە كۆنفیـدرالیزمی دیمـوكراتی كـرا كـە دیموكراتیكـــە، دیمـــوكراتی كردووەتـــە ئامـــانج و پـــەیڕەوی دەكـــات و نوێنەرايەتی پێكهاتە دیموكراتیەكانی سەرجەم بوارەكانی ژیان دەكات، ئـەو كاتە جیاوازیەكان دەست پێدەكات.

## ئایا تا چەند دەسەڵاتی دادوەری لە هەرێمی کوردستان سەربەخۆیە؟

قسەیەکی باو لە نێوان یاساناساندا هەیە دەڵێت، دەبێت یاسا وەک مردن بێت، جیاوازی لە نێوان کەسدا نەکات. بەڵام بەردەوام ئەو پرسیارە دەوترێتەوە ئەو قسەیە تا چەند لە دادگاکانی هەرێم کاری پێدەکرێت و تا چەند بەرپرسانی هەوڵیانداوە سەربەخۆیی دەسەڵاتی دادوەری بپارێزن.

جیاکردنەوەی دەسەڵاتەکان و بێلایەنی دەسەڵاتی دادوەری کرۆکی چەسپاندنی سیستمی دیموکراسی و بەدیهێنانی دادوەری کۆمەڵایەتیەو، هەر حکومەتێک بیەوێت دیموکراتی بێت یان بانگەشەی دیموکرسی بوون بکات دەبێت دادگاکانی دووربن لە دەستێوەردان و فشاری دەسەڵاتی جێبەجێکردن.

هەرێمی کوردستان کە ئەزمونەکەی بە ئەزمونێکی سەرکەوتوو لە عێراق و ناوچەکە دادەنێت و بانگەشەی سەرەوەری یاسا و مافەکانی مرۆڤ دەکات، بەڵام زۆرجار رەخنە لە سەربەخۆیی نەبوونی دادگاکان و بێدەنگی داواکاری گشتی دەگیرێت لەو پێشێلکاریانە بەرامبەر مافی گشتی دەکرێن.

دادگاکانی هەرێم جگە لەو گومانەی لە بێلایەن نەبوونیان دەکرێت هاوکات وەرنەگرتنی بەشێک لە سکاڵاکان کە بەدڵیان نین یان لە بەرژەوەندی لایەنێکدا نین لە لایەن بنکەکانی پۆلیسەوە، هێندەی دیکە کاری دادگاکانی لاواز کردووەو ناتوانن ئیش لەسەر دۆسییەکان بکەن یەکلایان بکەنەوە.

لە نوێترین حاڵەتدا دەستەی پارێزەرانی کۆمەڵی ئیسلامی ڕایانگەیاند بە تۆمەتی ناوزڕاندنی کۆمەڵی ئیسلامی ویستوویانە لە بنکەی پۆلیسی ئازادی شاری هەولێر سکاڵا لەسەر ئەنجومەنی ئاسایشی هەرێم تۆمار بکەن، بەڵام سکاڵاکەیان لێوەرنەگیراوە و کراونەتەدەرەوە.

ئەوەش ئەوەمان بیردێنێتەوە کە دوای ئەوەی لە ١٠ ی ئۆکتۆبەری ساڵی ڕابردوو هێزێکی ئاسایش هێرشیان کردە سەر نوسینگەکانی کەناڵی ئێن ئار تی لە هەولێر و دهۆک و نوسینگەکان داخران، کەناڵەکە وەک دەزگایەکی فەرمی ڕێگەپێدروا سکاڵای یاسایی لەسەر ئەو هێزە و داخستنی نوسینگەکانی کرد، بەڵام پۆلیسی هەولێر ڕەتیکردەوە سکاڵاکە وەربگرێت و ڕەوانەی دادگای بکاتەوە.

وەرنەگرتنی سکاڵا لەلایەن بنکەکانی پۆلیسەوە لە هەرێمی کوردستان لەکاتێکدایە بەپێی ماددەی ٣٢٩ بڕگەی دووەم و ماددەی ٣٣١ ی یاسای سزادانی عێراقی هەر فەرمانبەرێک یان ڕاسپێردراوێک بۆ خزمەتی گشتی کە ڕێگری بکات لە جێبەجێکردنی حوکم یان فەرمانی دادگاکان ئەوا بە سزای زیندانیکردن و دارایی یان یەکێکیان سزا دەدرێت.

وەک بەشێک لە یاسا ناسان دەڵێن، لە هەرێم کێشەی نەبوونی یاسا نییە بەڵکو کێشەی جێبەجێنەکردن و پێشێلکردنی یاسا هەیە.

## دەسەڵاتی دادوەری بەحزبی کراوە

١٣ی ئاب یەکەمین ساڵیادی تیرۆری ڕۆژنامەنووس و پەیامنێر وەدات حسێن-ە، کە ساڵی ڕابردوو تیرۆرکرا، بەداخەوە لە هەرێمی کوردستاندا دەستدرێژی و کوشتنی ڕۆژنامەنووسان بووە بە دیاردە و کەیسەکانیش یەکلایی ناکرێتەوە، دۆسیەی شەهید وەدات-یش یەکێکە لەو دۆسیانە، ئەمانەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە لە هەرێمی کوردستاندا یاسا سەروەر نییە، یاسای باشمان هەیە، بەڵام خراپی لە کارپێکردنیدایە، یاسا سەربەخۆ نییە، زۆرگرنگە کە یاسا سەربەخۆبێت، بەڵام لە هەرێمی کوردستاندا دەسەڵاتی دادوەری بە حزبی کراوە، دادوەرەکان بێلایەن نین، دادوەری گشتی دەسەڵاتی دیاری کراوە و سنوری بۆ دانراوە."

دادوەری گشتی لەسەر وەزارەتی دادوەرییە، لە کاتیکدا دەبێت سەربە ئەنجومەنی دادوەری بێت، کەواتە چۆن بتوانێت کە دۆسیە تاوانکارییەکان ئاشکرابکات، لەسەرووی ئەمانەشەوە ئێمە سیستمێکی حوکمڕانیمان هەیە، کە باوەڕی بە دامەزراوەیی و جیاکردنەوەی دەسەڵاتەکان نییە، ئەمانە هەموو هۆکارن بۆ ئەوەی کە یاسا بە ڕێکی جێبەجێ ناکریت لە هەرێمی کوردستاندا."

پێویستە ئێمە سەرەتا کار لەسەر ئەوە بکەین کە ئەقڵییەتی حوکمڕانی بگۆڕین لەهەرێمی کوردستاندا، وە تێڕوانین بۆ پەرلەمان و دەزگاکان بەشێوەییەک نەبێت کە لە خوار حزبەوە سەیربکرێن، دەبێت دەسەڵاتی خۆیان هەبێت بەتایبەتی دەسەڵاتی دادوەری."

لە سەروی ئەمانەشەوە پێویستمان بە دەستوورێک هەیە لە وڵاتاندا دەستوور گرەنتییەکی بنەڕەتییە بۆ پاراستنی ماف و ئازادی، بەڵام ئێمە دەستووریکمان نییە کە پاریزەری ماف و ئازادییەکانمان بێت، لەگەڵ ئەوەی کە دەستوورمان نییە دادگایەکی دەستووریشمان نییە کە دادگای دەستووری لەگەڵ بوونی دەستووردا دادەمەزرێت."

لە بەرواری ١٧-٥-٢٠١٦ لەئەنجامی ڕێککەوتننامەی سیاسی نێوان یەکێتی نیشتیمانی کوردستان و بزوتنەوەی گۆڕاندا، لەیەکێک لە خاڵەکانی ڕێکەوتنەکەدا کە ئاماژەی پێکراوە لەماددەی ( دوانزە)دا دەڵێت: دەسەڵاتی دادوەری ماددەی دوانزە: ١- هەردوولا پابەندن بەپێویستی سەربەخۆکردنی تەواوی دەسەڵاتی دادوەری، دادوەرەکان لەڕووی وەزیفی و دارایی و کارگێڕییەوە زیاتر کاراکردنی دەزگای داواکاری گشتی و کۆتاییهێنانی دەستوەردان لەکاروباری دادگاکان، پێویستی هەموارکردنی هەردوو یاسای دەسەڵاتی دادوەری و داواکاری گشتی و سەرجەم یاسا پەیوەندیدارەکان لەپێناوی بەدیهێنانی ئەم ئامانجەدا.

بەڵێ کەواتە پێشتر سەربەخۆنەبووە، دەبێت لەمڕۆ بەدواوە ئەم دەسەڵاتە سەربەخۆبێت!.

ئەمە لە کاتێکدایە کە مرۆڤەکانی دانیشتووی ئەم هەرێمە هەموو هیواو ئاواتێکی بە دادپەروەری ئەم دامەزراوە گرنگەی وڵاتەکەی بەستوەو سپاردووە، گیانی تۆڵەسەندنەوە و دوژمنایەتی و هەوڵەکانی تری هەڵ ئەپەسێری، چاوەڕوانی ئەنجامەکانی ئەو دادپەروەریە دەکات، کەچی دەرکەوت سەربەخۆنەبووە!.

بـۆیە ناحەقیـان ناگیرێـت کە هەنـدێک جـار بەپـێچەوانەی هیـواو خواستەکانی یەوە بریارەکان دەردەچێت، بەقودرەتی قادر مێشێک دەکرێت بەگامێشـــێک، وە هەروەهـــا بەپـــێچەوانەوەش هەر ڕاســـتە، لێـــرەدا نارەوایەتیەکە بەشێوەیەکە بەڕاستی مرۆڤ توشی شۆک دەکات، کەهیچ مانایەک بۆ سەربەخۆیی دادگا و پرانسیپەکانی دادپەروەریتی ناهێڵێتەوە.

لەپێناسـەکەیدا بەڕوونـی دیارە کە سـەربەخۆیی دادگەری.. بریتیە لە ڕێچکەیەک کە پێویست دەکات بریارەکانی دادگەری بێلایەنانە بن و نابێت بکەونە ژێر باری جومگەکانی تری حکومەت یان بەرژەوەندیە تایبەتەکان یان کەسانی سیاسی.

لە زۆربەی حاڵەتەکانـدا سـەربەخۆیی دادگەری لە ڕێگەی بەخشـینی مەودای درێـژ بـۆ مـانەوەی دادوەران لە کارەکەیـان یـان هەنـدێک جـار مانەوەیـان بە درێژایـی تەمەن وایـان لێـدەکەن کە نەتوانـدرێت بە ئاسـانی لەسەر کارەکانیان لابدرێن.

دەسـەلاتی دادوەری بە یـەکێک لەسـێ دەسـەلاتە سـەرەکیەکەی هـەر دەولەتێک دادەنرێت، کە ئەرکی سەرەکی بەدیهێنانی دادپەروەریە لە نێوان تاکـەکانی کۆمەڵگـەدا، لـە ڕێگـای یەکلاکردنـەوەی کێشـە و ناکۆکیـەکانی نێوانیان یاخوود کێشەکانیان لـەگەڵ دەسـەلاتەکانی دیکە بە پەیرەوکردنی یاسا بەسەر ئەم کێشە و ناکۆکیانەدا.

ئەم دەسـەلاتە بـالایە( دەسـەلاتی دادوەری ) لە توانـای دایە سـەرجەم دەسـەلاتەکانی خـۆی پیـادە بکـات بـی ئەوەی بکەوێـتە ژێـر ڕکێفـی هـیچ دەسـەلاتێکی ترەوە، بەلام کاتێک خۆی لەئاستی بەرپرسیارێتی یەوە نەبینی

کە ڕۆڵـی ئەو هیچـی کەمتـر نـیە لە سـێ دەسـەڵاتەکەی تـر، بێگومـان بڕیارەکانیشـی لەکـاتی یەکلایـی کـردنەوەی کێشـەکان کە دەری دەکـات نـادادپەروەرانەیە و دەکەوێـتە بەرتـانەو ڕەخـنەی یاساناسـان و لایەنە بەرهەڵستکارەکان، وەک ئەوەی لەم دواییەدا لەدادگای تاوانەکانی قاهیرە بڕیـاری بێتـاوان بـوونی حوسـنی موبـارەک سـەرۆک کۆمـاری پێشـوتری میسـر و کوڕەکـانی و وەزیـری نـاوخۆ و شـەش یاریـدەدەری و خاوەنکارێکی دەرکرد.

کە بە ئاشکرا دەستێوەردانی دەوڵەت بەتایبەت دەسەڵاتی سـەربازی ئەو وڵاتەی پێوەدیارە بـوو کە چـۆن دەسـەڵاتی خۆیـان بە زۆر فەرزکـرد بەسەر دەسەڵاتی دادوەریدا.

یـان یەکلایـی نەکـردنەوەی هەنـدێ لەوکەیسـانەی کە لەدادگاکـانی عێراقـدا بینیمـان کەچـۆن هەنـدێ لەو دۆسـێیانەیان لەژێـر فشـاری سیاسـەتی هەرێمـایەتی و ناوخۆییـدا کە هەسـتان بە داخسـتنی دۆسـێکانیان یـاخود سـوککردنی تـاوانی هەنـدێ لە بەرپرسە باڵاکـانی ڕژێمـی بەعـس نمـونەی تاوانبار (سولتان هاشم)و چەندانی تر.

بەداخەوە بەهەمان شێوەش لە هەرێمی کوردستانی خۆماندا، چەند جارێک لەدادگاکاندا دەستێوەردان دەکرێت، کەوەک بنیمان و ئاگادارین کە چـۆن پارێزگـاری پێشـووی سـلێمانی بە بەهەدەردانـی سـامانی گشـتی تێوەگلابـوو وە سـزای گرتنـی بـۆ دەرچـوو پاشـان بڕیـاری حوکمیشـی بەسـەردا درا دواجـار بە بیـانوی بەرلێبـوردنی گشـتی کەوتـووە ئـازاد کـرا، کەچـی فەرمانبەرەکـانی کەلەهەمـان کەیسـدا تێـوەگلاوون تـا ئێسـتاش لە بەنـدیخانەدان و تـاڵاوی ئەو نـادادپەروەریە دەنۆشـن، سـەرەرای کەیسـی

تیرۆری رۆژنامەنووسان، زەردەشت عوسمان، سۆرانی مامە حەمە، ویداد حسێن، کاوە گەرمیانی ... هی تر.

گرینگترینیان کەیسی تیرۆری زەردەشت عوسمان و کاوە گەرمیانیە کە لەلایەن یەکێتی و پارتی تیرۆرکران کەیسەکەیان لە دادگا بەلاڕێدابرا، بچووک کرایەوە.

بۆیە دەکرێت و دەتوانێت ئەم دەسەڵاتە(دەسەڵاتی دادوەری) بە هیچ شێوەیەک رێگە نەدات دەسەڵات دەست تێوەردان بکات لەئیش و کارەکانیدا، وە ئەگەر هەر زۆریش فشاریان بۆ هێنا ئەوەدەکرا لەرێی کۆنگرەیەکی ڕۆژنامەوانیەوە، ئابڕووی ئەو کەس و لایەنانە بەرێت کە ئاستەنگ بۆ کارەکانیان دروست دەکەن.

چونکە نابێت دەسەڵاتی دادوەری خۆی بەکەمتر بزانێت لە سێ دەسەڵاتەکەی تر و بەکردار ئەوە بسەلمێنێت کە جێی بڕوا و ئومێدی هاوڵاتیانە بەگشتی، چونکە ئەم دەسەڵاتە کاتێک بریار دەدات بەناوی گەلەوە بریاردەدات، بۆیە دەبێت لە ئاست ئەو لێپرسراویەتیەدا بێت کە متمانەی پێدراوە.

## كورته‌یه‌ك ده‌رباره‌ی ئۆتۆنۆمی

سه‌ره‌تا گرنگه‌ ئه‌وه‌ بزانین كه‌ ئۆتۆنۆمی یان (حوكمی زاتی) وه‌ك پرۆژه‌یه‌كی سیاسی و یاسایی خۆی له‌سایه‌ی دوو بواری یاسایی ته‌واو له‌یه‌كتر جیاوازدا ده‌بینێته‌وه‌. ئه‌وانیش بریتین له‌، یه‌كه‌م ئۆتۆنۆمی له‌سایه‌ی نێوده‌وڵه‌تی گشتیدا . ئه‌م شێوه‌یه‌ش تایبه‌ت بووه‌ بۆ هه‌رێمێكی دیاریكراو كه‌ له‌ژێر سایه‌ی داگیركاری ( كۆڵۆنی) ته‌قلیدیدا بووه‌ بۆ فه‌تره‌یه‌كی ئنتقالی و پاشان گۆڕاوه‌ بۆ سه‌ربه‌خۆیی یه‌كجاره‌كی، ئه‌م جۆره‌ش له‌ ئۆتۆنۆمی یان حوكمی زاتی له‌رێگه‌ی به‌ڵگه‌نامه‌یه‌كی نێوده‌وڵه‌تیه‌وه‌ دامه‌زراوه‌، واته‌ یان له‌رێگای په‌یماننامه‌یه‌كی دوو قۆڵیه‌وه‌ بووه‌ وه‌ك ئه‌وه‌ی له‌نێوان به‌ریتانیا و میسردا به‌سترا له‌ ساڵی ١٩٥٣ سه‌باره‌ت به‌جێبه‌جێكردنی ئه‌و سیسته‌مه‌ له‌ سودان، یان له‌رێگه‌ی ئه‌و به‌ڵگه‌نامانه‌وه‌ بووه‌ كه‌كۆمه‌ڵه‌ی گه‌لان و پاشتر رێكخراوی نه‌ته‌وه‌ یه‌كگرتووه‌كان به‌ستونی. ئه‌و ئۆتۆنۆمیه‌ی كه‌ فه‌له‌ستینیش هه‌یه‌تی ده‌كه‌وێته‌ چوارچێوه‌ی ئه‌م جۆره‌وه‌. چونكه‌ به‌پێی به‌ڵگه‌نامه‌یه‌كی نێوده‌وڵه‌تیه‌ و ماوه‌یه‌كی دیاریكراویشی هه‌یه‌ كه‌پاش تێپه‌ڕبوونی ئه‌و ماوه‌یه‌، واته‌ پاش فه‌تره‌یه‌كی ئنتقالی ده‌توانێت ده‌وڵه‌ت راگه‌یه‌نێت، به‌ڵام به‌پێی ئه‌و ئاڵۆزیه‌ی كه‌بارودۆخی ئه‌و ناوچه‌یه‌ی شێواندوه‌ راگه‌یاندنی ده‌وڵه‌تی فه‌له‌ستینی دواخراوه‌. دووه‌میش ئۆتۆنۆمی له‌سایه‌ی یاسای ناوه‌خۆییدا. ئه‌وه‌ی جێگای گرنگی پێدانی ئێمه‌یه‌ ئه‌م جۆره‌ی دووه‌مه‌یه‌، چونكه‌ ناوه‌رۆكی باسه‌كه‌مان بریتیه‌ له‌ به‌روارد له‌نێوان دوو سیسته‌می ده‌ستوری و سیاسی ناوه‌خۆیی. جۆری یه‌كه‌میان جگه‌ له‌وه‌ی په‌یوه‌ندی

بەیاسای نێودەوڵەتیەوە هەیە، لەگەڵ بەسەر چوونی سەردەمی كۆلۆنالیزمدا،وردە وردە باوی نەما.

وەك ئەوەی لەتەواوی سەرچاوەكاندا دەردەكەوێت بنەڕەتی جێبەجێكردنی ئۆتۆنۆمی بۆ چارەسەركردنی كێشەی ئەو وڵاتەنەیە كە لەچەند نەتەوەو ئاین و زمان و مەزهەب و...... هتد. جیاوازی پێكهاتووە و گەشەی كۆمەڵایەتی و سیاسی و....... نەكردووە، ئەم سیستەمەش وەك رێكخستنێكی یاسایی بۆ چارەسەری ئەو كێشانە بۆ چوونێكی تازەیە و ماناكەشی لەڕووی زمانەوانیەوە وەك ئەوەی كەدكتۆر محەمەد هەمەوەندی باسی دەكات دەڵێت وشەی ئۆتۆنۆمی وەرگێڕدراوی (avcovouia) ی یۆنانی یەو بەرامبەر ( self – law ) یاسای خۆیی یان (self government ) توانای خۆ بەرێوەبردنی ئینگلیزی دێت. لەئینسكلۆپیدیای تریكانیشدا كەئینسكلۆپیدیایەكی ئیتالیە وشەی (Autonomia) بەكار هاتووە، دیسان ئەم وشەیەش وشەیەكی ئەغریقیە و لەدوو برگە پێكهاتووە كە بریتین لە (Auto) لەگەڵ (nomia) كەیەكەمیان مانای ( خود) دەگەیەنێت و ئەوی تریشیان بەمانای یاسا دێت، هەر دوكیشیان بەسەر یەكەوە بەو مانایەدێن كە مرۆڤ خۆی حوكمی خۆی بكات.

وەك لایەنە دەستوریەكەش ئەم سیستەمە چەندین پێناسەی جۆراوجۆری بۆ كراوە و هەریەك لەشارەزایانی ئەم بوارەش بۆچوونی تایبەتی خۆی هەیە دەربارەی . بۆ ئەوەی درێژەی پی نەدەین هەوڵ ئەدەین كە لەچەند پێناسەیەكی گونجاودا كورتی بكەینەوە.

زانای سۆڤیتی (دینیسۆڤ) دەربارەی ئەم سیستەمە دەڵێت "چارەسەرێکی گونجاوە بۆ رێکخستنی دەوڵەت لەسەر بنەڕەتی خواستی جەماوەر، تەنانەت لەو حاڵەتانەشدا کەئارەزووی جیابوونەوە دەرنەبڕن یان توانای ئەوەیان نەبێت تەعبیر لەدامەزراندنی دەوڵەتێکی سەر بەخۆ بکەن" دکتۆر حەمید ئەلساعدی بۆ پێناسەی ئۆتۆنۆمی پێی وایە کە "سیستمێکی لامەرکەزیەو لەسەر بنەرەتی دان نان بەسەربەخۆیی بەشێک لەهەرێمی دەوڵەت دامەزراوە، بەچاودێری و سەرپەرشتی دەوڵەت" واتە ئەو بەشە سەربەخۆیە دەکەوێتەوەوە ژێر چاودێری دەسەلاتی ناوەندیەوە. هەروەها دکتۆر هەمەوەندی دەڵێ "حوکمی زاتی سیستەمێکی لامەرکەزی لەسەر بنەرەتی دان نان بەسەربەخۆیی هەرێمێکی جیاواز لەڕووی نەتەوەیی و رەگەزیەوە دادەمەزرێت لەناوخۆی دەوڵەتێکدا، بۆ بەرێوەبردنی کاروبارەکانی . لەژێر چاودێری و سەرپەرشتی دەسەلاتی ناوەندیدا" . دواجار دکتۆر محەمەد عومەر مەولود بۆ پێناسەی ئەم سیستەمە دەلێت شێوەزایکی پێشکەوتووترە لەلامەرکەزی ئیداری و بەپێی ئەمەش دەوڵەت لەناو یەکێتی یەکی یاسایی و سیاسیدا هەڵدەستێت بەبەخشینی هەندێک دەسەلاتی یاسادانان و کارگێڕی بەنەتەوەیەک یان کۆمەلێکی ئاینی، هاوزمانی یان رۆشنبیری دیاریکراو، بەلام لەژێر چاودێری و سەرپەرشتی دەوڵەتدا".

چەمکی ئۆتۆنۆمی وەک پرۆژەیەکی یاسایی بۆ چارەسەری کێشەی فرەیی لەناو خۆی دەوڵەتێکیدا شتێکی تازەیەو دەگەرێتەوە بۆ سەرەتاکانی سەدەی پێشوو، یەکیتی سۆڤیتی جارانیش لەپێشەنگی دەوڵەتانی دنیایە کەگرنگیەگی زۆری داوە بەدراسە کردنی چەمکی ئۆتۆنۆمی، بەتایبەت

لەسەردەمی لینین و سەرکردەکانی پاش خۆی، ئەمەش وەک بنەڕەتێک بۆ چارەسەری کێشەی ئەو نەتەوانەی کەدەکەوتنە سنوری یەکێتی سۆڤێتەوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئەکرێت ریشەی ئەم سیستمە لەفکری سیاسی پەیوەست بەکاروبارو پەیوندیە نێودەوڵەتیەکان بگێڕینەوە بۆ سەدەیەک پێشتر. واتە سەرەتاکانی سەدەی نۆزدەیەم. لەفکری فەلسەفی و یاسایشدا مێژووەکەی دەگەرێتەوە بۆ سەردەمێکی زۆر لەو کۆنتر . بۆ ئەمەش راستیە مێژوویەکان ئەوەیان سەلماندوە کەزارەوەی ئۆتۆنۆمی لای یۆنان و رۆمانەکان ناسراوەو مەبەستیش لەسەربەخۆیی دەوڵەتێک بووە کە لەرێگەی کۆمەڵێک یاسای تایبەتەوە حوکمی خۆی بکات و دابڕاو بێت لەدەوڵەتیکی تر. واتە سەربەخۆیەکی تەواوی بەرجەستە کردبێت. لەگەڵ ئەمەشدا هەریەکەیان پێوەرێکی جیاوازیان هەبووە بۆ دیاریکردنی ئۆتۆنۆمی. لای یۆنانەکان پێوەرەکە بریتی بووە لەپێوەرێکی ئاینی و ئەدەبی، بەپێچەوانەی رۆمانەکانەوە . کەبریتی بوولە پێوەرێکی یاسایی گشتی و موڵکدارێتی.

## بەراوردێک لە نێوان فیدرالیزم و ئۆتۆنۆمی ی

وەک پێشتریش هێمامان بۆ کرد فیدراڵی و ئۆتۆنۆمی دوو سیستەمی دەستوری و سیاسی ناوخۆین و بەپێی ئەو تایبەتمەندیانەی کەهەر یەکەشیان هەیانە چەندین لایەنی چوون یەک و جیاوازیان لەنێواندایە، بەڵام بەگشتی فیدراڵی سیستەمێکی پێشکەوتوو ترو فراوانترە لە ئۆتۆنۆمی. لێرەشدا بۆ ئەوەی بەراوردێکی زانستیانە بکەین. پێویستە هەردوو لایەنی لەیەکچوون و جیاوازیان بەڕوونی دەستنیشان بکەین، بۆ

ئەمەش هەریەکە لەو دوو لایەنە لەبەشێکی تایبەتدا باس دەکەین بەم جۆرەی لای خوارەوە:-

**یەکەم: لایەنی لەیەکچوون لەنێوانیاندا.**

ئەم لایەنەش لەچوارخاڵی سەرەکیدا کۆدەکەینەوە کەبریتین لە (بنەرەتی فکرەی سیاسی، دابەش بوونی دەسەڵاتە دەستوریەکان بەسەریاندا، چۆنیەتی پێکهاتنیان لەڕووی دەستوریەوە، تایبەتمەندی هەرێمی ) و پاشان بەڕونی شیان دەکەینەوە.

**دووەم: لایەنی جیاوازی لەنێوانیاندا.**

بەهەمان شێوە ئەم لایەنەش خاڵبەندی دەکەین لە حەوت خاڵی سەرەکیدا کۆیان دەکەینەوە. ئەوانیش بریتین لە ( سروشتی ئەو سەر بەخۆیی یەی کە هەیانە، پێکهاتەی ئەو دەوڵەتانەی کە هەر یەکە لەم سیستەمانە پەیڕەو دەکات، لەڕووی یاسادانانەوە، چۆنێتی پێکهاتنی هەر دوو سیستەمەکە، پابەندبوونی ئەم سیستەمانە بۆ چاودێری دەسەڵاتی ناوەندی، بەشداری کردن لەدەرکردنی ئەو بڕیارانەی کەپەیوەستن بەبوارە گشتیەکانەوە، لەڕووی دەسەڵاتی دادوەریەوە) و پاشان ئەمانیش رون دەکەینەوە.

## یەكەم: لایەنی لەیەكچوون لەنێوانیاندا

### ١-بنەڕەتی فكرەی سیاسی.

ئەگەر سەرنج بدەینە هەر دوو سیستمەكە ( فیدراڵی و ئۆتۆنۆمی ) ئەوا بەڕوونی ئەوەمان بۆ دەردەكەوێت كە هەر دووكیان لەسەر دوو بنەرەتی تەواو لەیەكتر جیاواز پێكهاتوون . ئەوانیش بریتین لەسەربەخۆی زاتی و یەكێتی. ئەم دوو بنەڕەتە جیاوازەش لەڕێگەی پەیوەست بوونیان بەیەكترەوە مانای راستەقینەی هەر یەكە لەو سیستەمانە دیاری دەكەن، لەمەشەوە ئەوەمان لاڕون دەبێتەوە كە لەیەك كاتدا هەم ئارەزوومەندی هەیە بۆمانەوەی دەوڵەتێكی یەک پارچەو خاوەن سەروەری، هەم ئارەزوومەندی هەیە بۆ پارێزگاری كردن لەسەربەخۆیی هەرێمێكی دیاریكراو. لێرەشەوە ئەوە بەتەواوی رون دەبێتەوە كە بۆبەرجەستەكردنی هەریەكە لەم سیستەمە سیاسیانە پێویستە هەستێكی ئارەزوومەندانەی دوو لایەنە هەبێت لەلایەن خەڵكیەوە. بۆ ئەمەش ( دایسی) كەشارەزایەكی بواری سیستمە سیاسی یەكانەپێی وایە كەبۆ دامەزراندنی یان پێكهێنانی سیستمی فیدراڵی پێویستە هەستێكی یەكگرتوو هەبێت لەلایەن خەڵكەوە بەرامبەر بەیەكێتی و دواجاریش هەر ئەو هەستانەیە كەدەبێتە هۆی دامەزراندنی دەوڵەتێكی فیدراڵی، هەروەها ئامانج لەفیدراڵی لەڕوانگەی دایسیەوە بریتییە لە ڕەخساندنی دەرفەت بۆ دەربڕینی هەر دوو هەستی یەكیتی نیشتمانی و سەر بەخۆیی هەرێمی، كەواتە سیستمی فیدراڵی سیاسیەن كار دەكات بۆ گونجاندن لەنێوان یەكێتی نیشتمانی و مانەوەی مافی سەربەخۆیی بۆ ولایەتەكانی ناوی. ئەمە بۆ ئۆتۆنۆمیش هەر بەهەمان شێوەیە، بەتایبەت لەكاتێكدا كەدەبینین ئەوەی پاڵ بەدەوڵەتێكەوە

دەنێت بۆ ئەوەی ئۆتۆنۆمی پەیڕەو بکات بریتیە لە گونجاندن لە نێوان ئارەزووی یەکپارچەیی و هەستی سەربەخۆیی خوازی لەناو کۆمەڵە ئاینی و رەگەزی و نەتەوەیی و........ هتدەکاندا، بەدڵنیایشەوە ئەتوانین بڵێین کەحیکمەتی بوونی ئەم جۆرە سیستمانە گونجاندنە لەنێوان ئەو بەرژەوەندیە جیاوازانەدا، یان بەجۆریکی تر دەکری بلێین ئەوەی رۆلی سەرەکی دەگێریت لە پێکهێنانی ئەم جۆرە سیستمانەدا بریتیە لەناوەرۆکی سیاسی فکرەی سەربەخۆیی و فکرەی یەک پارچەی وڵات، بۆ زیاتر ڕوون کردنەوەی ئەم دوو فکرە جیاوازەش هەوڵ ئەدەین بەکورتی لەسەر هەریەکەیان بدوێین.

**أ-فكرەی سەربەخۆيی** :-

ناوەرۆکی ئەم فکرەیە لەوەوە سەر هەڵئەدات کەنەتەوەکان یان کۆمەڵە ئاینی و رەگەزی و....... هتدەکان گەشەیەکی کۆمەلایەتی باشیان کردووە و هۆشیاری سیاسیشیان لە ئاستێکی باشدایە، رەنگدانەوەی ئەم گەشە کردنانەش خۆی لەخەبات و هەوڵی ئەو کۆمەڵە جیاوازانەدا دەبینێتەوە بۆ بەدەستهێنانی سەربەخۆیی هەر ئەمەشە بۆتە هۆی ئەوەی کەزۆربەی ئەو دەوڵەتانەی کێشەی فرییەن هەیە هەولیان داوە لەرێگەی ئەم جۆرە سیستمانەوە چارەسەری بکەن، کەجۆرە سەربەخۆیی یەک دەبەخشنە ئەو هەرێمە یان ئەو کۆمەڵە جیاوازانە. بۆ نمونە لەسیستەمی ئۆتۆنۆمیدا ، ناوچەی ئۆتۆنۆمی جۆرە سەربەخۆییەکی پێ دەبەخشرێت لەبواری (یاسادانان، کارگێری، دارایی). ئەم سەربەخۆیی یەش روکنیکی سەرەکیی سیستمەی ئۆتۆنۆمییە.

**ب- فکرەی یەکپارچەیی:-**

جـەوهـەری سیاسـی ئـەم فکرەیـەش لـەدوو بـواری سـەرەکیـدا دەردەکەوێ، یەکەمیان دەردەکییە و خۆی لەو هەرەشانەدا دەبینیتەوە کە لەلایەن وڵاتانی ترەوە دەکرێتە سەری ، دووەمیشیان ناوخۆیی یەو بریتی یە لەمەترسی دروست بوون و سەرهەڵدانی بزوتنەوەی سەربازی و ئازادی خواز لەلایەن کۆمەڵەیەکی دیاریکراوەوە. بۆ رووبەرووبونەوەی ئـەم مەترسـیانەش سـوود لـەهـەر دوو سیسـتمی فیـدراڵی و ئۆتۆنـۆمی وەرگیـراوە ، ئـەم راسـتیەش بـەو وتـە بـەنرخـە سـەلمێنـراوە کـەدەڵـی هێـز لەیەکێتی دایە . هەر بنەڕەتی ئەم فکرەیەش وای لەهەر سێ بیرمەندی سیاسی ئەمریکی (جیمس مادیسون، الکسندر هاملتۆن، جانجی) کردووە کە لەنامەکانیاندا بۆ دانیشتوانی ویلایەتی نیۆیۆرک بانگەشە بۆ پێکهێنانی یەکێتیەکی بەهێزی ئەمریکی بکەن لە چوارچێوەی فیدراڵیزمدا.

**٢- دابەش بوونی دەسەڵاتە دەستوریەکان بەسەریاندا.**

لەو وڵاتاندا کە سیستمەکانیان سیستمێکی سیاسی تێکەڵ و ئاوێتەیە واتە پەیڕەوی فیدراڵی یان ئۆتۆنۆمی دەکەن داموودەزگا دەستوریەکانیان بەوە دەناسرێتەوە کەفرە جۆرن یان بەشێوەیەکن کەدەتوانین بڵێین کەدەسەڵاتە دەستوریەکان لەم وڵاتانەدا دابەش بوون بەسەر چەند دەزگایەکی دەستوریدا، ئەمەش لەوەوە سەرچاوە دەگرێت کەدەسەڵاتەکان لەنێوان حکومەتەی ناوەندی و حکومەتە هەرێمیەکاندا بەپێی دەقی دەستوری دابەش دەکرێت بۆ نمونە هەرچی پەیوەندی بەکاروباری گشتی دەوڵەتەوە هەبێ وەک کاروباری سەربازی ، دەرکردنی پارە، رێکخستنی پەیوەندی دەرەکی لەپەیماننامەو رێکەوتننامە نێودەوڵەتیەکان و...... هتد

دەچنــە چوارچێــوەی دەســەڵاتەکــانی حکومــەتــی نــاوەندیــەوە، ئــەوەشــی پەیوەندی بەکاروباری ناوچەکانی ئۆتۆنۆمی یان فیدراڵیەوە هەیە دەچنە ژێــر دەســەڵاتی دەزگــا دەســتوریەکــانی ئــەو ناوچانــەوە، بــەمــەرجێــک پێچەوانــەی دەسـتوری بنەڕەتـی نـەبن، لـەم ڕووەشـەوە دکتـۆر محـەمـەد عومـەر مـەولـود دەڵێ فیدراڵی لەگەڵ حـوکمی زاتـی (ئۆتـۆنۆمی)دا لـەوەدا یەک دەگرنەوە کەچوارچێوەی هەر یەکەیان دیاریکراوە لەمەجالی یاسایی ناوەخۆی دا ناچێتە سەر مەجالی دەرەکی و نێودەولەتی یان بەجۆریکی تر ڕەنگدانــەوەیــان کــورت دەکرێتــەوە لــە مــەجــالی دەســەڵاتی نــاوەخــۆیی دەوڵەتەوە درێژ نابێتەوە بۆ دەسەڵاتی دەرەکی

**٣- چۆنیەتیی پێکهاتنیان لەڕووی دەستوریەوە.**

هەڵبــەت ئەگــەر لایــەنــە ئاســاییەکــەی پێکهــاتنی هــەر یــەکــە لــەم دوو سیستەمە وەربگیرێت ئـەوا جیاوازن لەیـەکتر، کە پاشـان بـەڕوونی باسـی دەکـەین ، بـەڵام لـە ڕووی دەسـتوریەوە هـەریـەکـە لـەم سیسـتمانەبـەپێ ی دەستورێکی ناوەخۆی پێکدێت، واتە بنەرەتی پێکهاتنی فیدراڵی و ئۆتۆنۆمی دەگـەڕێتـەوە بـۆ ئـەو دەقـە یاسـاییانەی کـە لـە دەسـتوری بـاڵای وڵاتـدا دەسنیشـان کـراوەن. ئـەمـەش تـەواو پێچـەوانـەی ئـەو بنـەڕەتـە یاسـاییانەیە کەیەکێتی یـەکی نێودەولـەتی یان حـوکمی زاتـی بـەمانا نێودەوڵـەتیـەکـەی لەسـەر دامەزرێنراوە، چونکە پێکهێنانی ئەمانە دەگەڕێتـەوە بۆ بەڵگـەنامـە و ڕێکــەوتننامــە نێــودەولــەتیــەکان،دواجــاریش ئــەوەمــان لاڕوون دەبێتــەوە کەهەریەکە لـەسیسـتمی فیدراڵی و ئۆتۆنـۆمی شـەرعیـەت و هێزی یاسـایی خۆیان لەدەستورەوە وەردەگرن.

**٤-تايبەتمەندی ئیقلیمی.**

هەر کاتێک لەدەستوری وڵاتێکدا بڕیار لەسەر پیادەکردنی هەر یەک لەم سیستمانە درا ، بەهەمان شێوەش سنوری دەسەڵاتی بۆدیاری دەکرێت یان ڕوونتر سنوری جوگرافی ئەو دەسەڵاتە (فیدراڵی یان – ئۆتۆنۆمی) یە دەستنیشان دەکرێت، واتە بەپێی دەستوری باڵا بەشێک لەدەسەڵاتی حکومەتی ناوەندی ئەسپێردرێت بەدەسەڵاتێکی هەرێمی لەچوارچێوەی سنورێکی جوگرافی دیاریکراودا. ئەم حاڵەتەش هۆکاری تایبەتی خۆی لەپشتەوەیە، بۆ نمونە Mchenry و Ferguson جەخت لەسەر ئەوە دەکەنەوە کە بەهۆی کاریگەریی دابڕانی جوگرافی و جیاوازی زمان و ئاین و ئەسڵی.......ڕەگەزی هەرێمەکانەوە لەسویسرادا سیستمی فیدراڵی پیادە کرا. دکتۆر محەمەد عومەر ومەولودیش لەم بارەیەوە پێ ی وایە کەبوونی پارچەیەکی جوگرافیی دیاریکراو یان هەرێمێکی دیاریکراو ، مەرجێکی پێویستە بۆ دامەزراندنی فیدراڵی یان ئۆتۆنۆمی.

**دووەم:لایەنی جیاوازی لەنێوانیاندا**

**١-سروشتی ئەو سەربەخۆیی یەی کەهەیانە.**

هەروەک پێشتریش ئاماژەمان بۆ کرد یەکێک لەو دوو بنەما سەرەکیەی کە هەردوو سیستەمەکەی لەسەر دادەمەزرێت سەر بەخۆیی یە، بەڵام ئەوەی شایانی باسە ئەوەیە، کە سروشتی ئەم سەر بەخۆیی یە لەهەر یەکەیاندا بەجۆرێکە. بۆ نموونە ئەو سەر بەخۆیی یەی کە لەچوارچێوەی یەکێتی فیدراڵیدا دەبەخشرێتە ئەندامەکانی پانتایی یەکی فراوانی هەیە، واتە حکومەتی دەوڵەتە ئەندامەکانی ناو یەکێتی یە

فیدراڵیەکە مومارەسەی ئاسایی دەسەڵاتەکانی خۆیان دەکەن، بێ ئەوەی چاودێریەکی ناوەندیان لەسەر بێت. رادەی ئەم سەربەخۆیی یەش لەدەوڵەتێکی فیدراڵەوە بۆ یەکێکی تر چوون یەک نیە، بۆ نموونە سەربەخۆیی ولایەتەکانی ئەمریکا سەربەخۆیی یەکی زۆر فراوانە، ئەمەش بەڕوونی لەدەقی دەستوری ساڵی ١٧١٩ی دەسکاریکراودا هاتووە و دەڵێ" ئەو دەسەڵاتانەی کە دەستور نەیبەخشیوەتە ولاتە یەکگرتووەکان (حکومەتی ناوەندی) یان ڕێگری لێ نەکردووە بۆ ولایەتەکان، پارێزراو دەبێت بۆ ولایەتەکان و گەل" ئەمەش ئەوە ڕوون دەکاتەوە کە دەستوری ئەمریکی دەسەڵاتەکانی حکومەتی ناوەندی دیاریکردووە و ئەوەی ماوەتەوە بەخشیویەتی بەدەسەڵاتی ولایەتەکان، بەمەرجێک بەدەقێکی یاسایی قەدەغە نەکرابێت. ئەمە تەواو پێچەوانەی سروشتی ئەو سەربەخۆیی یەیە کە لەئۆتۆنۆمیدا هەیە چونکە بنەمای پەیوەندی دەسەڵاتی ناوەندی و ئۆتۆنۆمی بریتی یە لەسەرپەرشتی و چاودێری کردنی راستەوخۆ، بۆیە دەکرێت بڵێین ئاستی سەربەخۆیی لەم سیستەمەدا تاڕادەیەکی زۆر سنوردار کراوە و بەڵگەشی بۆ ئەم راستیە ئەوەیە کە دەسەڵاتی ناوەندی توانای هەیە هەندێک لەئەندامانی دەزگاکانی ناوچەی ئۆتۆنۆمی دابمەزرێنێ و نوێنەری تایبەت بنێرێت بۆ ئەو ناوچانە دڵنیابوون لەهاوتەریبی کارو چالاکی هەردوو دەسەڵات، هەروەها زۆربەی حکومەتە ناوەندیەکان ئەو مافەیان داوە بەخۆیان کە هەرکاتێک پێویست بکات دەزگاکانی ناوچەی ئۆتۆنۆمی هەڵبوەشێنێتەوە. بۆ ئەمەش مادە (١٢٦)ی دەستووری ئیتاڵی دەڵێ مافی دەسەڵاتی ناوەندیە کەئەنجومەنی هەرێمەکان هەڵوەشێنێتەوە، ئەگەر هەستان بەکارێک، بوە مایەی تێکدانی دەستوری کۆماریی ئیتاڵیا".

**٢- پێكهاتەی ئەو دەوڵەتانەی كە هەریەكە لەم سیستمانە پەیڕەو دەكات.**

وەک لەسەرەتای باسەكەدا ئاماژەیەكی كورتمان بۆ كرد، دەوڵەتانی دنیا لەڕووی پێكهاتەیانەوە دابەش بوون بۆ دوو جۆری سەرەكی ئەوانیش بریتین لەدەوڵەتی ئاوێتە یان یەكگرتوو لەگەڵ دەوڵەتی ساكار یان ئاسایی. هەریەكە لەو سیستمانەی كە ئێمەش باسی لێ دەكەین دەكەوێتە چوارچێوەی یەكێک لەو دوو جۆرە، بێگومان پێشتریش ئەوەمان لاڕوون بۆتەوە كە فیدراڵی دەكەوێتە چوارچێوەی دەوڵەتی ئاوێتەوە و زۆربەی كاتیش بەیەكێتی فیدارڵی ناوبراوە، وەک فدراسیۆنی سویسری و فدراسیۆنی ئەڵمانیا، بەپێچەوانەشەوە سیستمی ئۆتۆنۆمی دەكەوێتە ژێر سایەی جۆری دووەمەوە. وەک ئەوەی لە ئیتالیا و زۆر وڵاتی تردا هەیە.

**٣- لەڕووی یاسادانانەوە.**

ئەمیش خاڵێكی جەوهەری و گرنگە كە هەردوو سیستەمەكە لەیەكتر جیادەكاتەوە، چونكە ئەو دەوڵەتانەی كە هەریەک لەم سیستمانە پەیڕەو دەكەن لە پێكهێنان و دامەزراندنی دەسەڵاتی یاسادانانەدا شێوازێكی جیاواز لەوی تر پەیڕەو دەكەن، ئەمەش هۆی تایبەتی خۆی هەیە. بۆ نموونە دابەش بوونی دەسەڵاتی یاسادانان بۆ دوو ئەنجومەن ئەنجامێكی سروشتیە بۆ حكومەتێكی فیدراڵی، چونكە لەم سیستەمەدا بەئاسانی ئەوەمان بۆ دەردەكەوێت كە ڕەچاوی بیروباوەڕی یەكسانی كراوە لەنێوان نەتەوە و هەرێمە جیاوازەكاندا. ئەمەش بێگومان ڕەنگدانەوەی خۆی دەبێت لەسەر داموو دەزگا جیاجیاكانی فیدراڵی هەر لەبەر ئەمەشە كە دەبینین هەمیشە پەرلەمانی فیدراڵی دابەش بوون بۆ دوو ئەنجومەن. وێنەی ئەم شێوازەش لەپەرلەمانی ئەمریكی یە كە پێكهاتووە لە ئەنجومەنی پیران و

ئەنجومەنی نوێنەران. بەڵام لەو دەوڵەتانەی کە ئۆتۆنۆمی پەیڕەو دەکەن دەسەڵاتی یاسادانانی یەک دەسەڵاتی ناوەندیە و لەیەک ئەنجومەن پێکدێت، کە نوێنەرایەتی تەواوی دانیشتوانی ئەو دەوڵەتە دەکات، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە لەم سیستەمەدا بیروباوەڕی یەکسانی ڕەچاو ناکرێت.

ئەوەی شایانی باسیشە لێرەدا بگوترێت ئەوەیە کە ئەو ئەنجومەنی یاسادانانەی لەناوچەی ئۆتۆنۆمیدا هەیە بەبەشێک دانانرێت لە پەرلەمانی ناوەندی.

**٤- چۆنێتی پێکهاتنی هەردوو سیستەمەکە.**

بەگشتی دەتوانین دوو ڕێگای سەرەکی دەستنیشان بکەین بۆ چۆنێتی دروستبوونی یەکێتی یەکی فیدراڵی ئەوانیش بریتین لە:-

أ- دروستبوونی دەوڵەتی فیدراڵی لەڕێگەی یەکێتی یان یەکگرتنی چەند دەوڵەتێکەوە کە سەربەخۆیی یەکی تەواو و سەروەری تایبەتی خۆیان هەیە. نموونەی ئەو دەوڵەتانەش کە لەم ڕێگەیەوە دروستبوون بریتین لە ولایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، کەنەدا، ئوسترالیا، یەکێتی باشووری ئەفریقیا و زۆری تریش.

ب- دروستبوونی دەوڵەتی فیدراڵی لەئەنجامی لەبەریەک هەڵوەشانی دەوڵەتێکی ساکار و ئاسایی بۆ چەند یەکەیەکی سیاسی یان چەند قەوارەیەکی سەربەخۆ، دیارترین نموونەی ئەم دەوڵەتانەش بریتین لەیەکێتی سۆڤیێتی جاران، بەرازیل، ئەرجەنتین، مەکسیک و ... هتد. بەڵام ئۆتۆنۆمی کاتێک پێکدێت کەدەوڵەتی ناوەندی دان دەنێت بەهەرێمێکی دیاریکراو، تا لەڕێگەی خۆیانەوە حوکمی خۆیان بکەن.

### ٥- پاپەند بوونی ئەم سیستمانە بۆ چاودێری دەسەڵاتی ناوەندی.

ئەم خاڵەش لەلایەنەگرنگەکانی جیاوازی نێوان ئەم دووسیستمەیە، کە لەسەر بنەمای چاودێری دەسەڵاتی ناوەندی دامەزراوە بۆ سەر هەریەکە لەفیدراڵی و ئۆتۆنۆمی. بەپێ ی ئەوەی تائیستا لەفیدراڵی تێگەیشتوین ئەوەمان لارِوونە کەئەندامەکانی یان ولایەتەکانی ناو یەکێتی یەکی فیدراڵی سەربەخۆیی یەکی فراوانتریان هەیە لەو ناوچانەی کە ئۆتۆنۆمیان پێبەخشراوە، بۆ نمونە هەرسێ دەسەڵاتی یاسادانان و جێ بەجێ کردن و دادوەری ئازادن لە چۆنیەتی مومارەسە کردنی دەسەلاتەکانیان، بەمەرجێک پێچەوانەی دەستوری باڵانەبن، ئەم حاڵەتەش واتە دەستنیشان کردنی (پێچەوانەی دەستور)دادگای باڵای فیدراڵی پێ ی هەڵدەستێت، هەر بۆیە دەکرێت ئەوە بڵێین کەچاودێری دەسەڵاتی ناوەندی لەم سیستمەدا لەزۆربەی زۆری حاڵەتەکاندا چاودێریەکی دادوەریی یەو لەلایەن دادگای فیدراڵیەوە مومارەسە دەکرێت، بەڵام ناوچەی ئۆتۆنۆمی ئەو سەربەخۆی یەی کەپێ ی بەخشراوە لەلایەن دەسەڵاتی ناوەندیەوە سەربەخۆیی یەکی سنوردار ودیاریکراو، هەروەها دەسەڵاتی ناوەندی بەجۆرێک پەیوەندیەکانی لەگەڵدا رێکخستووە کە هەرگیز نەتوانێت لە چوارچێوەی دەربچێت، هەر بەوەشەوە نەوەستاوە کەچاودێری کاروباری دەزگاکانی ناوچەی ئۆتۆنۆمی بکات، بەڵکو چاودێری ئەندامەکانیش دەکات و دەشتوانێت دەزگاکان هەڵوەشێنێتەوە.

## ٦- بەشداری کردن لەدەرکردنی ئەو بریارانەی کەپێویستن بە بوارە گشتی یەکانەوە.

لەو وڵاتانەی کە سیستمی فیدراڵی پەیرەو دەکەن ناوچە فیدراڵیەکان جگە لەوەی سەر بەخۆیی یەکی تایبەتیان هەیە لەبڕیاردان لەسەر چارەنوسی خۆیان، لەهەمان کاتدا بەشداری لەگەڵ حکومەتی ناوەندیشدا دەکەن لەدەرکردنی ئەو بڕیارانەی کەپەیوەندیان بەکاروباری سەرجەم دەوڵەتەوە هەیە، ئەمەش لەرێگەی ئەنجومەنی باڵاوە، کەیەکێکە لەو دوو ئەنجومەنەی کەپەرلەمانیان پێکهێناوە، هەر ناوچەیەکی فیدراڵیش . بەیەکسانی لەم ئەنحومەنەدا ژمارەیەک نوێنەری دیاریکراوی هەیە. نمونەی ئەم ئەنجومەنەش ئەنجومەنی پیرانی ئەمریکی یە و لەهەر و لایەتێک بەدوو نوێنەر تیایدا بەشدارە. ئەم بەشداری کردنە چەند لایەنێکی گرینگی تریش لەخۆ دەگرێت وەک بەشداری کردن لەدانانی دەستوری فیدراڵی و دەستکاری کردنی یاسا. بەڵام لەو وڵاتانەی کەئۆتۆنۆمی پەیرەو دەکەن مەسەلەکە تەواو پێچەوانەی فیدراڵیە، چونکە ناوچەکانی ئۆتۆنۆمی بەهیچ جۆرێک بۆیان نیە بەشداری بکەن لەبریاردان لەو کاروبارانەی کە پەیوەندیان بە کاروباری گشتی دەوڵەتەوە هەیە، لەمەشەوە ئەوەمان بۆ ڕوون دەبێتەوە کەحکومەتی ناوەندی کاتێک بیەوێت بڕیارێک دەربکات یان دەستورێکی نوێ دابنێت ، یاخود چاکسازی تیادا ئەنجام بدات، ئەوە یەک لایەنە بڕیاری لەسەر دەدات، بێ ئەوەی دەزگاکانی ناوچەی ئۆتۆنۆمی بتوانن بەشداری تیادا بکەن، هەتا ئەگەر بێت و پەیوەندیان بەو هەرێمانەشەوە هەبێت.

**٧- لەڕووی دەسەڵاتی دادوەریەوە.**

وەک پێشتریش دەستنیشانمان کردووە ڕادەی سەربەخۆیی فیدراڵی فراوانترە لە ئۆتۆنۆمی، بۆ دڵنیابوونیش لەم ڕاستیەی سەرەوە دەبینین لەدەوڵەتە فیدراڵیەکاندا لەگەڵ ئەوەی حکومەتی ناوەندی خاوەنی دەسەڵاتێکی دادوەری باڵایە، لەپاڵ ئەمەشدا هەر یەکە لەهەرێمە فیدراڵیەکان خاوەنی هەمان دەسەڵاتی دادوەری تایبەت بەخۆیانن، واتە لەهەر هەرێمێکی فیدراڵیدا دادگایەکی باڵا هەیە بەڵام ئەم شێوازە لە ئۆتۆنۆمی دا بەهیچ جۆرێک بەدی ناکرێت، واتە دەسەڵاتی دادوەری دەسەڵاتیکی ناوەندیە و دادگا و فەرمانگە دادوەرییەکانی سەر بەناوچەکانی ئۆتۆنۆمی بریتین لەچەند لقێکی پەیوەست بەدەسەڵاتی دادوەری ناوەندی و وەزارەتی داد.

## ماددەی ١٤٠ی دەستوور و ئەرکی سەرکردایەتی سیاسی کورد لەبەرامبەر جێبەجێکردنیدا

لەدوای چەند ساڵێک تێپەڕبوون بەسەر تەمەنی حکومەتی عێراقیدا بەسەرۆکایەتی د.نوری مالیکی تا عەبادی، وەک هەڵسەنگاندن و پێداچونەوەی ئیش و کارەکانی ئەو حکومەتە و ڕێژەی سەرکەوتنی و تاچەندیش دەتوانێت بەردەوام بێت لەبەردەم ئاستەنگ و مەترسی و هەڕەشە و گوشارە ناوەخۆیی و دەرەکیەکاندا، دەکرێت چەند پرسیارێک بکرێت وەک:-

ئایا ئەم حکومەتە تا چەندە توانیویەتی باری ئەمنی و ئاسایشی وولات باشتر بکات و ئاسۆکانی ئەو بوارە چۆنە؟ ئایا حکومەتە بنەمای فیدراڵی چەسپاندوە و تێگەیشتنەکان بۆ ئەو چەمکە لەلایەن پێکهاتە جیاوازەکانی عێراقەوە چۆنە؟ تاچەندە ئەم حکومەتە جدیە لە جێبەجێکردنی مادەی ١٤٠ی دەستوردا؟ هەڵوێست و ئەرکی کورد لەمەڕ هەموو ئەو پرسانە چیە؟ و دەبێت سەرکردایەتی کورد چیبکات لەکاتی بەدینەهاتن و جێبەجێکردنی خواست و ویستەکانی لە چەسپاندنی فیدراڵیەت و جێبەجێنەکردنی مادەی ١٤٠ی دەستوور و هەموو ماددەکانی تر کە پەیوەندیان بە ئایندەی کورد و هەرێمی کوردستانەوە هەیە؟؟؟

فیدرڕاڵیزم لە عێراقی نوێدا تا ئیستا بە تەواوەتی تەچەسپیوەو لە بەڕێوەبردندا کاری پێناکرێت و تێگەیشتنێکی کامڵ و وەک یەکی لەنێوان پێکهاتەکانی عێراقدا نیە دەربارەی سیستەمی فیدرڕالیزم، چونکە شیعە بەجۆرێک لێکی دەداتەوە و سونە بەهەمان شێوە و کورردیش بەشێوازێکی تر . تائێستا هەرێمی تر جگە لە هەرێمی کوردستان دانەمەزراوە کە

فیدراڵیزم بۆ خۆی بریتیە لە دەسەڵاتی هەرێمەکان و چۆنێتی ڕێکخستنی پەیوەندیەکانیان لەگەڵ ناوەندا. هەرێمی کوردستانیش پێشتر و لەساڵی ١٩٩٢وە دامەزرەوە و بۆتە دیفاکتۆو حکومەتی ناوەندی ئێستای عێراق ناتوانێت ڕەتیبکاتەوە، چونکە بەبڕیارێکی پەرلەمانی کوردستان لە ١٩٩٢/١٠/٤ دا بنەمای فیدراڵی قبوڵ کراوە.

تەنیا جێگرەوە بۆ فیدراڵی لە عێراقیی نوێدا ئەگەر نەچەسپی و جێگیرنەکرا ئەوا دابەشبونی عێراقە بەخاک و گەلەکەیەوە بۆ سێ ناوچەی جیاوازی شیعە لە باشورو سونە لە ناوەڕاست و کورد لە باکور، هەروەکو پڕۆژەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستی گەورەی ئەمریکیش پلانی بۆ داڕشتوە، ئەگەر ئەمەش نەبوو بۆ پاراستنی یەگرتوویی خاک و گەلانی عێراق تەنها سیستەمێکی دیکتاتۆری و تاک ڕەوی لەشێوەی سیستمی بەعسی صەدامی دەتوانێت ئەو پێکهاتە عەجیب و غەریبەی عیراق لە چوارچێوەی یەک وڵاتدا بهێڵێتەوە.

ئایندەی پەیوەندیەکانی سونەو شیعە بەرەو خراپتر دەچێت، چونکە مێژووی ململانێی ئەو دوو مەزهەبە بە تایبەتی لەعێراقدا مێژوویەکی خوێناویە. تەنها لەسایەی رژێمی بەعسی صدامی تاک ڕەودا ئەو ململانێە کپ ببوەوە ئەگینا هەرگیز ئەو دوو مەزهەبە تەبانەبون. لەسەرەتای ململاتێی عەلی کوڕی ئەبوتالیبەوە لەگەڵ معاویەدا و لەسەردەمی خەلافەتی ئەمەوی و عەباسی و عوسمانیەکان و ......هتد.

ئەگەر عێراق لە چوارچێوەی سیستەمێکی فیدراڵیدا مایەوە ئەوا کورد ناچارە بەشداری لەدام و دەزگاحکومیەکانی مەرکەزدا بکات، بەو پییەش ئەرک و مافی دەبێت لەو کاتەدا دەبێت ڕۆڵی ئاشتی و تەبایی

ببینێت ، بەڵام ئەگەر عێراق وا نەمایەوە ئەوا کورد پێویستە دووره پەرێزی هەڵبژێرێت کە ئەمەشیان کارێکی سانانیە بەپەرەچاوکردنی بونی کوردی شیعە و سونە، هەروا وڵاتانی دراوسێ ئێرانی شیعە و تورکیای سونە و عەرەبی سونە.

مادەی ١٤٠ ئەگەرچی کامڵ نیە و تەواوی خواست و مافەکانی کوردی نەسەلماندوە، بەڵام مادەیەکی دەستوریە و نزیکەی ٨ ملیۆن عێراقی دەنگی بۆداوە و شەرعیەت و بنەمایەکی یاسایی و دەستوری و جەماوەریشی هەیە، و بۆیە دەکرێت پشتی پێ ببەسترێت و کاری جدیش بکرێت بۆ چەسپاندنی لە وادەی دیاریکراوی خۆیدا، چونکە کورد جگە لەشەرعیەت و یاسا و دەستور هیچ دەسەڵات و هێزێکی تری نیە بۆ گەڕانەوەی کەرکوک و شوێنەکانی تر بۆ سەر کوردستان.

جێبەجێ نەکردنی مادەی ١٤٠ ڕەوشی عێراق بەرەو خراپتر و ئاڵۆزتر دەبات چونکە لەوکاتەدا کوردیش دەبێتە هۆکارێکی ئاڵۆزی و فشار و نانەوەی سەریەشە بۆ حکومەتی عێراقی و ئەمریکاش ، بەمەش هێندەی تر پرۆسەی سیاسی عێراق ئاڵۆزتر دەبێ و لەوانەشە دەستوەردانە ناوخۆی عێراق لەلایەن ووڵاتانی دراوسێوە لە تورکیا و ئێران و عەرەبە سونەکانیش ڕوودبدات.

تائیستا ئەمریکا نەک لە کەرکوک لە هەموو عێراقدا ڕۆڵی داگیرکەر و چاودێری دەبینێت و لە بەرژەوەندی خۆیەوە ئیدارەی ململانێکان دەدات و دۆست و دوژمنی تاسەری نیە لە عێراقدا و بەرنامە و پلانی خۆی جێبەجێ دەکات.

کــورد وەک گوتمــان تــەنها ڕێگــەچارەی ئاشــتی و دایــەلۆگ و شەرعیەت و دەستور و یاسای لە بەردەمدایە، چونکە هێزو تواناو چەک و تەقەمـەنی هێنـدەی نیـە کـە دژ بەسـوپای عێـراق و ئـەمریکا بوەسـتێتەوە، بەهەمان شێوە ناتوانێت بەرەنگاری  سوپای تورکیا و ئێرانیش ببێتەوە.

دەکرێـت کـورد ببێتـە مایـەی سەرئێشـەو ئـاژاوە نانـەوە، بـەڵام بـۆی ناچێتە سەر و ناتوانێت بـەو شـێوازە خواستەکانی بهێنێتـە دی، بۆیـە تـەنها دەبێت لەڕێگەی:-

١. گوشــار و کــاری سیاســی و دیپلۆماســی لەســەر ئاســتی نــاوخۆی کوردستان و جەماوەر بەپەلـەی یەکـەم و دواتـر لەسـەر ئاسـتی سیاسـی و جەماوەری و نەتـەوەیی و مەزهـەبی لـە عێراقدا کار بکات . بـۆ تێگەیشـتن لەڕاستیە مێژوویەکان و مافی کورد لەو ناوچانەدا

٢.دواتـر بەهـەمان شـێوە وڵاتـانی تورکیـا و ئێـران و عـەرەبی و سـونەش لەو ڕاستیانە تێبگەیەنێت.

٣. دواتـریش وڵاتـانی یـەکێتی ئـەوروپا و زلهێزەکـانی دونیـا لـە ڕوسـیا و چین و ئینگلیز و ئەمریکا و نەتەوەیەکگرتوەکان.

٤.دواتـر هەڵمـەتی کـاری ( عصـیانی مـەدەنی) و خۆپیشـاندان و نـاڕەزایی لەسەر ئاستی جەماوەر و ڕای گشتی و میدیاکان ڕابگەیەنێت.

٥.هـەروەها وەک گوشـار خسـتنە سـەر دەسـەڵاتی ناوەنـدی لـە بەغـداد لـە سەرۆکایەتی کۆمار و پەرلەمان حکومەتدا کاری خۆی هەڵپەسێرێت.

٦.دواتر و لە قۆناغێکی باڵاتردا کێشەکە بخاتە بەردەم نەتەوەیەکگرتوەکان و دادگـای بـاڵای نەتـەوە یـەکگرتوەکان لـەلاهای بـۆ یـەکلای کردنـەوەی کێشەکە.

بـەڵام پێشـتر دەبێـت سـەرکردایەتی سیاسـی کـورد لەسـەر ئاسـتی حیزبـە سیاسـیەکان و رێکخـراوە پیشـەیی و جـەماوەری و مەدەنیـەکان تادەگاتە ئاستی جەماوەر و ڕای گشتی و هێزی(پ.م) ساز و ئامادەبکات بۆ هەموو ئەگەرەکان و وەک دەڵێن: "بەرەو ناوخۆ بەهێز و پتەو و تۆکمە و یـــەکگرتوو بکـــات". ئەوســـا هەڕەشـــە و فشـــاری جـــەنگ و رووبەرووبونـەوەبکات، چونکە بـەم حاڵەتـەی ئێسـتاوە پێشـبینی ناکەم کە هەموو ئاستەکانی ئامادەبن بۆ ئـەو ڕۆژە تەنگانەیە، چونکە سـەرکردایەتی سیاســی کــورد و حکومــەت هێنــدە بەتــەنگ داخــوازی و داواکــاری جەماوەرەوە نەهاتوون و نەکردنی کاری خزمەتگوزاریەکان بونەتە مایەی بێــزاری و تــورەیی جــەماوەری گەلەکــەمان و وێنەیــەکی گــەش و خۆشەویسـتیان لای جـەماوەر نیـە و دەسـەڵاتێکی گەنـدەڵ و خراپیـان پێشکەشکردووە، کە ئەمەش خاڵی گەورەی لاوازی سـەرکردایەتی سیاسـی کوردە.

## ماددەی ١٤٠ی دەستـوور لەكاتی دیاریكراوی خۆیدا جێبەجێ ناكرێت

هەر لەسەردەمی دامەزراندنی ئەنجومەنی حوكمەوە لەدوای ڕوخانی ڕژێمـــی بـــەعس و ڕزگـــاركردنی عێـــراق لەلایـــەن ئـــەمریكاوە و هاوپەیمانەكانەوە لە ساڵی ٢٠٠٣ دا و نوسیەنەوەی یاسای كاتی ئیدارەی دەوڵـــەتی عێراقـــی و بەرجەســـتەكردنی مـــادەی ٥٨ كـــە تایبـــەت بـــوو بەچارەنوســی شــاری كــەركوك و ئــەو جێگەیانــەی كێشــەیان لەســەرە و تانوسینەوەی دەستوری هەمیشـەیی عێراق و دەنگدانی گـەلانی عێراق بـە نزیكـەی ٨ ملیـۆن كـەس لەسـاڵی ٢٠٠٥دا و چەسـپاندنی مـادەی ١٤٠ ی دەستوور كە بەهەمان شێوەی مادەی ٥٨ تایبەتكرا بە چارەنوسی شاری كـەركوك و جێگـەكانی تـرەوە. زۆری لەســەر وتــراوە و زۆری لەســەر نوسراوە لە ڕاگەیاندنەكانی هـەموو لایەنەكانـەوە هـەر((لـەكورد و عـەرب و توركومـان و مەسـیحی و یەزیـدی و سـونە و شـیعەو.......هتـد. لـەناوەوەی عێراق و لەدەرەوەشی لەلایەن توركیا و ئێران و سوریا و وڵاتانی سونەی عەرەب و ئەمریكا و بەریتانیاش و......هتد)).

هەریەكــە بەمــەرامی تایبــەتی و لــەتێروانین و بەرژەوەندیــەكانی خۆیەوە شەن و كەوی بابەتەكەیان دەكرد و چارەنوسی مادەكەیان ڕەنگ دەكێشا. بەو پێیەی ئەم ماددەیە ماددەیەكی دەستوریە و نزیكەی ٨ ملیۆن كـەس دەنگـی بـۆداوە، شـەرعیەتێكی یاسـای و جـەماوەری لـەناوخۆ و دەرەوەی عێراقیشـدا پەیـداكردوە و هـیچ كـەس و لایـەنێك ناتوانێت بـەبێ گەڕانەوە بۆ گەل دەستكاری و گۆڕانكاری تیادا بكات.

لـەناو هەموانیشـدا كـورد زۆر بەسـەر ئـەم مادەیـەدا هـەڵی داوە و بەمادەیەكی زۆر گرینگ و زێدە بایەخ لەقەڵەمی داوە و لـەماوەی ئەو ١٥

ساڵەدا ڕای گشتی کوردی هێناوەتە سەر ئەو باوەڕەی کە ئەم مادەیە چارەنوسسازە بۆ کورد و بۆ کەرکوکیش و جەختی دەکردەوە کە دەبێت جێبەجێکرێت لەماوەی دیاریکراوەی خۆیدا تا ٢٠٠٧/١٢/٣١بەهەرسێ قۆناغەکانی((ئاسایی کردنەوە و سەرژمێری کردن و دەنگدان لەسەر چارەنوسی کەرکوک)) و جێگەکانی ترو هەموو هیواو ئاواتێکی لەسەر ئەم مادەیە هەڵچنیوە بۆ گەڕانەوەی کەرکوک و جێگەکانی تر بۆ سەر هەرێمی کوردستان.

ئەم مادەیە هێندەی گرنگیەکەی بۆ کورد لە کاتی جێبەجێکردنیدا، هێندەش زیانی دەگەیاندە عەرەب و تورکومان و وولاتانی دراوسێ بەتێڕوانینی تایبەتی خۆیان کە هەڵقولاوی بەرژەوەندیەکانیانە، هەر بۆیەش سەرجەمیان بەعەرەبی سونە و شیعە و توروکمان و هەندێجاریش مەسیحی و یەزیدیەکانیشەوە بەهێندەی حەزی کورد بۆ جێبەجێکردنی ئەوان هەوڵی پەکخستنی و جێبەجێکردنیان داوە و گەلێک ڕێگری و بەربەستیان بۆ دروستکردووە لەو ڕێگریانە:-

١. دواخستنی پێکهێنانی لیژنەی باڵای جێبەجێکردنی مادەکە.
٢. دواخستنی دیاریکردن و پێدانی بودجەی مادەکە.
٣. ڕێگرتن لە کردنەوەی ئۆفیس و کارە ئیداریەکانی لەشارەکاندا.
٤. ناکۆکی دروستکردن لەسەر ژمارە و نوێنەرانی نەتەوەو مەزهەبە جیاوازەکان لە لیژنەکەدا.
٥. دەرکردنی هەندێ بڕیار لەلایەن وەزارەتی ناوخۆی عێراقەوە بۆ ڕێگەگرتن لەگەڕانەوەی هاوردە و ئاوارەکان.

٦. دواتر گوشار خستنە سەر سەرۆکی لیژنە باڵاکە (وەزیری داداهاشم شبلی))بۆ دەست لەکارکێشانەوەی بۆ ئەوەی پەکی ئیشوکاری لیژنەکە بخەن.

٧. دواخستنی دەرکردنی هەندێ بڕیار کە لەلایەن لیژنە باڵاکەوە دەرچووبوو بۆ قۆناغی ئاسایکردنەوەی مادەکە دەبوو تا ٢٠٠٧/٣/١٥ جێبەجێبکرایە لەلایەن ئەنجومەنی وەزیرانی عێراقەوە.

لەدەرەوەی عێراقیشدا، وڵاتانی دراوسێ بەتایبەت تورکیا و ئێران و وولاتانی سونەی عەرەبی ناوچەکە و تەنانەت ئەمریکاو بەریتانیاش ڕێگری زۆریان دروست دەکرد بۆ جێبەجێنەکردنی مادەکە لەکاتی خۆیدا. لە ڕێگریاندا:-

١.تورکیا لەڕێگەی گوشار و فشاری سەربازی ئابوری بۆ سەردەوڵەتی عێراق و بۆ سەر کورد بەبیانوی پەکەکە و پاراستنی تورکمان و کەرکوکەوە.

٢. ئێران لە ڕێگەی حیزبە ئیسلامیە شیعەکانی سەر بەخۆیەوە و بەتایبەتیش توندڕەوەکانیان وەک ڕەوتی صەدر بۆ ڕێگەگرتن لە گەڕانەوەی هاوردە و ئاوارەکان.

٣.وڵاتانی عەرەبی سونە بەپێدانی بەرتیل بە کورد بۆ ئەوەی جێبەجێکردنی مادەکە ١٠-١٥ ساڵی تر دوابخرێت.

٤.ئەمریکا و بەریتانیاش، هەوڵی جدیان نەداوە و گوشار و فشاریان بەکارنەهێناوە بۆ جێبەجێکردنی مادەکە لەکاتی خۆیدا، وەک ئیستا بەبەردەوامی گوشارەکانیان خستۆتە سەر سەرۆک کۆمار و سەرۆک

وەزیــران و هــەموو کوتلــە سیاســیەکان و پەرلــەمانیش بــۆ ئــەوەی بــە زووتــرین کــات یاســای نــەوت و گــازی سروشــتی پەســەند بکــەن چونکــە لەبەرژەوەندی خۆیانە.

٥.ڕاسپاردەکانی لیژنـەی بیکـەر – هـاملتۆن کـە نوێنـەری هـەردوو حیزبـی کۆماری و دیموکراتخوازەکان بوون بە جێبەجێنەکردنی مادەی١٤٠ لـەکاتی خۆیـدا، چونکـە ئاشـکرایان کـردووە کـە شـاری کـەرکوک وەک بـەرمیلێک بارود وایە و لەکاتی  جێبەجێکردنی مادەکە دەتەقێتەوە.

٦. ڕاگەیاندنی نوێنەری هەمیشەیی ئەمریکا لەنەتەوە یەکگرتوەکان ((زاڵمای خـەلیلزاد)) کۆنـە سـەفیری ئـەمریکا لـەعێراق بـۆ ئـەوەی مـادەی ١٤٠ بباتـە نەتـەوە یەکگرتوەکانـەوە وبیکاتـە کێشـەیەکی دەرەکـی و دووری بخاتـەوە لەکێشـەیەکی نـاوخۆیی عێـراق و هێـز و شـەرعیەتی دەسـتوریەکەی کـەم بکاتەوە.

١.دواخستنی دیاریکردنی سەرۆکێکی نوێ بۆ لیژنـەی بـاڵای جێبـەجێکردنی مادەکە لە دوای دەست لەکارکێشانەوەی سەرۆکی پێشووی لیژنەکە.

٢.تەواو بوونی وادەی هـەردوو قۆنـاغی ئاسـایکردنەوە و سـەرژمێریکردنی مادەکە کەدەبوایە تا ٢٠٠٧/٧/١٥ جێبەجێکرانایە.

٣. پوچەڵکردنـەوەی پرۆسـەی سـەرژمێری گشـتی دەسـاڵەی عێراقـی کـە بڕیـارواببوو لـە ٢٠٠٧/١٠/١٧دا جێبـەجێ بکرایـە، کەئـەم پرۆسـەیە زۆرر گرنگ بوو بۆ جێبەجێکردنی مادەی ١٤٠.

٤.بانگکردنی سەرۆک تاڵەبانی بۆ ئـەمریکا و ووتـوێژکردن لەگـەڵ سـەرۆک بـارزانی، گـەرچی بەئاشـکرا بـاس لـەو بابەتـە ناکـەن، بـەلام پێـدەچێت

گوشارەکان بەرەو ئاڕاستەی دواخستنی ماددەکە لەسەریان قورستر بوبێت.

٥.درکاندنی هەندێ لێدوان لەلایەن سەرۆک وەزیران (د.مالکی) و وتەبێژی حکومەتی عێراقی (د.عەلی دەباغ)ەوە بەئەگەری دواخستنی جێبەجێکردنی مادەی ١٤٠ لەکاتی دیاریکراوی خۆیدا لەژێر گوشارەکانی تورکیا و ڕازیکردنی.

٦.درکاندنی هوندێ ئاماژە لەلایەن (( فریاد رەواندوزیەوە)) ئەندام پەرلەمانی عێراق و نزیک لەسەرکردایەتی یەکێتی نیشتیمانی کوردستانەوە لە نوسینێکیدا لەڕۆژنامەی کوردستانی نوێی ژمارە((٤٣١٢ لە ٢٠٠٧/٧/٣)) بەناونیشانی ((مادەی ١٤٠ و ڕایەکی جیاواز)) کە ئاماژە دەدات بەوەی کە جێبەجێکردنی مادەی ١٤٠ لەکاتی دیاریکراوی خۆیدا گەلێک زەحمەتە و دەبێت سەرکردایەتی کورد ڕای گشتی جەماوەر و بەتایبەتیش شاری کەرکوک خاوبکاتەوە بەوەی کە مادەکە ناتوانرێت لەکاتی خۆیدا جێبەجێبکرێت.چونکە دوای ٥ مانگی تر هەڵوێستی سەرکردایەتی کورد زۆر موحریج دەبێت لەبەردەم ڕای گشتی جەماوەردا.

بەم شێوەیە چانسی جێبەجێکردنی مادەی ١٤٠ لەکاتی خۆیدا ڕۆژ بەڕۆژ بەرەو کزی نەمان دەچێت.

## مەترسیەکانی جێبەجێنەکردنی مادەی١٤٠ لەکاتی خۆیدا بۆ کورد

وەک پێشتریش باسمان کرد بۆ کورد ئەم مادەیە زۆر گرینگە و پر بایەخە بەهۆی شەرعیەتی دەستوری و یاسای و جەماوەرییەکەیەوە لەناوخۆو دەرەوەی عێراق و نێو دەوڵەتیشدا، بۆ جێبەجێکردنەکەشی لەکاتی خۆیدا گەلێک گەورەتر و گرنگتر دەبوو، هەر چەندە ئەم ماددەیە جیا لەهەموو مادەکانی تری دەستوور هەر لەسەرەتاوە بۆ ساڵی ٢٠٠٧ دواخرا واتە ٢ ساڵ، هەر بۆیە زیاتر دواخستنی جێبەجێکردنەکەی بەهەر بڕوبیانویەکەوە بێت و لەژێر هەر ناونیشان و پەردەیەکدا بێت بەتەنها و تەنها لەزیانی کورد دەشکێتەوە و بەسوودی دژەکان و ئەوانی تر تەواو دەبێت.

مەترسیەکانیش لەم چەند خاڵەدا خۆدەبینێتەوە:-

١. نفوز و دەسەڵات و پێگەی کورد لە حکومەتی ناوەند و سەرۆکایەتی کۆمار و پەرلەمانی عێراقدا لەئێستادا لەو پەڕی بەهێزی و پتەویدایە، لەکاتێکدا حکومەت و سوپاو هێزە سەربازیەکانی عێراق زۆر لاواز و بێدەسەڵاتن بۆیە داهاتوو پێدەچێت ئەم هاوکێشەیە پێچەوانە ببێتەوە لەگەڵ تێپەربونی کات و بەهێزبونی دەسەڵاتی ناوەند لەبەغداد و ئەم ڕاستیەش مێژووی ڕابوردوی دەسەڵاتەکانی ناوەند لە بەغداد دەیسەلمێنن.

٢. لەدونیایی سیاسەتدا دۆست و دوژمنی تاسەر نین بەڵکو بەرژەوەندی هەمیشەیی و تاسەر هەیە ،هەربۆیە پێشبینی دەکرێت لە ئایندەدا ئەم دۆستایەتیەی کورد لەگەڵ ئەمریکا و هەندێ هێزی ناوخۆی عێراقیدا گۆڕانیان بەسەردا بێت لەبەردەم بەرژەوەندیە ئابوریەکاندا.

٣.کشانەوەی هێزەکانی ئەمریکا و هاوپەیمانەکانی لە عێراقدا لەساڵانی داهاتوودا لە قازانجی کورد و جێبەجێکردنی مادەی ١٤٠ دا ناشکێتەوە.

٤.ئاشکرایە کورد لەم پێگە بەهێزەی ئێستایدا بەرامبەر هەموان لە ناحەزانی ناوخۆو دەرەوەشدا بەرەنگاری و مقاوەمەت دەکات بۆ جێبەجێکردنی مادەکە لە کاتی خۆیدا. بەڵام پێدەچێت تاسەر نەتوانێت لەبەرامبەر گوشار و فشارە سیاسی و ئابوری و سەربازیەکاندا خۆڕاگر بێت

٥.پێشبینی دەکرێت گۆرانێکی گەورە لە ناوچەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا ڕوودات لەچەند ساڵی داهاتوودا بەهۆی کێشەکانی ((ئەتۆمی ئێران و کێشەی سوریا – لوبنان و کێشەی فەلەستینیەکانەوە)) و بەردەوام بوونی بارودۆخی ناجێگیری ئەفغانستان و عێراقیشەوە، کەتێکچوونی ئەم بارودۆخە گشتیەی ناوچەکەش لە قازانجی کوردا نابێت بۆیە هەر دواخستنێک چەندە کەمیش بێت، بەقازانجی کورد نابێت.

**ئەی چارەسەر چیە؟؟؟**

سەرەتا دەبێت کورد بۆ هەموو ئەگەرەکان خۆی ساز و ئامادەی بکات لەسەر هەموو ئاستەکان سیاسی و ئابوری و سەربازی و جەماوەریەوە، بەوەی کە دەبێت:-

١.بەرەیەکی ناوخۆیی یەکگرتوو بەهێز لەنێوان سەرجەم پارتە سیاسیەکاندا پێکبهێنێت بۆ ڕێگەگرتن لە درزکەوتنە ناو ڕیزەکانی گەلی کورد و هەڵوێست و گوتاری سیاسیەوە.

٢. دام و دەزگاکـانی حکومـەتی هـەرێم چەسـپاو و دامـەزراوتر بکـات بـە قوڵکردنــەوەی پرۆســەی یەکگرتنــەوەی حکومــەت بەنیــەتێکی پــاک و بێگەردی کوردانەوە دوور لە زاڵکردنی مەرامی تەسکی حیزبایەتی.

٣. لەڕووی سەربازی و پێشمەرگایەتیشەوە دەبێت هێزی پێشمەرگە ساز و ئامادەبکـات لـەڕووی مەشـق و ڕاهێنـان و چـەک و تەقەمەنیـەوە بـۆ هەموو ڕووبەڕوبونەیەکی ناوەخۆیی و دەرەکی بۆ پاراستنی سنورەکانی هەرێم .

٤. لەســـەر ئاســـتی جـــەماوەریش، هۆشـــیاری بـــدات کـــە لـــەکاتی جێبەجێنەکردنی مـادەی ١٤٠ دا سـازو ئامادە بێت بۆ هـەموو پێشـهات و ئەگەرێک و ئامادەی بەرگریکاری بێت ئـەوەش بـەوەی کە ڕاستیەکان لـە جەماوەر و بەتایبەتیش شاری کەرکوک نەشاردرێتەوە.

## ساڵی ٢٠٠٧ ساڵێکی چارەنوسساز بۆ کورد و بۆ کەرکوک

ئاشکرایە شاری کەرکوک بەدرێژایی شۆڕشەکانی کورد لەم بەشەی کوردستانی باشوردا هەمیشە خاڵی لێک تێنەگەیشتن و جێگەی مشتومڕی حکومەتەکانی بەغدا و بزوتنەوەی کوردایەتی بووە. شاری کەرکوک هەر لەمێژەوە گرنگی و کاریگەری هەبووە لەسەر ڕابردوو و ئێستا و ئایندەی کورد. کەرکوک لەمێژەوە و لە سەردەمە ڕابردووەکاندا وەک شارێکی دێرین و پایتەختی ولایەتی شارەزوور و دواتر شارێکی دەوڵەمەند لە ولایەتی موصڵ جێگەی گرنگی و بایەخ پێدان و چاو تێبڕینی دۆست و دوژمنان بووە. کەرکوک پێش دۆزینەوەی نەوتیش تیایدا گرنگی خۆی هەبووە لای ئاشوریەکان و مەسیحیەکان و ..هتد. دوای دۆزینەوەی نەوتیش لە ساڵی ١٩٢٧ وە هۆکارێک بووە بۆ داگیرکردنی ولایەتی موصڵ لەلایەن ئینگلیزەکانەوە و بەردەوامیش داواکردنەوەی لەلایەن تورکیاوە.

بەم شێوەیە کەرکوک لە ڕابردوودا جێگەی مشتومڕ و ململانێ و کێشمەکێش بووە، و لە ئێستاشدا و لەم قۆناغەدا بەتایبەتی کە عێراق و ناوچەکەش پیایدا گوزەر دەکات و دوای ڕوخاندنی ڕژێمی بەعس و ڕزگارکردنی عێراق و هاتنە کایەی عێراقێکی نوێ کە دیموکراسی و ئازادیەکانی تیا بەرجەستە بووە بۆ هەموو گەلان و مەزهەبە جیاوازەکانی ناو عێراق. کەرکوک جارێک تریش بۆتەوە خاڵی وەرچەرخان و ناکۆکی و ململانێ لەلایەک لەنێوان هەرسێ نەتەوەی کورد و عەرەب و تورکومان لەناوخۆی شارەکەدا، لەلایەکی تر لەنێوان حکومەتی ناوەندی بەغدا و حکومەتی هەرێمی کوردستان و لەلای سێهەمیشەوە لەنێوان حکومەتی هەرێمی کوردستان و دەوڵەتی تورکیادا. کە لەهەرسێ ئاڕاستەکەدا تەنیا

کورد بەتەنهایە بەرامبەر هەرسێ بەرەکە لەگەڵ ئەوەی کە خاوەن هەق و زەوی و مێژوو و جوگرافیای کەرکوکە بە درێژایی مێژوو لە چوارچێوەی بەڵگە و دۆکۆمێنتەکانی عوسمانیەکان و ئینگلیز و ...هتد.

کەرکوک لە دێر زەمانەوە شاری پێکەوە ژیانی نەتەوە و مەزهەب و ئاینە جیاوازەکان بووە و هیچ کاتێک لەناو ئەو پێکهاتانەدا لەسەر ئاستی شەقام و جەماوەر کێشە و ململانێ نەبووە و نەبۆتە شارێکی شەڕ و پێکادان و ململانێی خوێناوی بەڵکو تەنها لە ئەنجامی سیاسەتی هەڵە و ناڕاست و زیندووکردنەوەی گیانی تەسکی حیزبایەتی و دەمارگیری نەتەوایەتی و مەزهەبی بەتایبەتی لەم سەردەمەدا کەرکوک بۆتە شارێکی پڕ مەترسی و ئایندە ناڕۆشن و هەمیشە وەک بەرمیلێکی باروت حسابی بۆ کراوە کە پێشبینی دەکرێت لە هەر ئان و ساتێکدا بتەقێتەوە. لە ئێستادا حکومەتی مەرکەزی بەغداد کە شیعە مەزهەب و خاوەن دەسەڵاتی زۆرینەیە نایەوێت بەجدی ئەو کێشەیە چارەسەر بکرێت لەبەر ئەوەی ژمارەیەک عەرەبی هاوردەی شیعە مەزهەبی بۆ هاتووە و دەیەوێت شاری کەرکوک بە هەرێمێکی سەربەخۆ لە دەرەوەی هەرێمی کوردستاندا بمێنێتەوە. سونە مەزهەبەکانیش کە عەرەبی ناسۆنالیستین و لە بڕوا نەبونیان بە کوردستانی بوونی کەرکوک و بچوک بوونەوەی قەوارەی سونە لە عێراقدا ڕێگرن لەبەردەم ئاسایی بونەوەی بارودۆخی کەرکوک بەپێی مادەی ١٤٠ی دەستوور. دەوڵەتی تورکیاش جارێک بەناوی پاراستنی کەمینەی تورکمانەوە و جارێک لەبەر دەوڵەمەندی بە نەوت، تەماعی لە کەرکوکدایە و داوا دەکات کە مادەی ١٤٠ی دەستور جێ بەجێ نەکرێت و چەند کۆڕ و سیمینار و کۆنفرانسیش لە تورکیا دەبەستن بە

ئامادەبوونی شیعە و سونە و عەرەب و تورکمان و دەوڵەتانی دراوسێ جگە لە کورد وەک دژایەتیکردن و ئاستەنگ دروستکردن لەبەردەم جێبەجێکردنی مادەی ١٤٠ی دەستوردا. ئەمریکاش لەم نێوەندەدا وەک چاودێرێک هەڵوێستی وەرگرتووە. بەم شێوەیە هەموان بە شیعە و سونە و عەرەب و دەوڵەتانی دراوسێ ئێران و سوریا و تورکیا و عەرەبەکانی تریش پێکەوە هاوڕان لەسەر جێ بەجێنەکردنی مادەی ١٤٠ی دەستور، یان لانی کەم دواخستنی جێ بەجێکردنی ئەو مادەیە بۆ ١٠ ساڵی تر، لەڕێگەی بەرتیل دان و چاو سورکردنەوە و هەڕەشە و گوڕەشەوە. ئاشکرایە لە دەستوری هەمیشەیی عێراقدا کە لە ٧٠%ی عێراقیەکان بە شیعە و سونە و عەرەب و کورد و تورکمان و ئاشوری و ...هتد. دەنگیان بۆ داوە چارەنوسی کەرکوک لە چوارچێوەی مادەی ١٤٠ی دەستور و پێشتریش مادەی ٥٨ی یاسای کاتی ئیدارەی دەوڵەتدا چارەسەرکراوە بەسێ قۆناغی ئاسایی کردنەوە و سەر ژمێری کردن و ڕیفراندۆم. کە پێویست دەکات لە ساڵی ٢٠٠٧ دا ئەم سێ قۆناغە یەک بەدوایەکدا جێ بەجێ بکرێت. بەڵام پێشتریش و لەسەردەمی هەردوو سەرۆک وەزیرانی عێراق (عەلاوی و جەعفەری)یدا مادەی ٥٨یان پەکخست و خۆیان لەجێ بەجێکردنی دزیەوە. لە ئێستاشدا هەرچەند نوری مالکی سەرۆک وەزیران هەمیشە دوپاتی دەکاتەوە کە کێشەی کەرکوک کێشەیەکی ناوخۆیی عێراقە و لەچوارچێوەی دەستوردا چارەسەر دەکرێت و تا ڕادەیەکیش نەرم و نیانە، بەڵام هێشتاش لەژێر فشاری توندڕەوە شیعەکان و سونەکان و دەوڵەتانی عەرەبی و تورکیادا ناتوانێت هەڵوێستێکی ڕوون و ئاشکرا و بوێرانە بنوێنێت و بڕیار و ڕاسپاردەکانی لێژنەی باڵای مادەی ١٤٠ جێ بەجێ بکات. لێرەدا پرسیار ئەوەیە، ئایا مادەی ١٤٠ لەساڵی ٢٠٠٧دا جێ

بــەجێ دەکرێــت یــان دوا دەخرێــت یــان ئەگــەری ڕووداوی چــاوەڕوان نەکراوی تر هەیە؟ ئایا سەرکردایەتی سیاسی کورد چی کردووە تا ئێستا و بـەنیازە لـە ئایندەشـدا چ بکـات؟ ئاشـکرایە ٣ مـانگی یەکـەمی وادەی جـێ بـەجێ کردنـی قۆنـاغی یەکـەمی ئاسـایکردنەوە کۆتایهـات و جـێ بـەجـێ نـەکراوە، جگـە لـەدانانی لیژنـە فەرعیـەکان و ئۆفیسـەکانیان و ئەنـدامانی لیژنەکـە و دەرکردنـی ٤ بڕیـار کـە تـا ئێسـتا و دوای ٦٠ ڕۆژ ئەوسـا ئەنجومـەنی وەزیـران ڕازیبـون لەسـەری بـەناچاری و لـە ئێستاشـدا وەک ئاسـتەنگ دروسـتکردنێکی نـوێ ئـەو بڕیارانـە ڕەوانـەی پەرلـەمانی عێراق کراوەتەوە بۆ ڕاستاندنیان کە ئەم هەنگاوە دژی یاسـا و دەستورە و تـەنیا بۆ خۆدزینەوە و جێبەجێ نەکردنیانە و دژی کورد و ئایندەی کەرکوکە. لـە ئێستاشدا کە تەنها نزیکەی ٩ مانگ ماوە کە هەرسـێ قۆناغەکە جێ بەجێ بکرێت کە ماوەیەکی کەم و کورتە و پێشبینی ناکرێت کە ئەگەرەکان ئاوهـا بڕوات لـەوادەی خۆیاندا قۆناغـەکان جێ بـەجێ بکرێت ئـەو کاتـەش تـەنها دواخسـتن و جێبـەجێ کردنـی مـادەی ١٤٠ لەبەردەمـدا دەمێنێتـەوە. کـە ئەمـەش لـە بەرژەوەنـدی کـورد و کەرکوکیشـدا نیـە. ئایـا لێـرەدا دەبێـت هەڵوێستی کورد و سـەرکردایەتیەکەی چ بێت؟ ئاشـکرایە کـورد بـەدرێژایی خـەباتی چەکـداری زۆر جـاران لەسـەر مێـزی گفتوگـۆ لەسـەر شـاری کەرکوک نەگەیشتونەتە ڕێکەوتن لەگەڵ حکومەتـەکانی عێراقدا و زۆریش پشـوو درێـژ بـووە و خۆڕاگربـووە لەبـەردەم هێـرش و پـەلامارە لـەناو بەرەکانی ڕژێمەکانی عێراقدا لـە ئـەنفال و کیمیاباران و جینۆسـاید و ..هتد. و لـــەدوای ڕزگـــارکردنی عێراقیشـــەوە و ئەنجامـــدانی هەڵبژاردنـــەکانی پەرلــەمانی عێــراق و ئەنجومــەنی پارێزگــای کــەرکوک و بەدەســتهێنانی زۆرینـەی کورسـیەکان بـۆ کـورد لـەناو شـاری کەرکوکیشـدا توانیویـەتی

ژمارەیـەکی زۆر خێزان و ئـاوارە کەرکوکیـەکان بگەڕێنێتـەوە و گونـدەکان ئـاوەدان بکاتــەوە و خوێنـدن و نوسـین و قوتابخانـە کوردیـەکان زینـدوو بکاتـەوە و ڕێگـە لـە بەعـەرەبکردن بگرێـت و زۆر کـاری گرنگـی تـریش کـە هێشـتا جێگـەی دڵخۆشـکەر نـین. بۆیـە لـەم قۆناغەشـدا پێویسـت دەکـات لـە جـاران زیـاتر پشـوو درێژتـر بێـت و نەکەوێتـە کـار و گوتـار و هەڵوێسـتی توندڕەو و کورت بین و هەڵەوە لەبەرامبەر پێکهاتەکانی ناو عێراق و دەرو دراوسێشدا. پێویستە بەهێمنی و لەسـەرخۆ بـەڵام دوور لـە مسـاوەمەکردن و تەنازول کردن لە بچوکترین مافی کورد لە کەرکوکدا، بـەردەوام بێت لـە هەوڵەکانیـدا بـۆ جـێ بـەجێکردنی مـادەی ١٤٠ی دەسـتور لـەوادە و کـاتی خۆیدا، چونکە هـیچ هەڵوێسـتێک و گوتـارێکی توندڕەوانـە لـەم قۆناغـەدا لـە قازانجی کورد و کەرکوک نیە، بەڵکو خـاڵی بـەهێز دەداتـە دەسـت دوژمنـان و ناحـەزانی کـورد و کـەرکوک بـۆ پاشـگەزبونەوە یـان ئاسـتەنگ دروسـت کردن لەبەردەم جێ بەجێ کردنی ئەو مادەیەدا. بۆیـە سـاڵی ٢٠٠٧ سـاڵێکی زۆر گرنگ و هەستیارە و چارەنوسسازە بۆ کورد و کەرکوک. و پێویست دەکات کە هەر لەسـەرکردایەتی سیاسـی کـورد بـەپارت و ڕێکخراوەکانـەوە تــا شــەقامی کــوردی و کوردســتان هــەموان پێکــەوە بەیــەک هەڵوێســت و گوتاری یەکگرتووەوە کاربکەن بۆ سەرخستنی هەڵمـەتی جـێ بـەجێ کردنـی مادەی ١٤٠ بە هاوکاری و یارمەتی ئەمریکا و بەریتانیا و دەوڵەتانی زلهێز و کاریگــەری ناوچەکــە و دونیــا و هەڵمــەتێکی سیاســـی و ڕاگەیانــدن لــەناوخۆی کوردســتان و عێـراق و ناوچەکــە و دونیــادا بــەرپا بکــەن و لــەدەروازەی شــەرعیەت و دەســتور و یاســاوە دوور لــە دەمــارگیری نەتەوەیی بۆ چارەسەری کێشەکە بچن و لە کۆڕ و کۆبونـەوە ناوچـەیی و نێودەوڵەتیەکاندا بەتوندی بەرگری لەمافی کوردستانبونی کەرکوک بکەن و

پێداگری بکەن لەسەر دەرخستنی ڕاستیەکانی نیەت و نیازی کورد لەپێکەوە ژیانی نەتەوە و مەزهەب و ئاینە جیاوازەکان لە کەرکوکدا بەئاشتی و برایەتی و تەبایی.

## ئەریّ بەڕاست مێژوو خۆی دووپات دەکاتەوە؟

لەلای زۆر کەس مێژوو دوبارە نابێتەوە، چونکە زەمەن و کات کەبەسەرچوو هەرگیز ناگەڕێتەوە، بەڵام زۆر کەسی تریش پێیان وایە کە مێژوو ئەگەر کتومت وەک پێشتر دووبارە نەبێتەوە ئەوا بەشێوە و شێوازێکی تر پێدەچێت مەترسیدارتر و خوێناوی تریش لەزەمەنێکی ئایندەدا دووبارە ببێتەوە.

گەر بڕوانینە مێژووی خەباتی گەلان و پێشکەوتنەکان و ڕووداوەکانیش دەبینین گەلێک لێکچوون هەیە لەنێوان زۆرێک لەڕووداو و بەسەرهاتەکاندا لەدەە زەمەنی جیاوازدا، ئەگەرچی کتومت لەیەکتریش نەچن، لەمێژووی خەبات و کارەسات و شۆڕش و کاولکاری و سەرنەکەوتنەکان و دوژمنایەتی و شەڕە ناوخۆییەکانی کورد دا، بەدرێژایی مێژووی سەرهەڵدان و دروستبوون و ژیانی کۆمەڵگای کوردەواری هەمیشە مێژوو بەترسناکترین و خوێناویترین شێواز دووبارە بۆتەوە لەهەموو قۆناغە جیاوازەکاندا، بەداخیشەوە هەرگیز سەرکردە و ڕابەرانی کورد پەندیان لەو مێژووە وەرنەگرتووە.

ئەوەتا زانای گەورەی نەتەوەی کورد مامۆستا (محمد امین زەکی بەگ) لەکتێبی (خولاصەیەکی تاریخی کورد و کوردستان) کەلەساڵی ١٩٣١ و ١٩٣٧ هەردوو بەرگەکەی نووسیوە، دەڵێت((کە مێژووی کورد هەمیشە دووبارە بۆتەوە لەقۆناغە جیاوازەکاندا و ڕابەر و سەرۆک هۆز و سەرکردە سیاسیەکانیش پەندیان لێ وەرنەگرتووە)).

لەجێگەیەکی تردا دەڵێت: ((بنەما و بناغەی هەموو بەڵا و نەهامەتیەکانی کورد بریتی بوون لەجەهل و فەقرو نیفاق و حەسادەت)) لەنێوان عەشرەت و ناوچە و ڕابەر و سەرۆک هۆز و بنەماڵە دەسەڵاتدارەکانی کورددا.

هەروەها دەڵێت: ((کەبنچینەی سەرکەوتن و گەیشتن بەرزگاری و سەربەخۆی و بەهێزی پێویستی بەعیلم و سەروەت و سامان)) هەیە.

نموونەی هەموو کارەساتەکانی مێژووی کورد لەڕووخانی دەوڵەتی ماد و هەموو ئەمارەتە کوردیەکان و خۆخۆری و شەڕی ناوخۆی هۆز و عەشیرەت و ناوچە جیاوازە کوردیەکان و خیانەت و وڵات فرۆشی لەنێوان تاکەکانی خێزانە دەسەڵاتدارە کوردیەکاندا و ڕێکنەکەوتن و ئیتفاق نەکردن لەسەر یەکبوون و یەکگرتن و یەک بەرنامە بۆ بەرژەوەندی میلەتی کورد بۆتە هۆی لەدەستدانی ئەو دەسەڵات و دەوڵەت و ئەمارەتانە و تا ئێستاش کورد نەیتوانیوە بگاتە ئاوات و ئامانج و خواستەکانی لەسەربەخۆیی و دامەزراندنی دەوڵەتی سەربەخۆدا.

جا ئەو مێژووە خوێناوی و پڕ کارەساتانە گەرچی لەسەدەکانی ڕابردوودا و لەزەمەنی جەهل و نەزانین و هەژاری و دواکەوتویدا ڕوویانداوە بونەتە لاپەڕەیەکی ڕەشی مێژووی گەلەکەمان، کەچی لە ئێستاشدا و لەزەمەنی بەجیهانی بوونی دونیادا و سەردەمی تەکنۆلۆژیا و پێشکەوتن و داهێنانەکاندا و سەردەمی بازاڕی ئازاد و ئابووری و بازرگانی و سەردەمی تێکچڕژاندنی بەرژەوەندیەکان و شارستانیەتەکان و سەردەمی عیلم و زانست و خۆش گوزەرانی و بوونی سەروەت و سامان و بوونی حیزبی سیاسی و ڕابەر و سەرکردەی هۆشیار و سیاسی

ناودار. لەکاتێکدا بەهۆی نەزانی و نەبوونی جیهانبینیەکی واقیعانە بۆ ڕووداو و پێشهاتەکانی کوردستان و وڵاتانی ناوچەکە و جیهان بەگشتی لەلایەن سەرکردایەتی سیاسی کورد بەتایبەت دەسەڵاتدارانی یەکێتی و پارتی کۆی حیزبە سیاسیەکانی بەرەو ڕیفراندۆمی کوردستان.

کەچی هەمان مێژووی ڕەشی ڕابردوو بەمەترسیدارترین شێواز دووبارە دەبێتەوە و ئایندەی گەل و نیشتمانەکەمان ڕووبەڕووی لەناوچوون و بچووک بوونەوە و کارەساتی جەرگبڕ دەکات و هەڕەشەی لەناوچوون و نەمانی ئەم دەسەڵاتە کوردیە دەکات کەماوەی ٢٧ ساڵە لەم بەشەی کوردستاندا هاتۆتە ئاراوە و گەلێک دەسکەوتی گەورە و مەزنی بەدەستهێناوە و کێشە و مەسەلە و ناوبانگی کوردی لەدونیادا گەورە کردووە.

ئەوەتا لەسەر دەستی حیزبە سیاسیەکاندا دیاردە دزێو و قێزەوەن و زیان بەخشەکانی (عەشیرەتگەری و ناوچەگەری و حەسادەت و ململانێی ناوخۆیی حیزبایەتی  و کێبڕکێی دەسەڵات و ئابووری و ئینشقاق و دوو ڕووی و درز خستنە ناو ڕیزەکانی گەلەکەمانەوە) سەریان هەڵداوە کەهەموو ئەم دیاردانە لەکۆنەوە تا ئێستا هۆکاری سەرەکی دواکەوتن و هەژاری و بەش مەینەتی و سەرنەکەوتنی کورد بوون.

کەچی لەدوای سەدەیەک و لەم زەمەنەدا هەمان مێژووی کارەساتبار دووبارە دەبێتەوە کەلە ئێستادا کاریگەری و مەترسیەکانی لەجاران زیاترە، چونکە کورد لەئێستادا لەهەموو کات زیاتر نزیک بۆتەوە لەئامانج و خواستەکانی بۆیە هەر خیانەت و هەڵگەڕانەوە و فرۆشتنی گەل و نیشتمان بەهەر کەس و لایەنێک بێت و بەهەر بڕو بیانویەک بێت سەدان

جارو بگرە هەزاران جار گوناهە و کاریگەریەکانی گەورەتر دەبێت لەسەر ئایندەی گەلەکەمان.

لەپێناو ڕێگەگرتن و دووبارە نەبونەوەی هەڵەکانی باوباپیرانمان کە بونەتە هۆی ڕوخاندنی حکومەت و ئەمارەت و شۆڕشەکانی کورد هەر لەمیرەکانی ئەردەلان و هەکاری و سۆران و بادینان و بابان و تاسەر شۆڕشەکانی شێخ عوبەیدولای نەهری و شێخی شەمزینان و شێخ سەعیدی پیران و بەدرخانیەکان و سمکۆی شکاک و شێخی نەمر و شۆڕشەکانی بارزان و کۆماری کوردستان و چەندانی تر..

**پێویستە لەسەر سەرکردایەتی کورد و جەماوەر کە نەهێڵن:**

١. یەک و یەکگرتوویی ڕیزەکانی پارتە سیاسیەکان و ڕێکخراوە پیشەییەکان و جەماوەر تێکبچێت.
٢. حکومەت و دەسەڵاتی کوردی پتەو و بەهێز و چەسپاو و بە موئەسەسات بکرێت.
٣. هەوڵی جدی بدرێت بۆ بەگژاچوونەوەی گەندەڵی ئیداری و دارایی لەحزب و حکومەتدا.
٤. بەپێی یاسا هەموو پارتە سیاسیەکان پابەند بکرێن بە کارنەکردن دژی بەرژەوەندی گەلی کورد و بەشدار پێنەکردنیان لەهیچ کۆڕ و کۆبوونەوەو بەرەیەکی دژ بە کورددا وەکو ئەوەی لەقاهیرە لە ٢٠٠٧/٤/٢٩ دا سازدراوە و یەکگرتووی ئیسلامی کوردستانیش بەشداری لەو بەرەیەدا کردووە.
٥. پیرۆزکردن و چەسپاندنی هەست و بیری نەتەوەیی لەناو بەرنامەی خوێندن و لەناو خێزان و تاکی کوردیدا بۆ ئەوەی

هەموان ئینتیمایان تەنها بۆ کورد و کوردستان بێت لەجیاتی زیندو کردنەوەی دیاردە زیان بەخشەکانی عەشیرەت و هۆز و ناوچەگەری، کە هێز و یەکێتی گەلەکەمان پەرتەوازە دەکات و هەمیشە خاڵی لاوازە بۆ درزتێکردن و هەڵگەڕانەوە و خیانەت و نیشتمان فرۆشی.

٦. توند و تۆڵ کردنی پەیوەندیەکانی کورد بەهێزە سیاسیە ناوخۆییە عێراقیەکان کە لەکوردەوە نزیکن و دواتر لەگەڵ وڵاتانی ناوچەکە و دونیاشدا و بەتایبەتیش زلهێزەکانی وەک ئەمریکا و بەریتانیا و یەکێتی ئەوروپا و ... هتد.

٧. گرنگی دان بەعیلم و زانست و پێشکەوتن و ئاوەدانی و وەبەرهێنان لە کوردستاندا.

## هەڵە کوشندەکانی سەرکردایەتی کورد لەعێراقی نوێدا

* ئاشکرایە ڕووخاندنی ڕژێمی بەعسی سەدامی لەلای کورد و سەرجەم هێزە ئۆپۆزسیۆنەکانی عێراقیەوە ببووە کارێکی نەکردە و موستەحیل و لەتوانادا نەبوو، کاتێکیش ئەو کارە ئەنجامدرا بەڕابەرایەتی سوپای ئەمریکا و هاوپەیمانان هەموان شاگەشکەبوون و وەک خەون و خەیاڵ وابوو کەهاتبێتە دی. هەر بۆیە خۆئامادەکردنێکی باش نەبوو بۆ گرتنە دەستی دەسەڵات و حوکمی وڵاتێکی گەورە و گرنگی وەک عێراق بەهۆی پێگە مێژووی و جوگرافیی و هەڵکەوتەکەی لەناوچەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و دەروازەی ڕۆژهەڵاتی وڵاتانی عەرەب و بەهۆی دەوڵەمەندیەکەشیەوە لەنەوت و کانزاکان و بەهەموو کێشە نەتەوەیی و تایەفی و دینی و ... هتد. بۆیە کارێکی ئاسان و سانا نەبوو کە هەمووان بەکورد و شیعە و سونە و ... هتد. لەسەر یەک بەرنامە و سیاسەتی یەکگرتوو کار بکەن. لەلایەک بەهۆی نەبوونی توانا و شارەزایی و کارامەیی تەواو لەئیدارە و دەسەڵات و بەڕێوەبردنی وڵاتدا لای هیچ لایەکی ئۆپۆزسیۆن، لەلایەکی تریشەوە هەریەکەیان بەئەجێندەی وڵات یان دەزگایەکی سیخوڕی ناوچەیی و عەرەبی و بیانی کاریان دەکرد کە مەحاڵ بوو هەموانیان لەسەر یەک بەرنامە کۆک بن، چونکە هەریەکەیان بەرژەوەندی تایەفە و پشتیوانەکانی خۆیان دەپاراست و هەوڵیان بۆ دەدا.

کوردیش وەک هەموان بەرنامە و ئەجێندای خۆی هەبوو لەو دەسەڵات و عێراقە نوێیەی کە وەک خەون هاتبووە دی و چەندەها ساڵ بوو خەبات و خوێن و فرمێسکی بۆ دەڕشت و کەوتە خۆ بۆ ئەوەی جێگە و پێگەی شیاوی خۆی وەربگرێت لەو عێراقە نوێیەدا. بەڵام بەداخەوە

سەرکردایەتی سیاسی کورد یان ڕاستر بڵێین سەرکردایەتی پارتی و یەکێتی کە تاڕووخانی ڕژێمی بەعس دوو ئیدارە و دوو گوتار و دوو هەڵوێستی سیاسی جیاوازیان هەبوو لەمەڕ زۆر لەمەسەلەکان لەنێوان خۆیاندا، هەر بۆیەش لەلایەک نەبوونی متمانە بەیەکتری و لەلایەکی تریشەوە زاڵبوونی بیرکردنەوەی تەسکی حیزبایەتی و دەسکەوتی حیزبی و شەخسی و لەلای سێهەمیشەوە پرس و ڕانەکردن بەکەسانی پسپۆڕ و شارەزاو جەماوەر و پارتە سیاسیەکانی تر، ئەو سەرکردایەتیە کەوتە هەندێ هەڵەی کوشندەوە کە لەئێستادا و دوای پانزە ساڵ لەڕووخانی ڕژێمی بەعس کاریگەریەکانیان دەردەکەوێت کە پێگەی کورد ڕۆژ بەڕۆژ لەلاوازبوون و بچووک بوونەوە و لەقاڵبداندایە و ئەو سەنگ و قورسایی و هەیبەت و هەیمەنەیەی جارانی نەماوە.

هەر بۆیەش مەترسی هەڕەشەکان لەسەر ماف و داواکاری و مەسەلەی کوردیش بەجدی سەریان هەڵداوەتەوە بەهۆی زاڵبوون و باڵادەست بوون و بەهێزبوونی لایەنەکانی تر کە تا دوێنێ دۆست و هاوپەیمانی کورد بوون و لەخاکی کوردستانەوە بەناو خەباتیان دەکرد، بەڵام لەئێستادا و لەسایەی دیموکراسی و لەژێر قوبە پەڕلەمانی شەرعی و یاسایی و دەستووریدا دژایەتی خواستە ڕەواکانی کورد دەکەن.

ڕاستە ئەرکی کورد و سەرکردایەتیەکەی لەئێستادا گەلێک لەجاران سەخترە بەهۆی ئاڵۆزبوونی کێشەکان و زیادبوونی ناحەزان و بوونی کاریگەری پلە و ئیمتیازات و دەستێوەردانی وڵاتانی ناوچەکە و دونیاو ... هتد، بەڵام لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا پێویستە سەرکردایەتی سیاسی کورد زۆر بەژیرانە و حەکیمانە و دووربینانە و دیقەتی زیاترەوە مامەڵە لەگەڵ

گۆڕانکاریە سیاسی و ئابووریەکاندا بکات و هاوکێشە و بەلانسی هێزەکان باش بخوێنێتەوە و کارتەکانی گوشار لەدەستیدا زیاتر بکات، ئەوانەش هەمووی بەنەکردنی هەڵەی زەق و کوشندەی یاسایی و سیاسی دەبێت، چونکە ڕوودانی هەر هەڵەیەک دەبێتە هۆی مایەپووچ بوونی بەری ڕەنج و خەباتی چەندەها ساڵەی کورد، بەپێچەوانەشەوە هەموو سەرکەوتنێک و بەدەستهێنانی دەستکەوتێک دەبێتە مایەی زیاتر چەسپاندنی دەسەلات و قەوارەی سیاسی کورد و پێگەی دەسەلاتی لەعێراق و ناوچەکە و دونیاشدا و هێندەی دی ئاسۆکانی دوارۆژ ڕووناکتر و گەشاوەتر دەکات.

## لەو هەڵە گەورانەی کە سەرکردایەتی کورد کردویەتی لەعێراقی نوێدا:-

١. نەیتوانی جێبەجێکردنی ماددەی ٥٨ لەیاسای کاتی ئیدارەی دەوڵەتدا کە لەسەردەمی ئەنجومەنی حوکمدا نوسراوە، نەتوانرا لەسەردەمی هێز و دەسەلاتی کورددا لەهەردوو حکومەتی عەلاوی و جەعفەریدا جێبەجێ بکرێت.

٢. لەکاتی نووسینەوەی دەستووری هەمیشەیی عێراقدا کە نزیکەی دوانزە ملیۆن عێراقی دەنگیدا بۆی، لەماوەی دوو ساڵی ماوەی جێبەجێکردنی ماددەی ١٤٠ی دەستووردا، نەتوانرا ئەو ماددەیە جێبەجێبکرێت، کە هەڵەی سەرەکی سەرکردایەتی سیاسی کورد ئەوە بوو کە ماوەی دانا بۆ جێبەجێکردنەکە، کە نەدەبوو ئەو کارە بکات و وەک هەموو ماددەکانی تری دەستوور مامەڵەی لەگەڵدا بکرایەو تا ئەو دەستوورە هەبوایە ماددەکەش کاریگەری یاسایی و شەرعیەتی خۆی بمایە، نەک وەک ئێستا بەهۆی هەڵەی

سەرکردایەتی کوردەوە شەرعیەتی ماددەکە کەوتۆتە بەر تانە و تەشەر و گومانەوە.

٣. هەر لەسەرەتای پێکەوەنانی حکومەتەکانی عەلاوی و جەعفەریدا نەتوانرا بوونی هێزی پ.م. ی کوردستان وەک هێزێکی سەربازی یاسایی بچەسپێنرێت و بوودجەی بۆ تەرخان بکرێت نەک وەک ئێستا بۆتە کێشە و دوژمنی بۆ زیاد بووە، هەموو پرس و ڕایەک دەبێت لەپەرلەمانی عێراقدا یەکلایی بکرێتەوە کە ئەمەش کارێکی زەحمەتە.

٤. نەتوانرا هەر لەسەرەتاوە بەو هێزی پ.م کە هەیە و لەئێستادا بەهەردوو پارتی و یەکێتی کەنزیکەی ١٠٠ هەزار چەکداریان هەیە، بتوانرێت سنووری جوگرافیای کوردستان لەشەنگار و تەلەعفەر و مەخمور و کەرکووک و حەمرین خانەقین و مەندەلی بپارێزێت و بیکەنە ئەمری واقع و لەدەستووری هەمیشەیی عێراق و کوردستانیشدا بچەسپێنرێت.

٥. لەئێستاشدا کە سەرکرادیەتی کورد بۆی دەرکەوتووە کە پێگەو دەسەڵاتی بەرەو لاوازبوون دەچێت هەوڵی ئەوە دەدات کە هەندێ کار بکات بۆ ئەوەی ئەو بارە لارو ڕوو لەناهاوسەنگیە ڕاستبکاتەوە بەهەندێ هەنگاوی حساب بۆ نەکراو و پشت نەبەستوو بەشەرعیەتی دەستووری و جەماوەری خەڵکی کوردستان. وەک ئەنجامدانی ڕفراندۆم لە ٢٠١٧/٩/٢٥ و ئیمزاکردنی ڕێککەوتن لەنێوان وڵاتانی ناوچەکە بەتایبەت تورکیا، هەروەها لێدانی بیری نەوت و ئیمزاکردنی پەیوەستنامەی نەوتی

لەگەڵ کۆمپانیا بیانیەکاندا، بەبێ گەڕانەوە بۆ مەرکەز و پرس و ڕاوێژ پێکردنیان.

ڕاستە هەموو هەوڵێکی حکومەتی هەرێم بە ئاراستەی زیاتر چەسپاندنی واقعی سیاسی کوردستان و بەهێزکردنی بنەما ئابووریەکانی هەرێم کارێکە لەبەرژەوەندی ئایندەی کوردستاندایە، هەموو تاکێکی کورد خەونی بەوەوە دەبینی کە نەوتی کورد بۆ کورد بێت نەک دژ بە کورد. بەڵام دەبێت ئەم هەوڵە و گەمە سیاسیە زۆر هەستیارە لەلایەک بەئاشکرا بێت و لەلایەکی تریشەوە پشت ئەستوور بێت بەڕای گشتی جەماوەری کوردستان و پارتە سیاسیەکان و پەڕلەمانی کوردستان. نەک شاراوە بێت تەنانەت شەریکە بەشەکەی حکومەتیش کە یەکێتی نیشتمانی کوردستانە ئاگاداری وردەکاری ئەو پەیوەستنامانە نیە و تەنانەت پەڕلەمانی کوردستان کە نمایندەی گەلی کوردستانە ئاگاداری ناوەڕۆکی ئەو پەیوەستنامانە نیە.

* لێرەدا پرسیار ئەوەیە ئایا ئەم هەڵە و کەموکوڕیانە بۆ کران؟ ئایا لاوازبوون و بچووکبوونەوەی پێگەی کورد لەبەغداد هەڵەی کێ بوو؟ کورد یان خەڵکانی تر؟ ڕێگا چارە چی یە؟

ڕاست و دروست ئەم هەڵانە تەنها سەرکردایەتی پارتی و یەکێتی لێی بەرپرسیارە، لەئەنجامی نەشارەزایی و پرس نەکردنی بە پسپۆڕانی یاسایی و دەستووری و ئیداری و ئابووری و... هتد. لەئەنجامی ململانێی حیزبایەتی و وەدەستهێنانی پلەو پایە و پۆست و ئیمتیازاتی حیزبی و کەسی بووە، لەئەنجامی بێ متمانەیی بەیەکتر بووە، لەئەنجامی نەگەڕانەوە بووە بۆ لای هێزە سیاسیەکانی سەر گۆڕەپانی کوردستان و جەماوەری

گەلەکەمان بووە، بەهەمان شێوە لەئەنجامی خۆشباوەڕی و موجامەلەو دڵ ڕازیکردنەوە بووە، لەئەنجامی بێ بەرنامەیی و باش هەڵنەسەنگاندنی هاوکێشە و گۆڕانە سیاسیەکان و هێزەکانەوە بووە و نەخوێندنەوەی ئایندە بووە.

لەئێستاشدا بەهەمان شێوە هەمان سەرکردایەتی سیاسی بەرپرسیارن لەلاوازبوون و بچووکبوونەوەی پێگەی کورد لە عێراقدا، چونکە خۆی بووە ناوبژیوان و دەم ڕاست و کوێخای شیعە و سونە بۆ ئەوەی شەڕی تایەفی و ئەهلی ڕوونەدات، هەر ئەم کارەش بوو کە بووە هۆی بەهێزبوونی هێزی پۆلیس و سوپا و دەزگا ئەمنیەکانی تر، دەسەڵات و حکومەتی مالکی بەهێزتر کردوو زیاتر چەسپاندنی و وایکرد کە ڕێگری زۆر لەبەردەم جێبەجێکردنی ماددەی ١٤٠ دا دروست بکات و بە بەرنامەش کار بۆ پەککستنی دەکات، تا کار گەیشتە ئەوەی کە هاوپەیمانی لەدژی کورد ساز بکات لەگەڵ هێزە دژەکان بە کورد و داواکاریەکانی، لەکاتێکدا تەنها کورد بووە مایەی مانەوە و بەردەوامبوونی حکومەتەکەی مالکی.

کورد هەر خۆی بوو بووە هۆی دواکەوتنی لەسێدارەنەدانی تاوانبارانی ئەنفال. کورد خۆی کەمتەرخەم و خوێن سارد بوو بۆ جێبەجێنەکردنی ماددەی ١٤٠ی دەستوور لەکاتی خۆیدا. بەدەستنیشانکردنی کەسانی لاواز و بێدەسەڵات لەکوردستان و لیژنەی باڵای ماددەی ١٤٠. کورد هەر لەسەرەتاوە هەڵەی خۆی بوو کە کەرکووکی وەک خانەقین پاکنەکردەوە و کۆنترۆڵی نەکرد. کورد هەر

خۆی بووە هۆی ئەوەی کە هێزی پێشمەرگەی کوردستان بەژمارە و خەرجی و پێداویستیەکانیەوە نەچەسپێت.

کورد هەر خۆی بووە هۆی لاوازبوونی پێگەی خۆی لە عێراق و لەبەردەم ئەمریکادا و لەناوچەکەشدا، چونکە تا ئێستاش ئاشتبوونەوە و متمانەیەکی ڕاستەقینە و توندوتۆڵی لەناوخۆی خۆیدا لە حیزب و حکومەت و پەرلەماندا چی نەکردووە.

کورد هەر خۆی نەیتوانیوە لە ماوەی بیست و حەوت ساڵدا بناغەی حکومەتەکەی خۆی بچەسپێنێت و هەموو وەزارەتەکان یەک پێبگرێتەوە.

کورد داوای شەراکەتێکی یەکسان و هاوبەش دەکات لە بەغداد کەچی لەناو حکومەتەکەی خۆیدا هەردوو شەریکە بەشەکە متمانە بەیەکتری و پەرلەمانە هاوبەشەکەش ناکەن. کەواتە تەنها کورد خۆی بەرپرسیارە لە بچوکبوونەوە و لاوازبوونی ڕۆڵ و کاریگەریەکانی تەنانەت لەناو کوردستان و عێراق و ناوچەکە و لەبەردەم ئەمریکاشدا. هەربۆیە چارەسەر بریتیە لەوەی کە، ئەم سەرکردایەتیە سیاسیەی کورد یان بگۆڕدرێت، یان بەسەر گوتار و هەڵوێستەکانی خۆیدا بچێتەوە.

**لەسەر ئاستی کوردستان** :-

١. بە زووترین کات حکومەتێکی توندوتۆڵ و بنکەفراوان و بەهاوبەشی هەموو حیزبە سیاسیەکان پێکبێت لەسەر بنەمای توانا و لێهاتووی و ڕابوردوو و پاکی و خاوەن بڕوانامە، نەک لەسەر بنچینەی حیزبایەتی.

٢. پرس و ڕاکردن بە پارتە سیاسیەکانی کوردستان و لە هەموو مەسەلەکاندا بۆ ئەوەی یەکڕیزی گەلی کورد بپارێزرێت و ڕێگە نەدرێت بە درزتێکردنی ڕیزەکانی گەلی کورد.

٣. گەڕانەوە بۆ لای جەماوەر ئەویش بە چارەسەرکردنی کێشەکانی ژیان و گوزەرانی خەڵکی و ئاوەدانکردنەوە و پێشکەشکردنی زیاتری خزمەتگوزاری بۆ جەماوەر.

٤. نەهێشتنی گەندەڵی و چێ کردنی سازکاری لە حیزب و حکومەت و دەسەڵاتی کورددیدا.

٥. چەسپاندنی زیاتری دیموکراسیەت و ئازادیەکان و دادوەری کۆمەڵایەتی.

**لەسەر ئاستی عێراق :-**

بە دڵنیایی چەندە لە کوردستاندا یەک و یەکگرتوو بین، هێندەش لە بەغداد بەهێز و بەتوانا دەبین، هەر بۆیە عێراق ڕەنگدانەوەی کوردستانە و دەبێت لە بەغداد سیاسەتی نەتەوەیی پیادە بکەین دژی هەموان و لەسەر ماف و داواکاریە ڕەواکانی کە لە بەرژەوەندی خەڵکدایە نەک حیزب سازش نەکرێت و مل نەدرێت بۆ گوشار و فشارەکانی هێزە نەیارەکان.

**لەسەر ئاستی وڵاتانی ناوچەکە :-**

لەبەر ئەوەی کورد لە ڕەوایی مەسەلەکەیی و جەماوەرەکەی و شاخ و داخەکانی کوردستان هیچ دۆستێکی ڕاستەقینە و تاسەری نیە نە لەعێراق و نە لە ناوچەکە و نە لەکوردستانیشدا، هەر بۆیە پێویستە

مامەڵەی خۆی لەگەڵ وڵاتانی ناوچەکەشدا بەهێمنی و لەسەرخۆ و نەفەس درێژی بەڕێوە بەرێت، دوور لە زمانی زبر و توند و هەڕەشە و گوڕەشە کە لە تواناماندا نەبێت، بۆ تێپەڕاندنی قۆناغەکە و سیاسەتی ڕێزگرتن و دراوسێیەتی باش پیادە بکات، بەبێ ئەوەی دەست بەربدات لە مافە ڕەواکانی.

**لەگەڵ ئەمریکادا** :-

کورد ئەگەر بەناو و لەم قۆناغەدا دۆستێکی هەبێت و پارێزگاری لێبکات لەبەردەم هێزە نەیارەکانی ناوخۆی عێراق لەلایەک و وڵاتانی عەرەبی و ئیسلامی ناوچەکە لەلایەکی ترەوە تەنها ئەمریکایە، بەڵام ئاشکراشە لە دونیای سیاسەتدا دۆست و دوژمنی تا سەر نیە، بەڵام بەرژەوەندی تاسەر هەیە، هەر بۆیەش ئەم دۆستایەتیەی ئەمریکاش بەدڵنیایی تا سەر نابێت، بەڵگەش بۆ ئەو ڕاستیە هەڵوێستی ئەمریکا بوو لە کێشەی دژایەتی کردنی ڕیفرادۆمی کوردستاندا بێدەنگی نواندن لەبەرامبەر هێرشکردنی میلشیاکانی حەشدی شەعبی بۆ سەر ناوچە دابڕێنراوەکانی سنوری ئیدارەی هەرێم و کێشەی پەکەکە PKK و بەئاشکرا و بەنهێنی دژی پەکەکە PKK بوو، لەگەڵ تورکیاشدا پەیوەندیە ساردبوەوەکانی گەرمتر کردەوە و هەڕەشەی لە سەرکردایەتی کوردیش کرد کە زیاد لەبەرەی خۆی پێ ڕانەکێشێت. بەهەمان شێوە تا ئێستا هیچ کۆمپانیایەکی ئەمریکی لەگەڵ حکومەتی هەرێمدا پەیوەستنامەی نەوتی ئیمزا نەکردووە.

بەڵام کورد دەتوانێت درێژە بەو پەیوەندیانەی لەگەڵ ئەمریکا و ئەورووپا بدات بەزیاتر چەسپاندنی دیموکراسیەت و ئازادیەکان

لەکوردسـتاندا و نەهێشـتنی گەنـدەڵی لەحکومەتـدا و زیـاتر ئاوەدانکردنـەوەی کوردسـتان و تێکـەڵاوبوون لەگـەڵ بازاڕەکـان و کۆمپانیا و بانکە نێودەوڵەتیەکاندا.

بۆیـە گـەر سـەرکردایەتی کـوردی ئـەم قۆناغـە ناسـک و هەسـتیارە بەژیرانە تێنەپەڕێنێت ئەوا زۆر نزیکە کە هـەموو بـەری ڕەنـج و خـەبات و دەسـتکەوتەکان لەدەسـت بچێت و جارێکی دی بۆ سـەدان سـاڵی تـر چاوەڕوانی هەلێکی لەم جۆرە بین.

## دەسەڵاتی کوردی و هەنگاونان بەرەو دیکتاتۆریەت

ئاشکرایە دوو سیستەمی سەرەکی دەسەڵات هەن لە دونیادا، ئەوانیش دەسەڵاتی دیموکراسی و دەسەڵاتی دیکتاتۆرین و لە ژێر چەتری ئەو دوو سیستەمەشدا شێوە و شێوازی زۆری تر هەن و پیادە دەکرێن بەناو و ڕێبازی جیاوازەوە. کە ئەو دوو سیستەمەش هەرگیز پێکەوە هەڵناکەن و دوژمنی سەرسەختی یەکترین. هەمیشە و لە مێژوودا هەر وابوە هەر کاتێ سیستەمێکی دیموکراسی ڕووخابێت لە ئەنجامی هۆکاری ئابوری یان کۆمەلایەتی و ...هتد. ئەوا ڕاستەوخۆ سیستەمێکی دیکتاتۆری جێگەی گرتۆتەوە. ئاشکراشە ئەم دوو سیستەمەش جیاوازیەکی گەورەیان لەنێواندا هەیە و زۆر بە سانایی درک بە کاریگەریە باش و خراپیەکانی هەردوو سیستەمەکە دەکرێت لەسەر ژیان و گوزەران و پێشکەوتن و گەشەکردنی هەموو لایەنەکانی ژیانی کۆمەڵگا.

لەدونیای ئێستادا مۆدێلی سیستەمی دیموکراسیە و سەرتاپا سیستەمە دیکتاتۆری و شمولی و سەربازی و کۆنەپەرستەکان کەنار پەراوێزخراون و بونەتە بەشێکی ڕەش و تاڵی مێژووی مرۆڤایەتی. هەرچەندە لێرەو لەوێ و تاکو تەرا سەرهەڵدەدەن و دروست دەبن، بەڵام بەهۆی قێزەونی و دڕندەییان هێندە دوژمنیان هەیە ناتوانن لەبەر فشارە ناوخۆیی و دەرەکی و جەماوەریەکاندا خۆ ڕابگرن و بەناچاری دەکەونە خۆگونجاندن و جوانکردنی سەرو سیما و دروشم و بەرنامەکانیان و دواتریش بەرەو ڕوخان و دارمانی کۆتا دەچن. هەر بۆیە لەئێستادا تاکە سیستەمێک کە مایەی ڕەزامەندی زۆرینەی کۆمەڵگا مرۆڤایەتیەکان بێت تەنها دیموکراسیە کە ئەویش هەر چەندە بەتەواوی و بێ کەموکوڕی نیە

بەڵام هەمیشە لەسیستەمی دیکاتۆری پەسەندتر و بەهێزترە. جا بۆ ناسینی زیاتری سیستەمی دیکتاتۆری کەمێک بەدرێژی باسی لێوە دەکەین چونکە مەبەستی باسەکەمانە.

## پێناسەی دیکتاتۆریەت:-

١. شێوازێکە لەشێوازەکانی دەسەڵاتی کەتیایدا دەسەڵاتی ڕەها لەدەستی یەک کەسدایە (دیکتاتۆر)، وشەی دیکتاتۆریەت لەکرداری (dictate) بەمانای دەیسەپێنێت و لەچاوگی (dication) یان سەپاندنەوە هاتووە.

٢. سیستەمێکی دەسەڵاتە کەتیایدا تاکە کەسێک خاوەن سەرجەم دەسەڵاتەکانە لەبەڕێوەبردنی دەوڵەتێکدا، جا بەتەنها ئەو دەسەڵاتانە پیادە بکات یان لەڕێگەی دەست و پێوەندەکانیەوە.

## مێژووی پەیدابوونی دیکتاتۆریەت

ڕەگ و ڕیشە سەرەکیەکانی دیکتاتۆریەت دەگەڕێتەوە بۆ دیکتاتۆریەتی ڕۆمانی کە زانیاریە ڕاستەکان ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن کە یەکەم دیکتاتۆریەت لەپێش زایندا بەنزیکەی ٥٠٠ ساڵ دروست بووە، وە دوا دیکتاتۆری هەڵبژێردراویش بەشێوەیەکی یاسایی ڕاست و دروست لەپێش زایندا بە ٢١٠ ساڵ بووە، بەڵام دیکتاتۆریەت وەک سیستەم بۆ یەکەم جار لە کۆتایی سەدەی چوارەمدا دەرکەوت.

لای ڕۆمانیەکان دیکتاتۆریەت پشتی دەبەست بە بنەما دەستوریەکان لە بڕیارەکانیدا و بۆ ماوەیەکی نائاسایی و دیاریکراو بوو، وە کۆتایی

دەهات ئەگەر كارەكانیشی تەواو نەكردایە، بەڵام لای ئغریقیەكان دیكتاتۆر گۆڕا بۆ دەسەڵاتی سەپێنراو و چەوسێنەرەوە.

سۆكرات و ئەفلاتون هۆشداریانداوە كە دەسەڵاتی چەوسێنەرەوە لەدوای دیموكراسیەتەوە دێت و لەناوی دەبات. لای ڕۆمانیەكان دیكتاتۆر دەسەڵاتدارێكی ڕەها نەبوو، بەڵكو دەستوری بووە، وە سیستەمێك نەبوو كە دامودەزگای دیكتاتۆریەتی هەبێت كەسەر بە دیكتاتۆر بووبن، بەڵام دواتر لای ئیغریقیەكان بووە دەسەڵاتێكی سەركوتكەر و چەوسێنەر و داپڵۆسێنەر و بەبێ بوونی بناغەیەكی دەستوری ڕاستەقینە.

## چەمكی دیكتاتۆریەت

دوو بەكارهێنان هەیە بۆ چەمكی دیكتاتۆریەت :-

١. دیكتاتۆری ڕۆمانی كە پۆستێكی سیاسی بوو لە كۆماری ڕۆمانی كۆندا كە لەو كۆمارەدا دیكتاتۆر خاوەن دەسەڵاتێكی ڕەها بوو لەكاتی نائاسایدا، وە پێویست بوو لەلایەن ئەنجومەنی پیرانەوە ئەو پۆستەی پێبدرێت.

٢. لەم سەردەمەدا وشەكە بەمانای شێوازێكی دەسەڵاتی ڕەها دێت بۆ تاكە كەسێك بەبێ پابەند بوون بە دەستورەوە یان یاساكانەوە، یان هیچ هۆكارێكی سیاسی یان كۆمەڵایەتی لەناو ئەو دەوڵەتەی كە حكومی دەكات.

وشەی دیكتاتۆر بەهەموو دەسەڵاتدارێكی خۆسەپێن یان هەر كەسێك كە نوێنەرایەتی دەكات دەوترێت لەبردنەڕێوەی وڵاتێكدا دوور لە گەلەكەی.

پێناسەی چەمکی تیۆری دیکتاتۆریەت و زاراوەکانی کۆنە و دەگەڕێتەوە بۆ بیستەکان و سیەکانی سەدەی ڕابردوو.

دیکتاتۆریەت مێژوویەکی کۆنی نیە، بەڵکو بەکارهێنانی وشەی دیکتاتۆر مێژوویەکی کۆنی هەیە، ئاشکراشە جیاوازیەکی گەورە هەیە لەنێوان چەمکی دیکتاتۆر و چەمکی دیکتاتۆریەتدا، چونکە دیکتاتۆر تاکە کەسێکە و دیکتاتۆریەت سیستەمێکی دام و دەزگاییە، لەسەدە کۆنەکاندا شتێک نەبووە بەناوی دیکتاتۆریەتەوە، بەڵکو دیکتاتۆر هەبووە وەک تاکە کەس. لەڕاستیدا جیاوازی هەیە لەنێوان دیکتاتۆر و دیکتاتۆریەتدا، سەرەڕای هەبوونی پەیوەندی و ڕایەڵە لەنێوانیاندا.

* زاراوەی دیکتاتۆر و دیکتاتۆریەت لە مێژوودا بەچەند قۆناغێکی گۆڕانی قوڵدا تێپەڕیوە، وەک سیستەم و وەک دەربڕینی زمانەوانی. دەکرێت دابەشبکرێتە سەر چوار قۆناغ :-

١. سەدەی پێنجەم – سەدەی سێیەمی پێش زاین (دیکتاتۆریەتی ڕۆمان) کە سیستەمێکی نائاسایی داناوە بۆ ڕابەرایەتیکردنی وڵات لە کاتی نائاسایدا (تایبەتدا).

٢. سیستەمی ڕۆمانی لەسەردەمی (دیکتاتۆریەتدا) قەیسەری ڕۆمانی و سەردەمی ماریۆسی حەوتەم.

٣. لەلایەنی یاساییەوە، لەسەردەمی ڕۆمانی سیستەمی دیکتاتۆریەتی سیستەمێکی شکلی بووە، وە هەندێ لەدام و دەزگاکانی دەوڵەت بەشێوەیەکی کاتی هەڵوەشانەوە. بەم شێوە چەمکی دیکتاتۆریەت بزر بوو لە بەکارهێنانیدا تا سەدەی بیستەم.

٤. دیکتاتۆریەتەکانی سەدەی بیست و زیندووکردنەوەی ئەو زاراوەیە، بەڵام بەچەمکێکی نوێیەوە.

* لێرەدا پێویستە ئەو ڕاستیە بزانین کە لە کۆندا وشەی دیکتاتۆر بە مانایەکی باش بەکار دەهات نەک بەخراپی، دواتر بە مانایەکی خراپ لێکدەدرایەوە وەک لەم چەند دە ساڵەی دواییدا بڵاوبۆوە بەتایبەتیش لەدوای جەنگی جیهانی یەکەمەوە بەکار دەهات لەوڵاتە دیموکراسیە ڕۆژئاواییەکاندا، بەڵام زاراوەی دیکتاتۆریەتی پرۆلیتاریا بەکار دەهات لەلایەن وڵاتانی بلۆکی سۆسیالیستیەوە لەدوای جەنگی جیهانی دووەمەوە و دواتر بووە (دیموکراسیەتی گەلی)، بەم شێوەیە چەمکی دیکتاتۆریەت گۆڕدراو گەشەی کرد لەگەڵ زەمەندا و وەک زاراوەیەکی چەوسێنەر و دەسەڵاتی ڕەهای لێهات و چەمکێکی خراپی وەرگرت. هەندێک دەڵێن : لەماوەی ٢٠٠٠ ساڵدا چەمکی دیکتاتۆر و سیستەمی دیکتاتۆریەتی نەما، هەتا کارل مارکس هات کە یەکێکە لەو کەسە یەکەمانەی کە ئەم زاراوەیەی جارێکی تر بەکارهێنایەوە لەساڵی ١٨٥٠ دا و بەمانای هێز بەکار دەهات هاوشان لەگەڵ شۆڕشدا نەک زوڵم و زۆر و چەوساندنەوە.

لە کۆندا تاکێکی دەسەڵاتدار یان سەرکردە و ڕابەرێک دەشێت ببونایە بە دەسەڵاتدارێکی سەرکوتکەر، بەڵام دیکتاتۆر نەبوون، نا لەبەرەوەی کە سیستەمێکی کۆماری دیکتاتۆری و ڕۆمانی هەبووە، بەڵکو لەبەر ئەوەی زاراوەی دیکتاتۆر مانایەکی خراپی نەبووە و بەمانای سیستەمێکی زوڵم و سەرکوتکەر نەهاتووە، لەبەر ئەوە دیکتاتۆریان دانەناوە بەتاکێکی سەرکوتکەر.

زاراوەی دیکتاتۆریەت لەدوای بزربوونی ئەو ماوە دوور و درێژە و گەڕانەوەی و بەکارهێنانی لەناو دام و دەزگا ئەورووپیەکاندا، لەڕووی تیۆریەوە پشتی بەستۆتە سەر دیموکراسیەتی ئیغریقی و کۆماری ڕۆمانی کە هەردووکیان ڕووخان و لەجێگەیاندا سیستەمی ئیمپڕاتۆریەتی (پاشایەتی) دامەزرا.

هەندێک دەڵێن : ((یەکەم جار کە زاراوەی دیکتاتۆر بەمانای خراپی بەکارهات لەسەردەمی شۆڕشی فەرەنسیدا بوو کە دژی ڕۆبسپێر و هاوەڵانی بەکاریان دەهێنا)). لەسەدەی نۆزدەهەمدا زاراوەی ((بۆناپارتی)) بۆ دەسەڵاتداری ڕەها بەکار دەهات لەجیاتی زاراوەی دیکتاتۆریەت، بۆیە ئەم زاراوەی دیکتاتۆریەتەی ئێستا ناگەڕێتەوە بۆ سەردەمی شۆڕشی فەرەنسی، لەئێستادا دەشێت دەسەڵاتی تاک سەرکوتکەر بێت، بەڵام هەرگیز دیکتاتۆر نیە. لە ئەنجامی هەرەس هێنان و نەخۆشکەوتنی ئیپمراتۆریەتە سەرکوتکەرەکانەوە و دەرکەوتنی کۆمارەکان ئەم زاراوەیە بەکارهاتووە، ئاشکراشە هیچ کاتێک نەبینراوە کە دیکتاتۆرێک بەخۆی بڵێت دیکتاتۆر. تا ئێستا هیچ کۆدەنگیەک نیە لەسەر دیاریکردنی یەکەم دیکتاتۆر لە مێژوودا، هەرچەندە هەندێ کەس کرۆمیل یان ناپلیۆن بە دیکتاتۆر دادەنێن.

## چ جۆرە سیستەمێک دیکتاتۆریەتە؟

لە گرنگترین و دیارترین سیفاتەکانی سیستەمی دیکتاتۆریەت بریتیە لە :-

* قەدەغەکردنی ئازادیە گشتیەکان.

* دەستبەسەراگرتنی سەرجەم دام و دەزگاکان (سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتی و زانستی و فەرهەنگی و ..هتد).

* هێزی چەکدار و سوپا .

* دام و دەزگاکانی ڕاگەیاندن.

لە ئەنجامی دارمانی سیستەمی دیموکراسی دێتە دی کە بەهۆی هۆکاری ئابووری یان کۆمەڵایەتیەوە یان لەکاتی تێکشکاندێکی گەورەی سەربازیەوە سیستەمە دیموکراسیەکە دەڕووخێت. بەشێوەیەکی گشتیش هەموو سیستەمێک دەبێتە دیکتاتۆریەت کە دیموکراسی نەبوو، هەروەها پشت ئەستور نەبوو بەدەستور و تەنها پشت دەبەستێتە سەر هێز و داپڵۆسین و سەرکوتکردن. بەهەمان شێوە هەر سیستەمێک پشتی نەبەستە سەر دیموکراسیەت بەدڵنیایی دیکتاتۆریە، یاخود نەبوونی کەشو هەوایەکی دیموکراسی بۆشایی دروست دەکات بۆ سەرهەڵدانی دیکتاتۆریەت.

### سیستەمە دیکتاتۆریەکان

لە نێوان دوو جەنگی جیهانیدا هەندێ سیستەم دەرکەوتن کە لەلایەن لیبراڵیەکانەوە پێیان دەوترا دیکتاتۆریەت وەک سیستەمی فاشی لە ئیتاڵیا و نازی لە ئەڵمانیادا و سیستەمی کۆمۆنیستی لەیەکێتی سۆڤیەتدا، چونکە سیفاتی تاک حیزبی و پڕکردنی جەماوەر

بەئایدۆلۆژیای تاک حیزب و کۆنترۆڵکردنی دام و دەزگاکانی ڕاگەیاندن و گۆڕینیان بە زورناژەنی دەسەڵات و ئاراستەکردنی چالاکیە ئابووری و کۆمەڵایەتیەکانی جەماوەر بە بەرژەوەندی حیزب و بەکارهێنانی هێز و داپڵۆسین لەپێناو تۆقاندنی هاوڵاتیاندا. لەدوای جەنگی جیهانی دووەمیشەوە دیکتاتۆریەت بووە سیمایەکی دیار لە زۆربەی وڵاتەکانی جیهانی سێدا کە تازە سەربەخۆییان وەدەست هێنابوو کە زۆربەیان سیمای سەربازیان لەخۆ گرتبوو.

لێرەدا پرسیاری گەورە ئەوەیە کە ئایا دەسەڵاتی کوردی چ سیمایەکی پێوە دیارە؟ سیما و ڕوخسار و ناوەڕۆکی دیکتاتۆریەت یان دیموکراسیەت؟ ئایا دەسەڵاتی کوردی لەماوەی ٢٧ ساڵی تەمەنیدا بەڕاستی هەوڵی چەسپاندنی سیستەمێکی دیموکراسی داوە؟ یان هەنگاو دەنێت بەرەو دیکتاتۆریەت؟

بۆ وەڵام دانەوەی ئەم پرسیارانە کەمێک دیقەت و ویژدانیشی دەوێت بۆ بڕیاردان لەسەر دیموکراسیەت بوون یان دیکتاتۆریەت بوونی دەسەڵاتی کوردی. بڕیاردانیش لەسەر بەرنامە و دروشم و گوتار نابێت، بەڵکو لەسەر کار و جێبەجێکردن و پیادەکردن و هەڵسوکەوت و سلوکی ڕۆژانەی دەسەڵات و سیستەمەکە دەدرێت.

ئاشکراشە تەمەنی دەسەڵاتی کوردی ٢٧ ساڵە کە تەمەنێکی کەم و کورتە بۆ تێگەیشتن و چەسپاندن و پیادەکردنی دیموکراسیەت بەڕاست و دروستی و دانان و دامەزراندنی سیستەمێکی کامڵ و پێگەیشتوو، چونکە بۆ خۆی دیموکراسیەت لەگەڵ قۆناغەکانی گەشەکردنی کۆمەڵگادا و گۆڕانی زەمەن و زەمینە جیاوازەکاندا دەگۆڕێت و گەشە

دەکـات، بـۆ چەسـپاندنی دیموکراسـیەت وەک سیسـتەم و وەک دام و دەزگـاش پێویسـتە کـەش و هـەوای دیموکراسـی هـەبێت لـە ئاشـتی و ئارامی و نەبوونی جەنگ و هۆشیاری سیاسی و گەشـە و پێشـکەوتنی کۆمەڵگا لە هەموو بوارەکاندا و بوونی یاسا و دەستور و پەرلـەمان و حکومەت و پاراستنی مافەکانی مرۆڤ و بوونی ئازادیەکان و یەکسانی و ...هتـد. کـە لـە کوردسـتاندا ئەگـەر ئـەو کـەش و هەوایـەش هـەبوبێت دوور و درێژ نـەبوە و هەمیشـە لەبـەردەم هەڕەشـە و پیلانـی ناحەزانـدا بووە و شـەڕی نـاوخۆ و خراپی بـاری ئـابوری و کۆمەڵایـەتی و ...هتد. ڕێگربـوون لەبـەردەم چەسـپاندنی ڕاسـت و دروسـتی دیموکراسـیەتدا. بارودۆخـــە نـــاوخۆیی و ناوچـــەیی و دونیاییەکـــەش لەبەرژەوەنـــدی گەشەکردن و چەسپاندنی دیموکراسیەتدا نەبوون لە کوردستاندا، لەگەڵ ئـــەوەی کـــە چ دەســـەڵات و چ کۆمـــەڵگای کـــوردەواریش تینـــووی دیموکراسـیەت و ئازادیـەکان بـوون. هـەر بۆیـە نـەتوانراوە کـە بناغـە و بنچینەیـەکی ڕاسـت و دروسـت دابمـەزرێت بـە مەبەسـتی چەسـپاندنی سیسـتەمێکی دیموکراسـی لـە کوردسـتاندا، هەرچەنـدە هەوڵـەکان بـەو ئاڕاسـتەیە نـراون لەگـەڵ کـەموکوڕی و ڕێگریەکانـدا، بـەڵام بەداخـەوە نەتوانراوە هەوڵەکان چڕ و پڕ بکرێنەوە و نیەتـەکانیش ئاشـکرا و ڕوون و شەفاف بن بەو ئاڕاستەیە. بۆیە لـە ئێسـتادا و دوای ٢٧ سـاڵ تەمـەنی دەسەڵاتی کوردی و چێژ وەرگرتنی هەردوو پارتی دەسـەڵاتدار (پارتی و یـەکێتی) و سـەرکردەکانیان و کـەمێکی زۆر کـەم لـە ئەنـدامانیان لـە پۆسـت و پلەوپایـە و ئیمتیازاتـەکانی دەسـەڵات دەسـتیان کـردوە بەهـەنگاونان بـەرەو دیکتاتۆریـەت و قـۆرخکردنی دەسـەڵات و قەدەغـەکردنی ئازادیـەکان و بـەکارهێنانی زمـانی زبـر و هەڕەشـە ئـامێز

نەک تەنها لە میدیاکان و ڕۆژنامەنووسان و کۆمەڵە و ڕێکخراوەکانی کۆمەڵگای مەدەنی، بەڵکو تەنانەت لە پارتە سیاسیەکان و دادوەران و ئەندامانی پارتەکانی خۆشیان. لە ڕێگەی سزادان و گرتن و هەڕەشەلێکردن و چاو سوورکردنەوە و دانانی دادگای تایبەتی و پێشێلکردنی یاساکان و دەستور و ڕەفتارکردن لەپێناو بەرژەوەندی تاکەکەس و گروپ و بنەماڵە و ...هتد، هەروەها قۆرخکردنی سەرچاوەکانی داهات و ئابوری و بازرگانی و بازاڕەکانی کوردوستان و کۆنترۆڵکردنی هێزی سەربازی و چەکدار لە کوردوستاندا کە هەموو ئەم کارانەش دەچنە چوارچێوەی لەگۆڕنانی دیموکراسی و هەنگاونان بەرەو دیکتاتۆریەت.

نوێترین نموونەش لەسەر هەڵسوکەوت و هەنگاونانی سەرکردە و ڕابەرانی ئەو دوو پارتە دەسەڵاتدارە بەرەو لە قاڵبدانی ئازادیەکان و بەرتەسکردنەوەی ڕەخنە و ڕادەربڕین و ئازادیەکان، گشتاندنێکی سکرتێری گشتی یەکێتیە بۆ ئەندامانی حیزبەکەی کە هەڕەشەی سزادان و دادگای تایبەتیان لێ دەکات لەسەر ڕەخنەگرتن لەیەکێتی لە دەرەوەی ئۆرگانەکان و لەسەر پەڕەی ڕۆژنامەکاندا. هەروەها هەڕەشەی مەکتەبی سیاسی پارتی و سکرتێری مەکتەبی سیاسیانە لەپارتە سیاسی و سەرکردەکانیان و هەر کەسێک کە ڕەخنە لەحکومەت و ئەندامانی حیزبیان بگرێت بەزمانی زبر و ناوزڕاندن.

بۆیە بە دڵنیایی لەغیابی کەش و هەوای دیموکراسیدا، دیکتاتۆریەت سەر هەڵدەدات و هەنگاوی یەکەمیش لەنێو خۆی حیزبە دەسەڵاتدارەکانەوە دەست پێدەکات و دواتر هەنگاو بەهەنگاو بەرەو

قەدەغەکردنی کاری حیزبی و سیاسی و مەدەنی و ڕۆژنامەی ئازاد و دواتر بەکارهێنانی هێز و تۆقاندن و گرتن و ڕاوەدونان و قۆرخکردن و کۆنترۆڵکردنی هەموو بوارەکانی سیاسی و ئابووری و زانستی و کۆمەڵایەتی و سەربازی... هتد دێن و بەمەش سیستەمێکی دیکتاتۆری دادەمەزرێنن و ئیدی مانای ژیان و پێشکەوتن و گەشەکردن نامێنێت لەکۆمەڵگادا. بەهیوای ئەوەی کە دەسەڵاتی کوردی زیاد لەوەی ئێستا پیادەیان کردووە هەنگاو نەنێت بەرەو دیکتاتۆریەت، چونکە ئەنجام بێزار بوون و تورەبوون و تەقاندنەوەی جەماوەری بەدواوە دێت کە ئەنجام ڕووخان و هەڵتەکاندنی ئەو سیستەمەی لێدەکەوێتەوە هەروەک سیستەمە دیکتاتۆریەکانی دونیا و هەرە نزیکەکەشیان ڕژێمی بەعسی سەدامی بوو کە لەئێستادا یادی ١٥ ساڵەی لەگۆڕنانی ئەو ڕژێمە دەکەینەوە.

## پێناسەی ئەو ریفراندۆمەی کە بۆ کوردستان بەرهەمدارە:

لە کۆتاییدا هەمو لایەک ئەو پرۆسەیان دەوێت کە لە ( دەوڵەت بوون بۆ کوردستان ) نزیک دەبێتەوە، لە چوارچێوەی مافی میللەتان بۆ مافی چارەنووس بەدەستی خۆی، ئەو مافەش مەرج نیە هەر بەرێگای ریفراندۆم بێ، ئەو کاتە ریفراندۆم پێویست دەبێت ئەگەر هەموو لایەنەکانی (دۆزی کورد ) لە سەری رێک بکەون، واتە بەلایەنی کەمەوە (کورد و عێراق ) یان زیاتریش نەتەوەیەککرتوەکانیش بەشداربن، جگە لەوە ڕیفراندۆمی بێ ئامانج و عەبەسی و باتیلە، پووچە (trivial)، خۆماندووکردن و کات بە فیرۆدانە.

## جۆرەکانی ریفراندۆم و ریفراندۆمی کوردستان

زۆر جۆرە ریفراندۆم هەیە لە ئەزموونی دەوڵەتان و میللەتان کراوە، ریفراندۆمی ( ئیلزامی – ئیختیاری– ئیستشاری– سیاسی – دەستوری– تەشریعی...) لەو دەمە نمونەی تورکیا ئەنجامدرا لەو رۆژانە، یان بەریتانیا بۆ دەرچوون لە یەکێتی ئەوروپی، یان ریفراندۆم بۆ بەرجەستەی دەستورەکان، یان ڕاپرسی لەسەر هەر دۆزێک کە بە یاسا یەکلا نابێتەوە ..هەمو ئەوانە ئەوەندە لە ئەزمونی کوردستان نزیک نینە، جۆرێکی تریش هەیە لە ریفراندۆمی سەربەخۆیی وەک جیابوونەوەی سلۆڤینیا لە یۆگوسلاڤیا سالّی 1990،تەتەرستان لە روسیا سالّی 1991 ،کرواتیا و دوای بۆسنەو هەرسەک لە یۆگوسلاڤیا لەسالّی 1992، مەقدۆنیا و جۆرجیا وئۆکرانیا و مۆنتینیگرۆ لە سربیا سالّی 2006 ، دوای چیک و سلۆڤاکیا دابەشبوون ، زۆری تر، جاریش وابوە ریفراندۆم سەرکەوتوو نەبووە وەک ئەوەی لە کیبیک کرا سالی 1999 ڕێژەی 51% داوای

مانەوەيان كرد و جيا نەبوونەوە، ئەوانە كەمێك نزيك ترن لەدۆخى قانونى كوردستان، ڕيفراندۆمى كوردستان بۆ سەربەخۆييە لەو جۆرانە نزيكن كە ميللەتانى بێ دەوڵەت كردوويانە بۆ بەدەوڵەت بوون، سەربەخۆبوون، ئەويش زياتر لە( مافى چارەنووس ) باس كراوە و لە ئەزمونەكانيش بەرجەستە كراوە، بەگشتى دوو بەشە:

**يەكەميان** بۆ ئەوانەى پێيان دەوترێ (اقاليم الاستعماريه – بەپێناسى بڕيارى 1467 جمعية العامة ، لە بەندى 13 ى ميساقى نەتەوە يەكگرتوەكان ( مادەى73 و74) وەسفى ياساييان دەكا، بۆ ريفراندۆميش لە بڕگەى (ب)ى مادەى 76 ى ( بەندى13 ) هەمان ميساق هاتوە، بە ڕاستەوخۆتر لە ( بنەماى7 ى) بڕيارڕى نەتەوە يەكگرتوەكانى ژ: 1467 خولى: 14 ى ساڵى1959 هاتووە، ئەوانەن كە لەلايەن ئيستعمارى كۆن داگيركراوە، كۆمەلێك بڕيارێيشيان بۆ دەرچووە لەهەموان ڕوونتر بريارى 1514ى ئەنجومەنى ئاسايشە، چەندين بڕيارى تر دەيان گرێتەوە، كە بە (مافى چارەنوس) ناوزەد دەكرێت.

**دووەميان** بۆ ئەو ميللەتانەى كە داگيركراون لەلايەن دەوڵەتێكى محەلى، وەك نێوانى ئەريتريا و ئەسيوپيا، خواروى سودان و سودان، تەيمور و ئەندۆنوسيا، كۆسوڤۆ و سربيا، كشمير وهند، هەر چوار پارچەى كوردستان و وڵاتانى سەردەستەيان ... زۆرى تر.

ئەو دوو دۆسيەيە (يەكەم و دووەمى سەروو)لە ياساى نێودەوڵەتى زۆر لێكجيايە، بەداخەوە لە كوردستان لەلايەن سەركردايەتى و بەشێكى زۆرى تر خراپ تێكەڵ كراون، ئەو ڕيفراندۆمەى وا باس دەكرێت لە چوارچێوەى ئەو هەڵە تێگەيشتنەيە، لە يەكەما ( واتە هەرێمەكانى سەر بە ئيستعمار ) مافى چارەنووس بە هەموو بڕيار و ڕێكەوتننامە دەوليەكان

دەیان گرێتەوە، بۆیە وەک دۆزێکی ڕەوا لە جیهان باس دەکرێت و بڕیاری (1514) ناوی نرا ( تصفيه الاستعمار ) کۆتایی هات میللەتانی ژێر دەستی ئیستیعمار دەتوانین بڵێین نەما، یان سەربەخۆیی وەرگرتووە یان خۆی داوای مانەوەی کردووە، یان بە مۆلەقە ماونەوە وەک:

کورسیکا لەگەڵ فەرەنسا، باسک لەگەل ئیسپانیا، هەندێ دورگەی تر ناتوانن بکەونە سەر پێی خۆیان، بۆ ئەوانە ریفراندۆم ئۆتۆماتیکی هەیە، هەرچی دووەما زیاتر کێشەکانی جیهانی نوێ پێک دەهێنێ کە دۆزی کوردستانیش لەوێ خۆی دەبینێتەوە، زیاتر یاساناسانی نێودەولەتی ناویان ناوە ( حق الانفصال secession ) پێ ی نالێن (حق تقرير المصير – مافی چارەنووس Self Determination یان independence) بەڵکو دەڵێن مافی جیابونەوە، هەردوو لای یەکەم و دووەم مافیانە، بەڵام ڕێڕەوی یاساییەکەی جیایە،(مافی جیابونەوە)یەکلایەنی نیە، (هەروەک) دۆسیەی کۆسۆڤا لەدادگای لاهای ئەو ناوەی هەلگرتبوو (بڕوانە جەلسەی 120 ی خولی: 64 ی کۆمەڵەی گشتی ڕۆژی 2010/9/9 ) دەقەکەی (کە بەپێی بەڵگەنامەی (7/Rev.96S/) عەرەبیش بەدەق هەژماردەکرێ لە نەتەوە یەکگرتوەکان: (أن الانفصال من جانب واحد لايمكن أن يكون وسيلة مقبولة لتسوية المنازعات الإقليمية. الا فی الحالات التی حددتها الجمعية فی جلسة(١٢٠) لعام (2010) ئەویش بریتیە لەو 3 مەرجەی بۆ سەربەخۆیی کۆسۆڤا هات لەدادگای لاهای لە – لە خواروو باسکراوە ئەو کاتە پێی دەووترێ(حق انفصال علاجي) واتە بە تەنها ناتوانی بڕیار لە مافی چارەنووسی خۆت بدەی وەک ئەوەی لە ( اقاليم الاستعمارية )ڕوویدا، دەبێت تێکۆشینی هەمە لایەنە بکەی بۆ ئەوەی بتوانی لە( مافی جیابوونەوە) خۆت وەرچەرخێنی

بۆ( مافی چارەنووس)، تا ڕادەیەک کۆنگرەی ڤیەننا کە لە ١٤-١٩٩٣/٦/٢٥ یارمەتیدەرە و بۆیەکەم جارە ئاماژە بەمیلەتانی بەشی دووەم دەدا لەو پەرەگرافەی: ( للشعوب الخاضعة للسيطرة الاستعمارية أو غير ذلك من أشكال السيطرة الأجنبية أو الاحتلال الأجنبي).

کاری میلەتانی بەشی دووەم زۆر قورسە، هەر بە قسە و ڕاگەیاندن نیە بەڵکو کاری ناوەکی و دەرەکی پێویستە، لەناوەکی بینای دەولەت بکەی لە سیستەمی یاسایی و ئابوری و سیاسی و ئیداری و مرۆیی، لەدەرەوەش کار لەسەر یاسای نێودەولەتی بکەی بۆ ئەوەی لە نەتەوەیەکگرتوەکان ناوی میللەتەکەت بە (شەعب) تۆمار بکەی تا مەرجەکانی مادەی یەکەمی( کۆنگرەی مۆنتیڤیدیۆ بیگرێتەوە دەقەکەی:

(The state as a person of international law should possess the following qualifications: a ) a permanent population; b ) a defined territory; c ) government; and d) capacity to enter into relations with the other states).

چونکە تائێستا کورد بە دانیشتوان وهاولاتی تۆمارە لە نەتەوەیەکگرتوەکان نەک گەل وەک لەهەردوو بڕیاڕی 688 و 986 بە ڕووونی هاتووە، ئینجا پێویستە لە تۆماری نەتەوەیەکگرتوەکان (حرکە الوطنيە)هەیە بە پێی ماددەی(٧٤)ی( نظام الداخلی للمجلس الاقتصادی والاجتماعی) ئینجا بڕیاڕی(١٦٥٤) سالی 1961 لە خولی ژ 16 :ی د 59 : خۆت تۆمار بکەی، تا ڕادەی بەشداری لە( نەتەوە یەکگرتووەکان ) ئەندام بیت بە سیفەتی چاودێر، بۆ ئەوەی دۆسیەت هەبێت لە نەتەوەیەکگرتوەکان ... سەرکردایەتی کورد هێشتا ئەوانەی نەکردووە.

ئەوانەی بەشی دووەم بە ڕێگای جیاجیا گەیشتون بە سەربەخۆیی، مەرج نیە ریفراندۆم تاکە ڕێگابێت، ئەنگۆلاو مۆزەمبیق و پیشووتر سەربەخۆیی وولاتانی رۆژهەلاتی ناوەراست و زۆری تر بێ ریفراندۆم بووە، ئێستاش کێشەی نێوان ئیسرائیل و فەلەستین ریفراندۆمی پێویست نیە، کوردستانیش ریفراندۆمی پێویست نیە چونکە تاریخ و جوگرافیا و 100سالی خەبات وەلامی ئەو پرسیارەی بۆ هەموو جیهان دایتەوە ئاخۆ چی دەوێت، زیاتر ئەو میلەتانە پێویستیان بە ریفرۆندامە کە گومان لە ئیرادەی میلەتەکە هەیە بۆ سەربەخۆیی.

**تێبینی** : جۆرێکی تریش هەیە لە ریفراندۆم لە نێوان توخمە بنچینەییەکانی دەولەتی تەوافوقی وەک ئەوەی لە نێوان چیکوسلوڤاکیا کرا و لێکجیابوونەوە، بەلام مانای قانونی تەوافوقی لەوێ زۆر جیایە لەوەی لەکوردستان خۆبەخۆو لە عێراقیش خۆبەخۆ باس دەکرێ.

**ئەزموونە نوێیەکانی میلەتانی بەشی یەکەم:**

چەند ئەزمونێک ڕێنیشاندەرێکی باشە بۆ هەر ڕێفرۆندامێکی ڕاستەقینە لەکوردستان بیکەین، لەوانە (ئەریتیریا – تەیمور –خواروی سودان –کۆسۆڤۆ )... هەریەکە لەگەل دەولەتە داگیرکەرەکە ڕێکەوتنیان کرد ، لە ڕیفرۆندامی جەزائر دەست پێدەکەین بۆ سەربەخۆیی کە بە پێی ڕێکەوتنی ئیڤان سالی1962 هاتەدی لە نێوان بەرەی رزگاری جەزائر و دەولەتی داگیرکەری فەرنسی ، ئەریتریا ریفراندۆمی کرد، لە ئەنجامی ریکەوتنی نێوان( الجبهة الشعبية لتحرير ارتريا ) و حکومەتی نوێی ئەسیوبیا لەسالی1991 ، ڕیکەوتنی نێوان تەیمور بەسەرۆکایەتی (جۆسماو )و ئەندۆنیسیا بە ئامادەبوونی نەتەوە یەکگرتوەکان بوو لە سالی 1999 ،جۆری پرسیارەکەش ئەوەبوو (ئۆتۆنۆمی یان سەربەخۆیی)

لە ١٩٩٩/٨/٣٠ریفرادۆمەکە کرا لە % 80 داوای سەربەخۆییان کرد، بووە شەڕ دوای هاتنی هێزی دەولی لە 2002 سەربەخۆییان وەرگرت.

کێشەی(سەحرای غەربی ) زۆر تایبەتە چونکە شێوەیەکە لە یەکەم و دووەم ، لەژێر دەستی ئیسپانیا بوو، لەساڵی 1976 جاڕی سەربەخۆیی داوە، بەلام یەکلایەنە سەرکەوتوو نەبوو زۆر ئالۆزتری کرد، مەغریب و مۆریتانیاش داوایان دەکردەوە ، بەرەی پۆلیسارێۆش داوای سەربەخۆیی دەکرد ،ئەو دۆسیەیە چووە

دادگای لاهای ، ئەویش وەلامی بەوە دایەوە کە شمولی بڕیاڕی 1514 دەکات واتە سەربەخۆیی )، ئیسپانیا ریکەوت لەگەل پۆلیساریۆ لە سالی 1975کە بە ناوی رێکەوتنی مەدرید ناوزەد دەکرێت، کشایەوە، بەپێی بریاری 1514 نەتەوە یەکگرتوەکان ڕێی ڕیفرۆندامی پێداوە ، دوای ئەوەی زیاتر لە 70 وولاتیش دانیان پێدا هێنا ئینجا شای مەغریبیش هاتە ڕایێ ،بەلام هەروا مەغریب کێشەی بۆ دروست دەکا نەکراوە.

خوارووی سودان ریکەوتنی نیڤاشیا بریاری ژ 1590 :ماددەی 4 لەنەتەوە یەکگرتوەکان دەرچوو بۆ ریفراندۆمی خوارووی سودان، بڕگەی (أ و ها )لە بەندی (٣) پرۆتۆکۆلی( مشاکۆس )تیایدا دوای 6 سال ریفراندۆم بکرێت لە ماددەی(٢٢٥)ی دەستوری سودانیش ئەو ڕیکەوتنە تۆمارکرا، دوای کرا و سەربەخۆییان وەرگرت، تەنها کۆسۆڤۆ بەو شێوەیە نەبوو، بەڕێکەوتن نەبوو لەگەل سربیا، بەڵام ئەوکاتە کردیان کە سربیا کەوتە ژێر بەندی(٧) ی میساقی نەتەوە یەکگرتوەکان ، هاوپەیمانان پشتیان گرت و ریفراندۆمەکی یەکلایەنی کرد، سربیا قایل نەبوو دۆسیەکە چووە لای دادگای لاهای ناچار ئەو پشتیوانیە دەولیە تەنها

توانی لە دادگای لاهای( محكمة العدل الدولية )لە ٢٠١٠/٧/٢٢ یەکلا بکرێتەوە، بەو شێوەیەی خوارەوە بوو:

بەپێی بڕیاڕی ( الجمعية العامة– د 64 :بند٧٧ ٨ سبتمبر ٢٠١٠) دۆسیەی کۆسۆڤاچوە دادگای لاهای ئەوەش دەقی وەلامی دادگایە (: أعلن هيساشي اوادا رئيس محكمة العدل الدولية في قصر السلام في لاهاي إن المحكمة" خلصت إلى أن " إعلان الاستقلال في 17 شباط/فبراير 2008 لم ينتهك القانون الدولي العام )"بەلام تا ئەو ساتەش نەبۆتە ئەندام لە نەتەوەیەکگرتوەکان.

ریفراندۆمی سێ نموونەی تریش هەیە هەریەکە بەجۆرێک، کبیک و کەنەدا، سکۆتلەندا و بەریتانیا، کەتەلۆنیا و ئیسپانیا ..ئەوانە هەریەکە خوێندنەوەی یاسایی و دیموکراسی خۆی هەیە، زۆر جیایە لەگەل دۆخی یاسایی کوردستان ، جیاوازیەکە لەوە دێت ئاستی دیموکراسی بەریتانیا و کەنەدا لەگەل ئاستی دیموکراسی و بەرپرسیاریەتی عیراق زۆر لێکدوورن ، دۆزی گەلی فەلەستین ریفراندۆمی ناوێت دانی پێداهێنراوە گەلی فەلەستین، ئیسرائیلیش بە( داگیرکەر )تۆمارکراوە..

**لەوانەوە چەند خاڵێكی گرنگمان دەست دەكەوێت بۆ ئێستای كوردستان:**

١. رێفراندۆمەكانی هەرێمە ئیستعماریەكان جیان لەگەل ئەو میلەتانەی لە ژێر دەستی وولاتێكی وەک ئەسیۆبیا و ئەندۆنیسیا و عیراقدایە.. ئەوانەش لەگەل ئەزموونەكانی نێوان(كیبک وكەنەدا،سكۆتلەنداو بەریتانیا).

٢. زۆربەی دەولەتانی جیهان هاندەری هەرێمە ئیستعماریەكانن و میلەتانی ژێر دەستی ئیستعمار بۆ سەربەخۆیی، بەلام ئەو سۆزیە بۆ میلەتانی(بەشی دووەم )زۆر كەمترە، ئەوەندە پێی مورتاح نین، لەزۆربەی بڕیارەكانی مافی چارەنوس بۆ میلەتانی بەشی یەكەم بڕگەیەكی تێدایە كە داكۆكی لەسەر سیادە و یەكپارچەیی دەولەتان دەكاتەوە( لەخوارەوە زیاتری باس دەكەین).

٣. ئەوجۆرە میلەتانە ناتوانن ریفراندۆم یان هەر جۆرە بڕیارێكی یەک لایەنی لەبارەی چارەنووسی خۆی بدات، مادام ئەو وبریارە زەوت كراوەو كەوتۆتە دەست ولاتێكی تر خاوەنی سیادەیتی(sovereignty)، ئەو كاتە دەكرێت كە خاوەنی سیادە( واتە دەولەتە داگیركەرەكە – سەردەستەكە ) رەزامەندی فەرمی لەسەر بدات.

٤. هەمو ئەو رێفراندۆمانەی كراوە لە رێگەی ریكەوتنامەی فەرمی بووە لەگەل خاوەنی سیادە.

٥. ریفراندۆمەكان لەدوای ریكەوتن هاتووە نەک لە پێشی.

٦. رێفراندۆم كردن بۆ دانوستان و گفتوگۆ نیە بەلكو لەدوای گفتوگۆ و دانوستان وەک دوا هەنگاو دیێت ، هەنگاوی یەكلاكەرەوە.

٧. هیچ ریفراندۆمێک نەكراوە بێئامانج عەبەسی بلێی ریفراندۆم دەكەم وەک كارتەک لەدەستم تا جیهان بزانی میلەتەكەم چی دەوێت ئەوە نەبووەوە نەكراوە.

٨. زیاتر ئەو میلەتانە بەرەو ڕیفراندۆمن کە گومان لە ئیرادەی سەربەخۆ بوونیان هەیە، ئەو گومانەش داگیرکەرەکە دەیچێنی، بۆیە نابێت سەرکردایەتی میلەتەکە خۆی داوای ریفراندۆم بکات.

## ریفراندۆمی کوردستان

مەلەفی یاسایی کوردستان بەگشتی و هەرێمی کوردستان زیاتر دەکەوێتە پۆلی دووەمی ( ئەوەی لەسەروو )باسمان کرد، واتە( مافی جیابونەوە) ، هەرچەندە کوردستان وەک فەلەستین و ئەریتیریا و کۆسۆڤۆ ..نیە، مەلەفە مێژوویی و جوگرافی و نییشتیمانیەکەی زۆر بەهێزە، بەلاّم نەکراوەتە بە مەلەف و بەکاربهێندرێت، بەهەولێکی کەم دەتوانرێ مەلەفە یاساییەکەی لە( مافی جیابونەوە ) وەرچەرخێنێت بۆ (مافی چارەنووس ) ئەوکاتە پێویست بەوە دەکات:

١. هەنگاوی یاسایی بۆ وەرچەرخاندنی( مافی جیابوونەوە )بۆ( مافی چارەنوس )بریتیە لە دروست کردنی مەلەفێکی قانونی( کە لە: الملف القانونی لحق تقریر مصیر کوردستان وفق قوانین الدولیە)

بۆ ئەو وەرچەرخاندنە سود لە ڕێکەوتنی نێوان( دەولەتی سودان و جنوب سودان) – پرۆتۆکۆل مشاکۆس بکەن کە تیایدا دان بەمافی چارەنوس نرا بۆ ریفراندۆمێک، ئیتر دۆسیەکە لە(مافی جیابوونەوە وەرچەرخا بۆ مافی چارەنوس )و لەدەستوری سودان مادەی (219 و 222 ) تۆمارکرا.

٢. شەرم نەکات کە خۆی بە( مستەعمەرە )بناسێنێت و دەولەتی عێراق بە (ئیستیعمار )پرۆسەکەش بە داگیرکاری بە پێی بڕیارڕی ژ 2625 :ی خولی 25 ی/ 24 ئۆکتوبەر1970.

٣. زۆر بە ووردی ڕەچاوی ئەو مەرجانەی سەربەخۆی کۆسۆڤا لەلایەن (دادگای لاهای) بکرێت کە لەخواروو تۆمار کراون.

٤. یان بەلای کەم میللەتی کورد بە( شعب)ێکی جیا لە عەرەب لە فەرهەنگی نەتەوەیەکگرتوەکان تۆماربکات، چیتر نەوترێت( سکان الاكراد)، وەک لە ماددەی (١)ی بریاری 688 هاتووە، لەکاتێکا میللەتی فەلەستین و سەحرای رۆژئاوا بە( شعب )ناودەبرێن، لەنەتەوەیەکگتوەکان مافی یاسایی (هاوڵاتی) (سکان –دانیشتوان) گەل – شعب )زۆر لەیەکتر جیایە، کە بووە(گەل ) ئەوا بەپێ ی مادەی(١)ی کۆنگرەی مۆتیڤیدیۆی 1933 بوون بەدەوڵەت دەیگرێتەوە و بەئاسانی دەچێتە ماددەی (١) میساقی نەتەوە یەکگرتوەکان و هەموو ئەو بڕیارانەی بەهۆیەوە دەرچووە، واتە کە دەڵێین مافی چارەنووس پیوەری یاسایی هەیە چ جۆرە میللەتێک دەگرێتەوە، نەک هەموو... ئەوانە هەموو لە پێشن و نەکراون.

٥. ئەو کارانە ئاسان تر بوو لەو سەردەمەی عێراق لەژێر بەندی (٧) بۆ (عیراق بە بڕیاری ژ 2017 ی ئەنجومەنی ئاسایشی لێی دەرچوو)، ئێستا زۆر زەحمەتە چونکە سیادەی عێراق گەڕایەوە بەسەر هەموو خاکی عیراق، بەهەرێمی کوردستانیشەوە.

٦. واتە نە حکومەتی هەرێم نە حیزبەکان خاوەنی سیادەی هەرێم نین، بە پێی یاسای نێودەولەتی دەولەتی عێراق خاوەنە، بۆیە هەر بریارێکی دەسەلاتی کوردی پێ ی دەڵێن یەکلایەنی بەو دۆخەی ئێستای، بەتایبەت

ئەگەر پەرلەمان و دام و دەزگا یاسایی بەکارنەهێنی، بەرگەی تانەیەکی (دادگای ئیتحادی عێراق )ناگرێت.

**ئەو ریفراندۆمەی دەسەڵاتی کوردی دەیکات:**

لە راستیدا تا ئەو ساتە بە ڕوونی دیاری نەکراوە ئاخۆ چیان لەو ریفراندۆمە دەوێت؟ دوایی چی لێدەکەن؟ لێدوانی جیاجیا هەیە، لەسەر هەریەکەیان بەپێی رێکارە یاساییەکانی نێودەولەتی لەسەری دەوەستین:

1-ریفراندۆم بۆ سەربەخۆیی

2-ریفراندۆم بۆ کۆنفیدراڵی

3-ریفراندۆم وەک کارتی دانوستان

4-ریفراندۆم تا بزانین ئەو میللەتە چی دەوێت

5-ریفراندۆمی سەپاندنی ئەمری واقع (دیفاکتۆ)

هەریەکە بە پێی پێویست ڕوونیان دەکەینەوە بە ڕوانگەی یاسای نێودەولەتی:

**1-ریفراندۆم بۆ سەربەخۆیی کوردستان**

ئەوەیان هەموو خەڵکی کوردستان و لایەنە سیاسیەکان لەسەری کۆکن، ئامانجی هەموو شۆڕش و راپەرینەکان لەدوا قۆناغ بۆ ئەوە بووە، جا چ جاڕدرابێت یان شاراوە بێت، ئەوەش پێویستی بە بناغە و دارشتنی یاسایی و سیاسی و کۆمەلایەتی و ئابوری و ئەخلاقی هەیە، ئەو کارە ئەوەندە ئیعلامی و گوتاری نیە، چونکە بە جاڕدان و ڕاگەیاندن دروست نابێت، یاسر عەرەفات لە ساڵی 1988 دوە جاڕی دەولەتی فەلەستینی داوە سەرەڕای ئەو هەموو پشتیوانیە نێودەولەتیە و بڕیاری(٢٤٢) ی نەتەوە یەکگرتوەکان، کەچی چونکە ئامادەکاری نەکردووە سەرکەوتوو نەبوون، بەهەمان شێوە (ئەرزی سۆمال لە سالی 1991 ) دوە ئەو

جارەی داوە بێهودە بووە، لەسالی 1970 ەوە وەک دیفاکتۆ بەنگلادیش سەربەخۆ بوو و جارێشی دا بەلام تاسالی 1974 ریکەوتن لەگەل پاكستان ئینجا وەرگیرا لە نەتەوە یەكگرتوەكان بۆ دەولەت بوون ، واتە ئەو پرسە ووردەكاری ناوەكیی و دەرەكی هەمەلایەنی دەویت، لەپێشدا پێویستە مەلەفێكی( یاسایی و سیاسی ) بۆ دروست بكەی(بڕوانە ئەو مەلەفەی ئێمە : الملف القانونی لحق تقریر المصیر لشعب كوردستان وفق قوانین الدولیە. )

بۆ كوردستان( بە پێی ئەو بارودۆخە قانونیەی ئێستای هەرێم)بەدوو شێوە دەبێت، یان لەرووی قانونیەوە بتوانیٚ لە مافی جیابونەوە خۆت وەرچەرخێنیە( مافی چارەنووس )كە ئەوە راستەقینەیە، وەک لەسەروو باسكرا و عێراقیش بەداگیركەرپۆلین بكەی تا بكەوێتە چوارچێوەی ماددەی (٨) بڕیاڕی (٣٣٣٠- د:٢٢، ١٩٧٧) و، بڕیاڕی 2105 ی نەتەوەیەكگرتوەكان، هەروەها لە بڕیاری ژ 2625 :ی خولی 25 ی 24 /ئۆكتۆبەر1970 / هاتووە، پێ دەچێ ئەوە زەحمەت بێت با هەقیش بێت، بەدیلی ئەوەش گەڕانەوەیە بۆ (مافی جیابونەوە)، ئەوەیان جۆرە ریكاریكی تری یاسای نێو دەولەتی دەوێت، هەرە نزیكەكانی لە دۆزی كورد بریتیە لە(رەهەندە یاسا نێودەولەتیەكەی):

١. بڕگەی (٢)ی ماددەی (١)ی كۆنگرەی ڤیەنای سالی1993 .

٢. ئەو دۆسیە قانونیەی كۆسۆڤا و وەلامی دادگای لاهای بۆ نەتەوەیەكگرتوەكان كە لە بڕگەی 81 ی فتوا یاساییەكەی دادگای رۆژی ٢٠١٠/٧/٢٢ هاتبوو.

٣. ئینتما كردن بۆ هەردوو لیژنەی( لیژنەی دەولی بۆ مافی چارەنوس بە پێی راسپاردەی خولی 16 ی (جمعیە العامە)ی سالی 1961 ، هەروەها

لیژنەی( الحرکه الوطنیه)کە لە مادەی (٧٤)ی پەیڕەوی ناوخۆی (مجلس اقتصادی واجتماعی )نەتەوە یەکگرتوەکان هاتووە.

هەمو ئەوانە ساناتر بوو لەو فەترەیەی (١٩٩٠-٢٠١٣) عێراق لە ژێر بەندی (٧) بوو زۆرجیایە لەگەل ئێستا، کاتێک عێراق بە پێی بڕیاڕی(661) کەوتبووە ژێر بەندی (٧) نزیکەی (٦٥) بریاری لەسەر دەرچوو بوو، خاوەنی سیادەی تەواوی عێراق نەبوو، بەتایبەتی کوردستان بەهۆی دوو بڕیاڕی گرنگ بوار هەبوو سودی لێوەرگیرێت بەو ئاراستە قانونیە، بریاری 688 و بریاری 986 ، ئەویش ئیشی دەویست ئەگینا لە خودی ئەو دوو بڕیاڕەش باسی سیادەی عیراق لەو ناوچانەدەکا، بەلام گرنگ ئەوەیە سیادەکە لەدەست نەتەوە یەکگرتوەکانە وەک لەو دوو بڕیارە هاتووە، دوای ئەوەی عێراق بەپێی هەردوو بڕیاڕی 2299 ی و بریاری (ژ2017 : لەبەندی (٧) دەرچوو، ئێستا خاوەنی سیادەی هەموو عێراقە وەک لەدەستپێکی بڕیاڕەکە(2299) باس لە گێڕانەوەی سیادە دەکا، واتە بەپێی قانونی دەولی ئێمە لەکوردستان( یان حکومەتی هەرێم) خاوەن سیادەی( هەرێمی کوردستان )نین، لێرەوە گرێ کوێرە قانونیەکە قووت دەبێتەوە کە زۆربەی لایەن و سەرکردەکانیش تەواو ئاگادار نین، واتە ئێمە بە یەک لایەنی ناتوانین بریاری مافی چارەنووسی ئەو هەرێمە و میللەتەکەی بدەین، هیچ لایەکی قانونی ئەو دەسەڵتەی بەئێمە نەداوە،کەواتە دەبێت ئەو تەفویزە وەرگرین، لەو دەمە( واتە لەدوای دەرچونی عێراق لە بەندی(٧) هەردەبێ عێراق ڕەزامەندی بدات، هەرواش کراوە لە ئەزموونە قانونیەکانی جەزائیر، ئەریتیریا، تەیمور، خواری سوودان ..ئەوانە ڕێکەوتنیان لەگەل( صاحب السیادە )کردووە،( صاحب السیادە ) باداگیرکەریش بێت، ئەگەر عێراق ڕێکنەکەوێت لەگەل هەرێمی کوردستان،

هەر ریفراندۆمێک بکەی لەرووی یاساییەوە باطلە، پوچە، قیمەتی قانونی نابێت، تەنها ماندووبوون و ئەزیەتە، ساڵی چەند جارێک ریفراندۆمی لەو شێوەیە بکەیت یان نەیکەی، هەروەک ریفراندۆمی ساڵی 2005 دەبێت و بەس، ئەگەر وابوایە وەک ئەوەی ئێستای دەسەلاتی کوردی دەیەوێ بیکات لە شۆرشی ئەیلول دەیکرد(بەتایبەتی لە نێوانی 1970 تا 1974) ئەو هەموو خوێن ڕشتنەی ناویست ، یان هەر لە ئەسلدا میلەتانی ژێر دەستە پێویستیان بە شۆرش نەدەبوو، شۆڕش و ڕاپەڕین بۆ ئەوەیە تا ئەو مافە بەدەست بهێنی( مافی چارەی خۆ نووس )کە لەدەستت نیە.

**بۆ ڕێکەوتن لەگەل عێراقیش زۆر دەرفەتی زێرین لەدەست چوو، دەبوایە:**

ا –لەکاتی نوسینەوەی دەستور ماددەی وای تێدابخرایە نەک ئەو ئاماژەیەی لەدیباجە هاتووە، یان بەلای کەم لە دەستورەکە ماددەیەک تۆماربکرابایە بووترایە( دیباجەکە ) بەشێکە لە دەستوور.

ب –لەکاتی دەرچوونی عێراق لە بەندی (٧) کە سەرکردایەتی کورد و رۆڵی گرنگی لێی بینی دەبوایە دووبارە( وەک ساڵی 1932 ئاسا 16 تەعەهود لە عێراق وەرگیرا ) بەلێننامە لە عێراق وەربگیرایە و بواری قانونیش هەبوو، جینۆساید و ئەنفال و یاساکانی نێودەولەتی.. پالپشت بوون.

ج –لەبارەی فیدراڵی تەواویش تۆمار نەکراوە، بۆ ئەوەی عێراقیکی فیدراڵی بوایە، دەبوو (٣) هەرێمی فیدراڵی هەبوایە، ئەوکات بۆ هەموو هەنگاوێک ساناتر دەبوو، هەم ناوچە ناکۆکەکانیش کوردستانیش تا ئێستا چارەسەر دەبوو. زهەم سیادەی عیراق شل تر دەبۆوە.

د – تەوافوقی تەواو یان شراکە : هێشتا سەرکردایەتی کورد نەیتوانیە سیستەمی سازان(توافق )بۆ مافی چارەنوس بەکاربهێنێت ، هێشتا ئەو

سیستەمە جێبەجی نەکراوە لەعێراق هەرچەندە دانی پیا هێنراوە، نەهاتوون وەک ئەزمونە تەوافوقی چیکۆسلۆفاکیا و قوبرس بکەنە سەرمەشق کە زۆر لە قازانجی کورستان دەبوو ، هاتوون زیاتر ئەزمونی تەوافەقی لبنانیان بەرجەستە کردوە کە تەنها تەوافوقیەکە لە سەروو جێبەجی کراوە شۆڕ نەبوویتەوە خوارەوە، چونکە لە ئەزمونی چیکۆسلۆڤاکیا و قوبرس دەولەتەکە تەوافوقیە هەرچی لە لبنانە حکومەتەکە تەوافوقیە نەک دەولەت ، تەوافوقی و ئیئتلافی و حکومەتی بنکە فراوان و حکومەتی یەکرِ زی و حکومەتی( شەراکە ... )هەم وی لێک جیان، دەوڵەتی تەوافوقی گۆڕانکاریەکانی ستونیانە لەسەروو تا خوارەوە، بە پێچەوانەی حکومەتی ئیئتلافی ئەگەر هەر گۆڕانێک بێتە دی ئەوا تەنها ئاسۆییانە لە کابینەی ئەنجومەنی وەزیران ڕوودەدات، شۆڕ نابێتە خوارەوە ، کەچی لە دەولەتی تەوافوقی هەر گۆڕانکاریەک بێتە دی بە هەر هۆیەک بێت ( تەوافوقیانە بێت یان بە ئەنجامی هەلبژاردن بێت )ئەوا لە کابینەو باقی دام ودەزگاکانی خواروو تریش ڕوودەدات ،تەنانەت دەپەڕێتە وە بۆ دەسەلاتەکانی تری وەک پەرلەمان و دادگا و سوپا وپۆلیس و ئاسایش، هەندێکیان تەوافوقیان بە دەستوریانە هەندێکیشیان بێدەستوری، لوبنان بەبێ دەستوریە سەرۆک کۆمار مەسیحیەکی مارۆنی بێت، سەرۆک وەزیران موسولمانی سونە بێت. سەرۆکی پەرلەمان شیعەی موسولمان سوپا سالا ری گشتی مارۆنی وەزیری دەرەوە مەسیحی ئەرسەدۆکسی، وەزیری بەرگری دورزی، کەچی لە قوبرس و چیک ۆسلۆڤاکیا دەستوری بو لەو شێوەیەی خوارەوە : چیکۆسلۆڤاکیا لەدوو میلەتی جیای چیک و سلاڤ پێکهات وە , ٦٦% ی چیک و ٢٨% سلۆڤاک و کەمایەتی تریش، قوبرسیش بە پێی دەستوری ١٩٥٩ تەوافوقیانە ڕێککەوتن لە سەر بنچینەی ڕێژەی

پێکهاتەیی، بە جۆرێک ٦٠% کبرسی یۆنانی و باقیەکەی تر تورک و کەمایەتی ترن سەرۆک کۆماری یۆنانی جیگری تورک، ٣٥ پەرلەمانتار یۆنانی و ١٥ تورکی ، ٧ بە ٣ وەزیریش .. عادەتەن لەو جۆرە سیستەمی پەرلەمانی دەبێت نەک سەرۆکایەتی ، ئەگەر عیراق ئاوا تەوافوقی بەرجەستە بکات کاری مافی چارەنوسی کوردستان زۆر سانا دەبێت ، ئەو کاتی خۆت شەریکی پێویستت بە وە نیە ئەو مافەی خۆت لە میلەتێکی تر داوا بکەی بەلکو ڕێکاری یاسایی ئۆتۆماتیکی دێتە پیش.

هەر بۆ زانین لە ریکەوتنی نێوان(خواروی سودان ) و ( دەولەتی سودان ) واکرا لەمادەی (٨٠)ی دەستور بە تەوافوق سودان بەڕێوە ببەن بە میکانیزمی 70 % بۆ دەولەت و 30 % بۆ خواروو.

خ - دوا دەرفەت ئەو رێکەوتنە (٨ مادەیە) بوو کە لە ٢٠١٦/٧/٢٢ کرا لەگەل پنتاگۆن و عێراق و بەوهۆیە هێزی پێشمەرگە( بەبێ مۆڵەتی پەرلەمان ) بڕیاری بەشداری لە شەڕی موسڵدا سەکردایەتی کورد دەیتوانی بەرامبەر ئەوە هەر خواستێکی هەبێت ئاسانترە لەوەی ئێستا شاندێک بنێرێتە بەغداد بێ ئەو کارتە.

دەبێ ئاگادار بین بەووردی ڕای دەولی بۆ جیابونەوە زۆر هاندەر نین ، بۆیە 3 مەرجی قورسیان داناوە ، هەم لە دۆسیەی کۆسۆڤا هەم لە دادگای کەنەدا بەرامبەر کیبیک روو تر گوزارش کراوە، وەلامی داگای لاهایمان تۆمار کرد لەسەروو، ئەوەش وەلامی دادگای کەنەدایە (کە بۆ ئێمە ئیلزامی نیە): ١- إن القانون الدولي لا يمنح الأجزاء المكونة لدولة ذات سيادة، حقا قانونيا للانفصال أحادي الجانب عن الدولة الأم ) ٢- إن حق تقرير المصير الذي ينص عليه القانون الدولي لا ينشيء سوى حق تقرير للمصير الخارجي في حالات المستعمرات السابقة ، بۆیەش لەزۆربەی

بڕیارەکانی مافی چارەنوس داکۆکی لە یەکپارچەیی و سیادەی دەولەت کراوە، کار گەیشتە ئەوەی نەتەوە یەکگرتوەکان بیکەن بەشێک لە ئاشتی دەولی و ناوی نرا (خطه السلام – 1995 ) کەلەمادەی 17 بەدواوە باس لەو جیابوونەوانە دەکا ودەلێت( ئەگەر ئەو دەرگایە بکەینەوە جیابوونەوە کۆتایی نایەت) ، تەنانەت لە هەموو هەنگاوەکانی ئەمریکا بەرامبەر عیراق دووپاتی پاراستنی سیادەی عیراق دەکاتەوە.

## ٢- ریفراندۆم بۆ کۆنفیدراڵی

لەهەندێ لێدوانی سەرکرایەتی کورد باس لەوە دەکەن کە لە دوای راپرسی و ریفراندۆم داوای کۆنفیدراڵی دەکەین .. ئەو بۆچونە سەرتاپای هەڵەیە لەڕووی یاسایی ئینجا لەڕووی سیاسیش، چونکە ناکرێ میللەت بەیاسا بخەیە ریفراندۆم و هەموو میللەت داوای سەربەخۆیی بکەن ئینجا ئەو داوایە بخەیتە گفتوگۆ و سازش و دانوستان و بۆ کەمتر لەوەی میلەت داوای کردوە ، لەهیچ شوێنێکی جیهان ئەوە نەکراوە، چونکە ئەوجۆرە ڕێفرۆندامە ئیلزامیە:

(Optional referendum) نـەک (Mandatory referendum)

هەردەم گفتوگۆ و سازش و دانوستان پێش ریفراندۆمە، کە گەیشتە ریفراندۆم دەبێت ریز لە ڕای میللەت بگیرێ، بەتایبەتی سەرکردایەتی کورد خۆی هەر لەئێستاوە بە نیازبێت مامەلە بەو ریفراندۆمەبکات زۆر مەترسیدارە، ئاشکرا دیارە مانای ریزنەگرتنە لە ریفراندۆم و ئەنجامەکانی .. ئەوکاتی عێراق چۆن رێزی لێ دەگرێت، ئەو بۆچونە قانونیە یەکجار زیان بەخشە، نابێت وەک بریارەکانی کۆنگرەو کۆنفرانسەکانی حزبی سەیر بکرێت کە بە ریفراندۆم بڕیاری لەسەر

دەدرێت کەچی خودی سەرۆک حزبەکە پێش سەرکردایەتیەکە پشتگوێی دەخا ، ئەوەیان خراپە بەلام پشتگوێ خستنی ئەنجامی ریفراندۆم یەکجار خراپە.

٣. **ریفراندۆم بۆ فشار و کارتی دانوستان......** هەمان ناوەڕۆک و هەلسەنگاندنی خالی (٣)ی هەیە.. ئەو جۆرە ریفرۆندامانە نەکراون.

٤. **ریفراندۆم تا بزانین میلەتەکەمان چی دەوێت** : ئەو جۆرە ریفراندۆمە نەکراوە ، سەرکردەی میلەتەکە خۆی داوای ریفراندۆم بکات بۆ ئەوەی بزانی چیان دەوێت، ئەو پرسیارە( چیتان دەوێت؟ )هی سەرکردایەتی کورد نیە ،بەلکو هی داگیرکەرە یان هی نەتەوە یەکگرتوەکانە ، ئەگینا پرسیاریکی زۆر عەبەسیە تازە بەتازە سەرکردایەتی کورد ئەو پرسیارەی هەبیت ، 100 سالی رابووردوو شۆرش و راپەرینەکان بە بانگیشەی ئەو سەرکردانە کراوە کەواتە نابیت ئەو سەرکردانە ئەو پرسیارە بکەن.

٥. **ریفراندۆم بۆ ئەوەی تەخویل بدرێتە سەرکردایەتی کورد بۆ هەر دانوستان و بڕیارێکی چارەنوسساز..** لە ڕاستیدا ئەو تەخویلە بەسەرکردایەتی کورد دراوە، هەم لەڕێی شەرعیەتی شۆڕشگێڕی هەم لە ڕێی سندوقی دەنگدان، بۆیە پێویست بە دووبارەی ئەو تەخویلە ناکات و ریفراندۆمی ناوێت.

٦. **ریفراندۆم بۆ سەپاندنی ئەمری واقیع( دیفاکتۆ ...)** دەبێ ئاگادار بین لە 100 سالی ڕابوورد وو بە دەست و بازووی کوردستانی نەمانتوانیە ئەمری واقیع فەرز بکەین مەگەر بڕیاری نێودەولەتی لەگەل بوبێت، ئەوەی کۆماری مهاباد بەپالپشتی سۆڤیەت بوو ،لەو سەردەمەش هەردوو بڕییاری 986 و 688 و دوایش هێلی 36 لە (عملية توفير الراحة Provide comfort)، لەوێوە دەسەلاتی ئەمری واقیع دروست بوو، دوای لە مادەی (١و ١٢٧) ی دەستوری نوێی عیراق تۆمار کرا کۆتایی بە

دەسەلاتی دیفاکتۆی کوردستان هێنرا بووە دەسەلاتی دیگۆرایی(یاسایی )، لێرە دەبییت ئاگادار بین ئەو جارڕدانەی فیدرالی لەکوردستان بەیەکلایەنانە زۆر جیایە لەگەل جارڕدانی سەربەخۆیی، ئەوەی یەکەم تایبەتە بەدەسەلاتی ناوخۆیی عیراق(جاروایە پێی دەووتری مافی چارەنوسی ناوەکی ) پێویستی بە ( یاسای دەولی و سیاسەتی دەولی و علاقات دەولی) نیە ، بەلام ئەوەی دووەم زۆر ئالۆزە وەک لەخالی یەک باس کرا، بەکورتی سەپاندنی ئەمری واقیع لەسەر ئاستی دەولی جاریٌ لە ئاستی توانای کورد نیە، ئەو ئەزموونانەی سەپاندنی ئەمری واقیع هێزی دەوێت ، قوبرس کردی تورکیای لە پشت بووە، قرم کردی روسیای لە پشت بووە، بەهەمان شێوە ئۆسیتا واخەریکە ریفراندۆم دەکا بۆجیابوونەوە لە جۆرجیا روسیای لەپشتە.، کۆسۆڤا کردی هەمو ناتۆ و نەتەوە یەککگرتوەکانی لە پشت بوو ، ڤاتیکان کرا دەولەت کەچی مەرجە سەرەتاکانیشی تیدا نەبووە تێکڕای خاکەکەی 1000 مەتر بووە ، کەچی لخنشتایین شەش جار لە ڤاتیکان گەورەتر بوو بەهۆی بچوکی خاک بووە هۆی وەرنەگیرانی لە( عصبە الامم )، ئیسرائیل بە ئەمری واقیع دروست بوە بێئەوەی هەر 3 مەرجەکەی کۆنگرەی مۆنتیڤیدیۆی هەبێت(گەل – هەرێم – دەسەلاتی سیاسی... )، کە ووتت دیفاکتۆ یەکسەر دەبێت تەماشای هێزی پشتیوان بکەی ، ئەو هێزە بۆ کوردستان جاریٌ نیە و سەرکردایەتی کوردیش لەو سات و کاتانەی هەبووە وەک دەرفەت لەدەستیان چواندووە، بۆ ئێستا ئەو هیزە پشتیوانە نیە و کەمتریش کاری لەسەر کراوە بۆیە سەپاندنی ئەمری واقیع ناکرێت و سەرکەوتوو نیە مەترسی دەبێت ئەوەندەش لەدەست بدەین وەک ئەزمونی تامیل لە سریلانکا و ئەزمونەکانی چیچان و قەوقاز.

**لەکۆتاییدا** واپێدەچی هێشتا ڕوانگەیەکی یاسایی روون نیە بەرامبەر ریفراندۆم لەلایەن سەرکردایەتی کوردستان، عادەتەن بەو جۆرە دۆخە دەووترێت ریفراندۆمی بێئامانج، عەبەسی، پووچی یاسایی.

## زیانەکانی ڕیفراندۆمی عەبەسی لە کوردستان

١. کاریگەری سەلبی بەسەر مادەی 140 دەبێت بۆ دواکەوتنی جێبەجێ کردن.

٢. کەمکردنەوەی متمانە بە ریفراندۆمی راسەتەقینە.

٣. دامودەزگاکانی کوردستان لە کاتی ئێستا زۆربەی شەرعیەتی لاوازبوە ریفراندۆمێکی ناشەرعیش بکەی یەکجاری ناشەرعیەت ئاوێتە دەبێت.

٤. ولاتانی ناوچەکە و جیهان بەخەبەر دەهێنیەوە بێئەوەی ئەنجامێکیشی هەبیت.

٥. ئەگەرێکی تر( ئەگەر لاوازیش بێت )دەشێ وەک سالی 2006 ئەو دەنگە زۆرەی نەهێنی،یان ئەگەر کەمتر لە% 50 ی هێنا، یان % 60 هەتا % 70کەمبووەیەوە، کارتێکی بەهێز بەخۆڕایی دەکەوێتە دەست دەولەتانی ناوچەکە دەلێن دەنگی جیاخوازان بەرەو کەمبوونەوەیە، خەبات و ماندووبوون و خوێنی

شەهیدانی 100 سالی ڕابووردو و دەخەیە موجازەفە، ئەزمونێکیش هەیە زۆر وردە و کەمیش باسی لێوە کراوە ، لەهەلبژاردنی ١٩٩٢/٥/١٩ دروشمی پارتی ئۆتۆنۆمی بوو هی یەکێتی فیدرالی بوو. چونکە ئەو کاتی گەندەلیەکان زیاتر ڕوو لە یەکێتی بوو، لە نێوان بانگێشەی نیشتمانی (فیدرالی ) لەگەل گەندەلی و بانگێشەی ئۆتۆنۆمی( بێگەندەڵی ) دەنگی یەکەم دۆڕاندی، یەکێتی بە فیدرالیە وە% 43.8 ی دەنگ هێنا، پارتی بە

ئۆتۆنۆمیەوە دەنگی زیاتر لە یەکێتی هێنا گەیشتە% 45.2 ، ئەو بارودۆخەی ئێستا زۆر وێکچووی ئەو کاتیە، چونکە ئەو ریفراندۆمە بە گەندەڵیەوەیە، ئەگەری هەیە منافسەیەکی وا سەرهەڵداو دەنگ زۆر کەم بێت، ئەوانە هەمووی ئەگەری هەیەو زەرەر وزیانی مەترسیداری دەبێت.

٦. لەهەموی خراتپر ئەگەر ئەو پرۆسەیە تەنها بۆ ئەوەی بێت بەکاری بهێنی بۆ ململانێی حزبی.

## باشترین ریفراندۆم( بۆ دەوڵەتی کوردستانی)

لەوانەی سەروو بەڕوونی دەرکەوت ریفراندۆمێک هەیە بۆ سەربەخۆیی زۆر جیایە لەگەل ریفراندۆمێک کە (باطلە و پوچە -تریڤیالە ) هەریەکە رێباز و رێکار و میکانیزمی جیای پێویستە، بۆ دووەم چی پێویست نیە یەکڕیزی و تۆکمەیی و هەتا پەرلەمان و ئامادەسازی ناوێ مادام باطلە ، هەرچی یەکەمە کاری زۆری پێویستە لەهەموو رووێکەوە (ئابوری– سیاسی – قانونی – کۆمەڵیەتی – ئیداری – سەربازی – فەرهەنگی..) وەک نەشتەرگەری دڵ وایە، بە لێدوان و ڕاگەیاندن ناکرێت بەکار و نەخشە و پلان و شارەزایی دەکرێت، هەرچەندە زۆر درەنگە بەڵام ئێستاش دەشێ بەو شێوەیەی خوارەوە کاری لەسەر بکرێت:

**یەکەم -ئاستی ناوەکی** زۆر باس کراوە هەردەبێ دووبارەی بکەینەوە (ڕای گشتی لەسەرە کەچی نەکراوە)

١.بەخێرایی بەگەڕ خستنەوەی دام و دەزگا پەکخراوەکان و ڕێکاری یاسایی وەرگیرێ نەک هەر پەرلەمانی کوردستانی پێویستە ئەگەری زۆرە پەرلەمانی عیراقیشی بوێ.

٢. یەکخستنی ناوماڵی کورد.

٣.سەروەری یاسا و دروستكردنی دام و دەزگا و پابەندی حیزبی بە یاسا.
٤.دەستگۆڕی دەسەڵات و بەرجەستەكردنی زیاتری دیموكراسی.
٥.ڕێگا لەهەموو ئەو دەروازانە بگرین كە بەهۆیەوە راپۆرتی نێودەولەتی خراپ لەسەر هەرێمی كوردستان دەردەچێت.
٦. كاركردن بۆ گێرانەوەی كەركوك( تەواوی ماددەی 140 ) بۆ سەر هەرێمی كوردستان .

## ڕوداوەكانی شانزدەی ئۆكتۆبەر

ئەوەی لە شانزدەی ئۆكتۆبەردا ڕویدا لێكەوتەی كەلەكە بووی كێشە گەلی ڕابردوو بوو، كە بە چارەسەر نەكراوی هێڵدرابوونەوە، لە چركەساتە هەستیارەكاندا تەقیەوە، زیانەكەشی تەنیا ئەو ناوچانە نین كە لە دەست چوون، بەڵكو سەرەتای ڕوداو گەلێكە نوێیە هێزەكانی پێشمەرگە لە بەرەكانی شەڕدا جۆراوجۆر بوون بەشێكیان بەناوی هێزەكانی حەفتا كە بە ڕوكەش سەر بە وەزارەتی پێشمەرگە بوون، بەڵام زۆرینەی بڕیارەكانیان لەلایەن یەكێتی نیشتمانی كوردستانەوە پێدەدرا، هێزەكانی هەشتاش بە ڕوكەش سەر بە وەزارەتی پێشمەرگە بوون، بەهەمان شێوە فەرمانیان لەلایەن پارتی دیمووكراتی كوردستانەوە بۆ دەردەچوو، لیواكانی سەر بە وەزارەتی پێشمەرگەش لە تێكەڵەی پارتی و یەكێتی پێكهاتبوون، فەرماندەیەك دەڵێت وەكو تیمی تۆپێن لە ڕۆژی ١٦ ئۆكتۆبەر بەیەك سافیرە لێك جیابوونەوە، هێزەكانی زێرەڤانی و بەرگری و فریاكەوتن و كۆمەڵێكی تر لە هێزە تایبەتیەكان لەم شارەدا بونیان هەبوو، فەرماندەیەكی پێشمەرگە لە میحوەری پێنج دەڵێت : یەك سەعات پێش ئەوەی هێزەكانی پێشمەرگە لە میحوەری چواری باشوری كەركوك پاشەكشە بكەن، لەڕێگەی دوو ئەفسەری هێزەكانی هەفتا پێیان ڕاگەیاندین كە ئێمە شەڕ ناكەین و پاشەكشە دەكەین، تەلەفۆنم بۆ بۆ ئەفسەرێكی تر كرد وتی ئێمە لە ماڵەوەین، پێم وت بۆچی لەماڵەوەن حكومەت وا هێرشمان دەكاتە سەر؟ لە وەڵامدا پێی وتم فەرمانمان پێكراوە بچینە ماڵەوە و شەڕ ناكرێت.

شەوی ١٦/١٥ ئۆكتۆبەر كاتی درێژكراوە هێرش تەواو بوو، هێزە زۆر و زەوەندەكانی حكومەتی عێراقی لە چەند قۆڵێكەوە هێرشیان بۆ سەر سەنگەرەكانی هێزی پێشمەرگە دەست پێكرد، خاڵەكانی دەست پێك بریتی بوون لە :

چارتاغلو خواری پیشەسازی كەركوك (واتە مریم بەگ بەرەو تازە بەرەو پیشەسازی كەركوك و جادەی لەیلان و پردە هەڵواسراوە ، نزیكەی ٣٠ هەمەر شەو بە دووربینی شەو (نازولەلیل) دزەیان كردبوو نزیك سەنگەرەكانی پێشمەرگە .

شەڕ لەو خاڵانە بە سەختی دەستی پێكرد و ماوەی چوار كاتژمێر پێكدادان بەردەوام بوو، پاشان هێزەكانی پێشمەرگە بە ئاراستەی جیاواز پاشەكشەیان كرد، بەشێك لەو هێزانە بە ئاراستەی ناحیەی لەیلان و بەشێكی تریان بۆ شەقامی چواردەوری كەركوك كە بە حەولیەكە ناسراوە پاشەكشەیان كرد، فەرماندە حەمە ڕێگر دەڵێت وەستا ڕەسول فشاری خستۆتە سەر هێزەكانی پێشمەرگە بۆ ئەوەی لە كەركوك پاشەكشە بكەن، بەڵام فەرماندە مام سیامەند كە فەرماندەی لیوایە لە میحوەری پێنج دەڵێت ئێمەش بە تەقە پاشەكشەمان كردووە. ئەوەی شایەنی باس بێت ئەم هێزانەی كە شەڕیان كەوتە سەر و شەهید و برینداری زۆریاندا كە بە ٣٨ شەهید و ١٧٠ بریندارایان دا، فەرماندەی فەوج عقید عزیز عەلی عزیز و جێگرەكەی مقدم هێرش حەمەشەریف و ٣٦ پێشمەرگەی لە بەرگریدا شەهید بوو، بەڵام هیچ هێزێكی پشتیوانی فریای ئەم هێزە نەكەوت و هەمە ئاهەنگیان لەگەڵدا نەكردن، لە كاتێكدا لە شەڕی دژ بە داعش لە كاتێكدا هێڵێكی بەرگری لاواز بوایە یاخود ئەگەری شكستی لەسەر خاڵێك بوایە

چەندین جۆرە هێزی تر فریای ئەو خاڵە دەکەوتن و لە شکست دەیانپاراست؟! ئەو خاڵانەی کە شەڕیان لەسەر بوو خاڵی گرنگ و کاریگەر بوون و بەشی زۆری سەنگەرەکانی پێشمەرگە پەراوێز دەکەوتن و ڕەنگە زیانی زۆریان بەرکەوتایە و ڕزگار بوونیان ئاستەم دەبوو، بۆیە کاتێک زانرا ئەم سەنگەرانە ناتوانن بەرگری بکەن، داوا لە تێکڕای هێزەکانی میحوەری چوار کرا بەپەلە هێزەکانیان بۆ نێو شاری کەرکوک پاشەکشە پێبکەن ، بەڵام هێزەکان نەهاتنە نێو شارەکە وە بەشێکیان بۆ کەلی سێکانیان شەقامی کەرکوک هەولێر و بەشەکەی بۆ شەقامی سەرەکی سلێمانی – کەرکوک پاشەکشەیان کرد . پاشان داوا لە هێزەکانی پێشمەرگە کرا بگەڕێنەوە بۆ شوێنەکانی بەر لە ٢٠٠٣،لە هێڵی کەرکوک – سلێمانی بۆ بانی مەقان و هێڵی کەرکوک – هەولێر بۆ ناحیەی پردێ و هێڵی کەرکوک تەق تەق بۆ شێوە سور پاشەکشەیان کرد.

## پاشەکشەی پێشمەرگە لە نێوان خیانەت و ئەمری واقیعدا

دوای ئەوەی دۆستانی نێوخۆی و نێودەوڵەتی داوایان لە (مەسعود بارزانی) کرد ئەو ڕیفراندۆمە دوابخات، بەڵام عینادی کردنی وای کرد شکستێکی گەورەی وای کرد، پێگەی هەرێمی کوردستانی لە ئاستی نێودەولەتی هێناوە زیندانی عێراقی، ئینجا لەو مەترسیدارتر لە نێوان چەند سەعاتێک نیوەی خاکی کوردستان دۆڕا، هەر لە کەرکوکەوە تا دەگاتە شەنگال کە لە مێژووی کوردستان شکستی وا نەبووە، لە کاتێکدا ئەو هەموو هێزوو چەکدارەی هەبێ ئینجا وای بشکێ، لە لایەن سەرکردایەتی (پ.د.ک) ئەو خیانەتە خرایە ئەستۆی (ی.ن.ک)هەندێ سەرکردەی گەورەی (ی.ن.ک) هەر هەمان رایان هەبوو لەوانە (کۆسرەت رەسول و شێخ جەعفەر شێخ مستەفا) لە دوای لێدوانی لەو بارەیەوە شێخ جەعفەر لەگەڵ دەنگی ئەمریکا دەڵێ،"باڵێکی (ی.ن.ک) تا ئێستاش خەریکن هەولێر و سلێمانی و دهۆک رادەستی بەغدا دەکەن.

کەواتە پارتی دیموکراتی کوردستان لە هەموو ئاستەکانی و بەشێک لە سەکردەکانی ی.ن.ک لایان وایە، ئەوەی لە ١٦ی ئۆکتۆبەر روویدا جگە لە خیانەت هیچی تر نەبوو، کەچی لە شەوی ٢٠١٧/١٠/١٦/١٥ فەرماندەکانی میحوەری پێنج سەردانی شێخ جەعفەر و وەستا رەسولمان کردووە، وەستا رەسول بەئاشکرا وتویەتی کە شەڕمان پێناکرێت و پاشەکشە دەکەین، دکتۆر کەمال کەرکوکی پێیانی وتووە ئێمە شوێنەکانتان پڕ دەکەینەوە، بەڵام ئەوان قبولیان نەکرد، فەرماندە وەستا رەسول و فەرماندە هیوا رەش ئەمە رەت دەکەنەوە کە هیچ ڕێکەوتنێک هەبێت بەڵکو شەڕیان کردووە و نەیانتوانیوە لەوە زیاتر بەرگری بکەن، بۆیە ناچار بە

پاشکشە کراون، شەڕیان نەخستۆتە نێو شارەکەوە بۆ ئەوەی کاولکاری و ماڵوێرانی بۆ شارەکە دروست نەکەن و دەشلێن لە ڕۆژئاوای شاری کەرکوک کە دکتور کەمال کەرکوکی خۆی لێبرسراو بووە هیچ بەرگریەکی نەکردووە، جگە لە کەرکوک نەلە مخمورو نە گوێڕو نە شەنگال و زمار و...بێ بەرەنگار بونەوە گورەپانی شەرەکەیان بۆ سوپای عێراق چوڵ کردووە. هەڵبەتە لە سەرەتای پەیدابونی داعش و دەست پێکردنی شەڕ لەنێوان داعش و هێزی بێشمەرگەدا، هێزەکانی سەر بە پارتی دیموکراتی کوردستان لە چەندین شوێن بەرەکانی شەڕیان چول کردووە و هەڵاتوون، دیارترینیان چۆل کردن و بە دەستەوەدانی شەنگال بە داعش بوو، کە جینوسایدی یەزیدیەکانی لێکەوتەوە، بەلام ناسنامەی خیانەت بە بەر هێزەکانی پارتیدا نەکرا، لەکاتێکدا چەندین هێندەی ڕوداوی شازدەی ئۆکتۆبەر زیانی گیانی لێکەوتەوە و ژن و کچە یەزیدیەکانیش لە بازارەکانی شاری موسل هەڕاج دەکران و پیاوەکانیشیان دەکوژران، وەزارەتی پێشمەرگە لیژنەی لێکۆلینەوەی بۆ ئەو مەبەستە دروست کرد، تاکو ئێستا هیچ دەرئەنجامیکی نەبووە.

فەرماندە لاهوری شێخ جەنگی دەلێت هێزەکانی نزیک لە پارتی کە دەستیان بەسەر کێلگە نەوتیەکانی هافانە و بایحەسەندا گرتبوو بێئەوەی یەک تەقە بکەن پاشکشەیان کرد، لە دریژەی وتەکانیدا لاهور دەلێت من فەرمانم بە هیچ هێز و کەسێک نەکردووە لە کەرکوک پاشەکشە بکەن.

پارتی دیمکراتی کوردستان بالیک (بەشێک) لە نێو یەکێتی نیشتمانی کوردستان بە خیانەت تۆمەتبار دەکات و گوایە ئامادە نەبووە لەگەڵ سوپای عێراق ریکەوتن بکات، بەلام لە ڕۆژی ٢٠١٧/١٠/٢٧ لە تەلەفیزیۆنی

ئاسمانی ئافاقی عێراقەوە ڕێکەوتنی پارتی دیمکراتی کوردستان بە سەرۆکایەتی عارف تیمور ئەندامی مەکتەبی سیاسی پارتی دیمکراتی کوردستان و شاندی حەشدی شەعبی بە سەرۆکایەتی ئەبو ئیلای وەلائی ئەمینداری گشتی کەتیبەی سەید الشیداء بۆ وەستانی جەنگ بە درێژای ٢٠٠-٢٥٠ کم ڕێکەوتن، کەوایە بەپێی ئەم ڕێکەوتنە لە تەلەفیریۆنەکەوە بڵاوکرایەوە پێویستە هێزی پێشمەرگە بۆ هێلی سەوز بگەڕێنەوە و خاڵە سنوری و دەروازە بازرگانیەکان لەماوەی پێنج ڕۆژدا بگەڕێندرێتەوە بۆ ژێر دەسەلاتی حکومەتی عێراقی.

لەلایەکی ترەوە عوسمان بانی مارانی دەڵیت: بەهەموو شێوەیەک دەستەواژەی خیانەت ڕەتدەکەمەوە، یەکێتی چۆن بتوانێت خیانەت بکات لەکاتێکدا تێکڕای دەسەلاتەکانی کوردستان بەدەست پارتیەوەیە وەکو سەرۆکی هەرێم و حکومەت و وەزارەتە گرنگەکان. پارتی بەتەواوەتی کۆنترۆڵی بواری سەربازی و سیاسی و ئیداری هەرێمی کردووە و یەکێتی هیچی بەدەستەوە نەماوە کە بتوانێت کارێک بکات، لەدرێژەی وتەکانیدا دەڵێت کۆسرەت ڕەسوڵ نەدەبوو پشتگیری قسەکانی مەسعود بارزانی بکردایە و هێرشی سەر هەڤاڵانی بکردایە، لەکاتێکدا ئێمە لەمەکتەب سیاسی یەکێتی لەشاری کەرکوک بوین و بەشی زۆری هەڤاڵان لەوێ بوون وەک کۆسرەت رەسول و رەفعەت و ئاسۆ و مەلا بەختیار و قوباد تاڵەبانی و دلێری سەید مەجید و شێخ جەعفەر و وەستا رەسول... شێخ جەعفەر و وەستا رەسول وتیان: ئێمە کاتێک دڵنیا بووین لەو جەنگە بەشکستی ئێمە تەواو دەبێت پاشەکشەمان کردووە، شێخ جەعفەر پاش ئەوەی قسەی لەگەڵ مەسعود بارزانی کردووە بڕیاری پاشەکشەی داوە،

لەو كاتە ئەیوبی فەرماندەی لیواكانی كۆسرەت رەسول هات وتمان دەنگ و باس چییە ئەویش وتی ئەو شەڕە بە ئێمە ناكرێت".

هەروەها سەرۆكی ئەركانی سوپای عێراق فەریق ئەوەل روكن عوسمان غانمی لە ٢٠١٧/١٠/٢٧ داوای لەهێزەكانی پێشمەرگە كردووە لەماوەی سێ تا چوار كاتژمێر بگەڕێتەوە بۆ شوێنەكانی پێش ٢٠٠٣. لەو ماوەیەدا چەندین دانیشتن و گفتوگۆ لەنێوان وەزارەتی پێشمەرگە و حەشدی شەعبی و سوپای عێراق دروست بوو.

بەڵام دوای نۆ رۆژ لەم دانیشتنە ئەنجومەنی سەركردایەتی پارتی دیموكراتی كوردستان بەیاننامەیەكی دەركرد تێیدا هاتووە:

١. كۆمەڵێك هەرزە. رەفتاری خیانەتیان كردوو رێگەیان بە حەشدی شەعبی و سوپای عێراقدا لە ١٦ی ئۆكتۆبەردا بێنە نێو شاری كەركوكەوە.

٢. بەیاننامەكە دەڵێت دەستوور لەلایەن بەرپرسانی بەغداوە بەپێی ویستی خۆیان لێكدانەوەی بۆ دەركرێت. ئەم جۆرە بیركردنەوەیە لەبەرژەوەندی كەسدا نیە و رێگر دەبێت لە یەكتر قبوڵ كردن و پێكەوە ژیانی ئاشتیانە.

لەو بارەیەوە دكتۆر بەختیار شاوێس ئەندام پارلەمانی عێراق لەلیستی یەكێتی لەپەیجی تایبەتی خۆی لەفەیسبووك لەرۆژی ٢٠١٧/١١/١٩ لەبابەتێكدا بەناونیشانی پارتی و خیانەت لەپایتەختەوە بۆ دڵی كوردستان بابەتێكی بڵاوكردۆتەوە، دەڵێت ئێمە لەشاری كەركوك بەرگریمان كردووە و شەهیدمان داوە بەڵام پارتی دیموكراتی كوردستان كە پارێزگاری لەكێڵگە نەوتیەكانی بای حەسەن و هاڤانەی دەكرد بێ بەرگری چۆلی كرد و پاشان شارەكانی دوبز و مەخمور و شەنگال و

تلکیف و باشیک و زومار و سد موسل و عانە و عین زالە و ... تەسلیم بەهێزە عێراقیەکان کرد، لە درێژەی وتەکانیدا شاوێس دەڵێت ئێمە گەراینەوە شاری بەغداد ئەوان (مەبەستی لیستی پارتیە) وەکو خیانەت تەماشایان دەکردین، ئێستا ئەوانیش گەراونەتەوە پارلەمانی عێراق بەخیانەتی نازانن بەلام ناگەرێنەوە دڵی کوردستان؟!

لەلایەکی ترەوە هادی عامری لەچاوپێکەوتنێدا ئاماژە دەکات کە رۆڵیان هەبوو لەرازیکردنی هێزی پێشمەرگە کە بەبێ خوێن رشتن پاشەکشە لەناوچە جێناکۆکەکان بەگشتی و شاری کەرکوک بەتایبەتی بکەن. ئەم وتانەی عامری ئەو پشت راست دەکەنەوە کە هێزەکانی پێشمەرگە لەرێگەی گفتوگۆوە پاشەکشەیان لەشاری کەرکوک کردووە، ئاراسی شێخ جەنگی کە لەرۆژی ١٦ی ئۆکتۆبەر لەنێو شاری کەرکوکەوە بۆ راگەیاندنەکان قسەی کرد، بەرپرسیارێتی کشانەوەی پێشمەرگەی رووبەروو کرایەوە، لەنامەیەکدا بۆ پارلەمانی کوردستان رایدەگەیەنێت کە ئامادەیە چەندین زانیاری ورد و گرنگ سەبارەت بە لەدەستدانی کەرکوک لە کۆبونەوەیەکی کراوەی پەرلەماندا بخاتەروو، ئەم هەوڵەی ئاراس شێخ جەنگی دەنگدانەوەی زۆری بەدوای خۆیدا هێنا و هەر زوو پارتی دیموکراتی هێنایە سەر خەت بۆ ئەوەی رێگری لە هەر جۆرە کۆبونەوەیەکی لەو جۆرە لەناو پەرلەماندا بکەن، لەدوای رووداوەکانی ١٦ی ئابەوە زۆربەی لایەنەکان لێدوانیان لەسەری داوە، بەلام تاوەکو ئێستاش هیچ کەس و لایەنێک قسەی کۆتای لەسەر هۆکاری رووداوەکان نەکردووە، ئەوەی کە هەیە هەمووی لێرە و لەوێ بەپێی بەرژەوەندی خۆی و دورخستنەوەی شکستەکان لێی قسە لەسەر رووداوەکە دەکات.

ئاراس شێخ جەنگی بۆ کۆتایی هێنان بەو دەنگۆیانە لە ڕێکەوتی (١٢/١٢/٢٠١٧) ڕایگەیاند ئامادەم بچمە بەردەم پەرلەمان و هەموو ڕاستی ڕووداوەکان وەکو خۆی لەبەردەم ئەندام پەرلەمان و ڕاگەیاندنکاراندا بۆ هەموو هاووڵاتیان ڕوون بکەمەوە، بەڵام پارتی دیموکراتی کوردستان بەهۆی ئەوەی نایەوێت خەڵک ڕاستیەکە بزانن ڕێگری دروست دەکەن. ئێمە لە دەرئەنجام و ڕاسپاردەکاندا ڕای خۆمان لەم بارەیەوە دەخەینەڕوو ئایە ئەم بابەتە لە دوو توێی خیانەتدا شوێنی دەبێتەوە یان نا؟ هەرچەندە ناکرێت ئاماری شەهیدان و برینداراەکانی ڕۆژی ١٦ی ئۆکتۆبەر فەرامۆش بکرێن، کە شەهید و برینداریان بەخشیوە، بەپێی ئامارێک کە لەبەر دەستی ئێمەدایە و لە پاشکۆی ژمارە (٦) تێکڕای ناوی شەهیدان و برینداراەکان بڵاوکراوەتەوە، لەکۆی ٣٨ شەهید تەنها ٣ لەو شەهیدانە سەر بە پارتی دیموکراتی کوردستانن و ئەوانەی تر لەنێو هێزەکانی یەکێتی نیشتمانی کوردستاندا کاریان کردووە، لەکۆی ١٧٠ پێشمەرگەی بریندار، ڕێژەی ڕەهایان لەنێو ڕیزەکانی یەکێتی نیشتمانی کوردستاندا کاریان کردووە، هەڵبەتە دەکرێت ئەمە وەکو بەڵگەیەک ئەژمار بکرێت کە یەکێتی نیشتمانی کوردستان بەرگری کردووە و قوربانی پێشکەش کردووە، هەرچەندە ئەگەر جەنگ و بەرگری تێکڕای سەنگەرەکانی پێشمەرگە ڕوویبدایە ئەوا شەهید و برینداراەکان زۆر لەو ژمارەیە زیاتر دەبوون. بەپێی شوێنی شەهید و برینداراەکان تەنها جەنگ لە تازە/چارداغلو، فرۆکەخانە و دووزخورماتوو، پیشەسازی ڕوویداوە.

# ئەنجام و ڕاسپاردە

١. سەرەڕای ئەوەی ئەو بارودۆخەی شانزدەی ئۆکتۆبەر دروستی کرد کە لێدانێکی کوشندە بوو بەر پرۆسەی سیاسی کوردستان چ لە ئاستی نێو خۆی و چ لە ئاستی دەرەکی کەوت، بەڵام نەتەوەی کورد لە باشوری کوردستان پەیامی خۆی ئاراستەی هەموو جیهان کرد کە نایەوێت لە چوارچێوەی عێراقدا بمێنێتەوە و ناتوانێت لەگەڵ ئەو هێزەدا کاری هاوبەش ئەنجام بدات. لە ئاستی نێوخۆیشدا دەنگی ناڕەزای لە دژی پارت پەرستی و نەتەوە و خاک فەرامۆش کردن لە هەموو ئاستەکاندا بەرز بووە و شکست بوو بۆ جەمسەرە تاکڕەوەکانی کوردستان، ڕەنگە ئەگەر لە بارودۆخێکی لەو شێوەیە نەبوایە بەهیچ شێوەیەک دەست بەرداری دەسەڵات نەبوونایە، جگە لەوەی لێرەوە ئابووری پارتەکان لاواز دەکات و جەماوەری دژی سیستەمی حیزبایەتی یاخی تر کرد. ڕەنگیشە ئەم پرۆسەیە بە زەمینەیەک برەخسێنێت کە لەهەڵبژاردنەکانی داهاتوودا شەفافیەت زیاتر بێت و تەزویر و ساختە کردن کەمتر بێتەوە.

٢. ئەگەر هەموو لایەنەکان پێکەوە بەرپرسیاریەتی ئەم قۆناغە هەڵبگرن و پێداچونەوەی خێرا بکەن بە پەیوەندیەکان لەگەل دەوروبەر و جیهان، ئەگەری ئەوە هەیە قۆناغی داهاتوو قۆناغی هەستانەوەی کوردستان بێت، بەڵام ئەگەر یەکڕیزی نێوخۆی دەستەبەر نەکەین بە دڵنیاییەوە ئایندەیی زۆر مەترسیدار چاوەڕوانمان دەکات، قوڵبونەوەی قەیرانی دارایی زاڵبوونی زیاتری سوپا و هەیمەنەی بەغداد چڕبوونەوەی پرۆسەی بە عەرەب کردن زیاتر دەکات و ڕەنگە

قۆنـاغی داهـاتوو قۆنـاغی چـەککردنی هێـزی پێشـمەرگەی کوردسـتان و بڵاوکردنەوەی شیعەگەری بێت.

٣. نیگەرانی خەڵکی کوردستان لە دەسـەڵاتداریتی خۆماڵی کـوردی گەیشـتۆتە لـوتکە پێویسـتە سـەرکردایەتی کوردسـتان و حکـومەتی هەرێـم ئـەو بـارودۆخە بـە هەنـد هەڵگرێـت و گوێبیسـتی گلەییەکـانی خەڵـک بێـت. ئـەم قۆنـاغە بکـاتە سـەرەتایەکی نـوی بـۆ بنیادنانـەوە و چاکسازی جدی لە تێکڕای سێکتەرەکاندا بکرێت.

٤. پێویسـتە حکـومەتی هەرێمـی کوردسـتان هزرێکـی نیشـتمانی دروسـت بکات، بۆ ئەوەی چیتر هەڵەی سیاسیەکان بە سـەر پێشـمەرگەدا نەسـەپێندرێت و تـایبەتی کـاراکتەرە سیاسـی و سـەربازییەکان نـەمێنێ و هێزەکانی پێشـمەرگە لـە دەست حزب بێتە دەرەوە و بە ئالیات و چەکی نوێ رابهێنرێـت و لیژنەیەک بۆ چاکسـازی لە نێـو هێزەکـانی پێشـمەرگە دروسـت بکرێت، لەو فەرماندانـە بکۆڵنەوە کـە زۆر بـە خراپـی دەوڵەمەنـد بوون وەکو بازرگانی جەنگ مامەڵەیان کردووە.

٥. پێویسـتە سـەرکردەی هێـزە سیاسـی و سـەربازییەکانی ناوچەکـانی دەرەوەی کوردسـتان بـە گشـتی و کەرکـوک بـە تـایبەتی بەشـداریان لـە شـەڕی نـاوخۆی یەکێتـی و پارتیـدا نەکـردبێت و بـە گیـانێکی نوێـوە کارەکانیـان دەسـت پـێ بـکەنەوە، یـاخود کـاراکتەرە سیاسییەکانی ئەو دەڤەرانە لە میانرەوەکانی نێو حزبەکان بن.

٦. هێـزی پێشـمەرگەی کوردسـتان کاتێـک درکـی بەوە کـردووە کـە پشـتیوانی نێودەوڵەتی لە دەستداوە و شـەڕی تانک و هەمـەری گولـەنەبڕ

سەختە و ناتوانێت بەرگری بکات پاشەکشەی کردووە، سەرڕای ئەوەی لە چەند ناوچەیەک پێکدادان ڕوویداوە چەندین قوربانی لێکەوتۆتەوە. بەڵام شەڕەکە هەموو بەرەکانی نەگرتەوە و لەخانەقینەوە تاکو سنوری خاکی سوریا لە زۆرینەی ناوچەی کێشە لە سەریان ئەو زەوییانە لە دوای هاتنی داعشەوە دەستی بە سەردا گیرا بوو پاشەکشەیان کرد.

٧. ئێمە لامان وایە ئەگەر پرۆژەی ٣٨ خالیەکەی کۆمیتەی سەرکردایەتی یەکێتی جێبەجێ بکرایە کارێکی بەجێ دەبوو بەکەمترین زیان لەو بارودۆخە شاری کرکوک رزگار دەبوو، کاتێک ئەوە نەکرا پاشەکشە بە گونجاوتر لە شەر دەزانین وەکو عەرەب دەڵێن: (تتنازل قبل ما تكاسر)، تەنازول بکە پێش ئەوەی تێکبشکێت.

٨. ریفراندۆمی هەرێمی کوردستان ئەو رەوشە خراپەی کە خۆی هەیبوو خراپتری کرد. لەبری بەرەو پێشبردنی سیستەمی فیدرالی و دەسەڵاتی سیاسی کورد، نیازپاکی نێودەوڵەتی لە ئاست خۆی بەفیرۆدا، جگە لەوەش بەغدا و وڵاتانی تری دراوسێی کردە دوژمنی خۆی و قەیرانی ئابوری و لەتبوونی کۆمەڵایەتی قوڵتر کرد. هاوکات بووە هۆی لەدەستدانی چەندین سەرچاوە و ناوچەی گرنگ. هێزە عێراقییەکان، کەرکوک و کێڵگە نەوتییەکانی کەرکوک و ناوچە جێ ناکۆکەکانی تر، پاش کشانەوەی پێشمەرگە بە گفتوگۆ، خستەوە ژێر دەسەڵاتی خۆیان.

لە ئێستادا حکومەتی هەرێمی کوردستان لەڕووی ئابوری و سیاسیشەوە کەنار گیرکراوە. هەرچەندە حکومەتی هەرێم لە

کاردانەوەی شکستی سیاسی و پێشڕەوی هێزە عێراقییەکان بۆناوچە جێناکۆکەکان پێشنیازی سەرکردنی ئەنجامی ڕیفراندۆمی خستە بەردەم بەغدا، بەڵام حکومەتی عێراق داوای هەڵوەشاندنەوەی ئەنجامی ریفراندۆم دەکات. ریفراندۆم زیاتر بووە هۆی قوڵبوونەوەی قەیرانەکان و نوێبوونەوەی ناکۆکیەکان. سەرکردایەتی هەرێم پێشتر جەختی دەکردەوە کە هەرێم سیستمێکی دیمکۆراسی عەلمانی پەیڕەو دەکات و لەڕووی ئابوری و سەربازییەوە گەشەی کردووە، بەڵام لەراستیدا هەرێم کە لەڕووی بەرێوە بردنەوە شکستی هێنا بوو، ماوەیەی زۆرە لەڕووی ئابورییەوە هەرەسی هێناوە، لەڕووی دامەزراوەییەوە لاوازە و لەڕووی سیاسیشەوە دابەشبووە.

## دەقی نامەکەی (ڕێکس تیلەرسن)ە، وەزیری دەرەوەی ئەمریکا کە دوو ڕۆژ پێش ریفراندۆم بۆ بارزانی ناردبوو:

سەرۆک بارزانی بەناوی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا ڕێزی زۆر بۆتان و خەڵکی هەرێمی کوردستانی عێراق دەنوێنین، پێکەوە چەندین دەیەیە پەیوەندییەکی مێژوویی لەنێوانمان بنیادنراوە وە مەبەستی ئێمەیە وە پەیوەستبوونیشمانە بەوەی ئەم پەیوەندیە بەهێزتر بکەین بۆ چەندین دەیەی تر لە سێ ساڵی ڕابردوو بەتایبەت، هاوبەشیە بەهێزەکان وە بڕیاری ئازایانەی تۆ بۆ هەماهەنگی تەواو لەگەڵ هێزە ئەمنیەکانی عێراق بووە هۆی تێکشکاندنی شەپۆلی داعش. ئێمە ئەوە بەرز دەنرخێنینەوە هەرگیز قوربانیدانی پێشمەرگە لەبیرناکەین لە شەڕی هاوبەشمان دژ بە تیرۆریزم.

لەئێستادا پرسیاری ریفراندۆم لەبەردەممان دایە کە بڕیارە لە ٢٥ ئەیلول سازبکرێت دەربارەی ئایندەی هەرێمی کوردستان. ئێمە نیگەرانیەکانی خۆمان دەردەبڕین. ئەم نیگەرانیەش وەک شەڕی بەردەوام دژی داعش، لەوانەیە ئۆپەڕاسیۆنی حەویجە نادڵنیایی هەرێمی لە ناوچەکە وە پێویستی تەرکیزکردن لە گێڕانەوەی ئارامی بۆ ناوچە ڕزگارکراوەکان بەشێوەیەک نەهێڵن داعش هەرگیز بگەڕێتەوە. بەم هۆیەوە داواتان لێدەکەم بەدیلەکە قبوڵ بکەن، کە ئێمە باوەڕمان وایە کە باشتر یارمەتیتان دەدات بۆ بەدەستهێنانی خەونەکانتان، وە دڵنیایی دەدات لە ئارامی و ئاشتی لەبەرامبەر پێویستی شەڕ دژی داعش.

ئەم پرۆژە بەدیلە چوارچێوەیەکی تازە وە خێرا دروست دەکات بۆ دانوساندن لەگەڵ حکومەتی ناوەندی و سەرۆک وەزیران عەبادی، ئەم

چوارچێوە خێرایە ئەجندایەکی کراوە لەخۆ دەگرێت بۆ یەک ساڵ زیاتر درێـژە ناکێشـێت وە دەتوانرێـت درێـژ بکرێتـەوە، ئامـانجی ئەمـەش چارەسەرکردنی هەموو کێشە هەڵواسراوەکانی نێوان هەولێر و بەغداد و سروشتی ئایندەی پەیوەندی نێوان هەردوولا وە پێویستە دارای ئەمنیە ئاینیەکان لەبەر چاو دەگرین.

جەنابی سەرۆک من لە ترس و نیگەرانیەکانتان لە دەیەی ڕابردوو تێدەگەم، بەڕاستی ئەو هەڵە مێژوویی و ئازارانەی دەرحەق بە کورد کراون، لەساڵی ١٩٢١ یەوە لەبەرچاو گیراون، ئێمە هاوڕاین لە پێویستی و داواکـاری سـەرجەم ڕەگـەز و پێکهاتـە و ئیتنیکیـەکان کـە لـەم زەوییـە مێژوویـەدا دەژیـن دابیـن دەکـات، ئەمـە بنەمایـەکی گرنگـە بـۆ ئاسایشـی هەرێمەکەتان و پاراستنی ئاسایشـی نیشـتمانی خۆتـان، لەبـەر هـەموو ئـەم هۆکارانـە ئـەوە سیاسـەتی ویلایەتـە یـەکگرتووەکانی ئەمریکایـە لـەژێر ئیدارەی سەرۆک ترامپ کە هەموو شتێک بکەین کە لەتوانای ئێمە دایە بۆ چارەسـەرکردنی کێشـە هەڵپەسـێردراوەکانی نێـوان هـەولێر و بەغـداد و دڵنیای بدەین کە هێز و قورسای تەواوی ئێمـە لە پشت ئـەم چوارچێوەی دانوسانەوەیە، لەوەش زیاتر ئێمە ئامادەین بۆ کارئاسانی کردن بۆ ئەوەی ئەنجومـەنی ئاسـایش بـە زوتـرین کـات ئـەم بەدیلـە پەسـند بکـات و بـۆ پشتیوان زیاتر بەشداری تەواوی نەتـەوە یەکگرتووەکان مسـۆگەر دەکـەین بە هاوبەشی لەگەڵ هاوپەیمانەکانی وەکو بەریتانیا و فەڕەنسا.

ئەمە دەرفەتێکی ناوازەیە کە ئێمـە بە ئەوپەڕی ڕێزەوە داوا دەکـەین قبوڵی بکەن، وەک بەدیل بۆ ئەم ڕیفراندۆمـەی ئێسـتا، ئێمـە باوەڕمـان وایـە ئەم ڕیفراندۆمە دەرنجامی مەترسیداری دەبێت، دەبێتـە هـۆی پاشەکشـە لـە

ئامانجەکانمان، بە لەبەرچاوگرتنی مێژووی گەلی کورد ئێمە دەزانین تۆ ئەم پرۆژەیە بۆ دیالۆگ وەک دوا چانس تەماشا دەکەیت، ئێمە باوەڕمان وایە کە ئەمە چانسێکە کە شیاوی ئەوەیە قبوڵی بکەن بەتایبەت دوای سەرکەوتنە مێژوویەکانی ئێوە دژ بە داعش و هەمە ئاهەنگی بێپێشینەی سوپای عێراق و پێشمەرگە و کۆمەڵگەی نێودەوڵەتی.

لە کۆتای ئەم پرۆسەیەدا بە بێ گومان ئەگەر گفتوگۆکان نەگەیشتنە دەرئەنجامێکی قبوڵ کراو بۆ هەردوولایان شکستی هێنا بەهۆی نەبوونی نیاز باشی لەلایەن بەغداوە ئێمە داندەنێین بەپێویستی سازکردنی ڕیفراندۆم وەکو پشتیوانی ئیلتیزامی ئێمە بۆ سەرخستن و پشتیوانی کردنی ئەم دیالۆگە وەک بەدیلێک بۆ ڕیفراندۆم ئێمە داوای ئیلتیزامی ئێوە دەکەین لەم خاڵانەدا:

دانوساندن کردن لەگەڵ بەغداد خاڵی سەرەکیە بۆ لێکتێگەیشتن و ڕێکەوتنی هاوبەش بۆ سروشتە ئایندەی پەیوەندی نێوان هەرێمی کوردستان و حکومەتی عێراق، ئەمەش بەبوونی فیدراڵیزمێکی کارا یان شێوەیەک لە کۆنفیدراڵیزم یان سەربەخۆی. پێویستە لەسەر بنەمای ڕێکەوتن و دانوساندنی ئاشتیانە بێت.

دووەم: هەرێمی کوردستان و هێزی پێشمەرگە وەک هاوبەشی گرنگی هاوپەیمانی نێودەوڵەتی دژی داعش بمێنێتەو ە و پشتیوانی هاوپەیمانی بەردەوام بێت، ئێوەش بەردەوام بن لە هەمەئاهەنگی مێژووی لەگەڵ هێزە ئەمنیەکانی عێراق. ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا هەوڵەکانی خۆی خێراتر دەکات بۆ پێکهێنانی میکانیزمی ئاسایشی هاوبەش بە تایبەت لەناوچەکانی وەک شەنگال کە دوای داعش نائارامی

تێدا ماوە، پێویستە هەردوو لامان کاربکەین بۆ دابین کردنی ئاسایش بۆ ناوچە هەستیارەکان.

سێیەم: سنوری هەرێمی کوردستانی عێراق بەدانوساندن لەگەڵ عێراق یەکلایی دەبێتەوە،بەپێی بڕگەکانی ماددەی ١٤٠ی دەستور،ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بەهاوبەشی لەگەڵ یوئێن و حکومەتی عێراق کاردەکات بۆ خێرا جێبەجێ کردنی ئەمە لەهەمان ئەو سەقفە زەمەنیە کە لەسەرەوە باس کراوە.

چوارەم: ئێمە چاوەڕوان دەکەین ئێوە هەوڵەکانی خۆتان بخەنە گەڕ بۆ هەمەئاهەنگی کردن لەگەڵ حکومەتی ئێستای عێراق بەسەرۆکایەتی دکتۆر حیدر عەبادی و بەشداری کردن لە هەڵبژاردنی نیشتمانی لە نیسانی ٢٠١٨.

ڕۆڵی ئیجابی خۆتان لە بەغداد بخەنە گەڕ بۆ دروست کردنی حکومەتی داهاتووی عێراق لەدوای هەڵبژادنەکان، سەرکردایەتی ئێوە وەک پیاوی دەوڵەت زۆر گرنگە بۆ دابین کردنی ئارامی بۆ تەواوی ناوچەکە دوای شەڕی داعش.

هاوشانی چوارچێوەی دیالۆگ ئێمە پشتیوانتان دەکەین بۆ بەخێرای چارەسەرکردنی ئەم گرفتانە لەماوەی یەک ساڵدا:

یەکەم: جێبەجێ کردنی تەواوی ڕێکەوتنەکانی بواری دابەشکردنی دەسەلات و سەروەت.

دووەم: جێبەجێکردنی ماددەی ١٤٠.

سـێیەم: چارەسـەرکردنی کێشـەکانی تـر وەک پێشـمەرگە و فڕۆکـەوانی مەدەنی و نوێنەرایەتی دیبلۆماسی و ئەوانی تر.

ئێمـە باوەڕمـان وایـە ئـەم نامەیـە وە ئازایـەتی ئێـوە بـۆ بڕیـاردان بنەمایـەک دەبێت بۆ دەرفـەتێکی مێـژووی لـەنێوان هـەرێمی کوردسـتان و ئـەمریکا و حکومـەتی عێـڕاق، لـەدوای قوربـانی دان و سـەرکەوتنی هاوبەشمان بەسەر داعشدا بەناوی گەلی ئەمریکا و سەرۆک دۆناڵد تڕامپ و تەواوی تیمی ئاسایشی نیشتمانی شەڕەفمەندین بەکارکردن لەگەڵ ئێوە.

ڕێزی زۆرم

**ڕێکس تیلەرسن.**

## بارودۆخی شاری کەرکوک بەر لە شانزەی ئۆکتۆبەر

کێشەی کەرکوک لەنێوان کورد و ناسیۆنالیستی عەرەبی لە عێراقدا شتێکی نوی نیە و ئەم کێشەیە بۆ دەیان ساڵ بەر لەئێستا دەگەڕێتەوە، لەدوای دامەزراندنی حکومەتی عێراقەوە بەهۆی دەوڵەمەندی سەرچاوە سروشتیەکان و بەرهەمهێنانی نەوت، هەوڵی گۆڕینی دیمۆگرافیای داوە، ئەم پرۆسەیە قۆناغ بە قۆناغ جێبەجێ دەکرا، لە نیوەراستی سیەکانی سەدەی رابردوودا چەندین هۆزی عەرەبییان لەناوچەکانی دیالەوە بۆ باشور و بەشێک لەرۆژئاوای ئەم شارە گواستەوە و خاک و ئاوی هۆزە کوردیەکانی ئەم ناوچەییان پێ بەخشین، لەدوای هاتنی رژێمی بەعس لە ١٩٦٨، ئیتر پرۆسەی بەعەرەب کردن بوو بە پیلانێکی ستراتیژی ئەرکی سەرەکییان و بودجەی بۆ تەرخان کرا و هەزاران خێزان بۆ نێو کەرکوک و دەوروبەری گواسترانەوە، هەوڵی گۆڕینی دیمۆگرافیای شارەکە بە چڕی خرایە بواری جێبەجێ کردنەوە. لەدوای روخانی حکومەتی بەعس لە٢٠٠٣، دوای دروست بوونی ئەنجومەنی حوکم لەعێراقدا کێشەی کەرکوک خزێندرایە نێو ماددەیەکی یاسایی بەناوی ماددەی (٥٨)، دوای دانانی دەستووری هەمیشەیی ئەم ماددەیە گواسترایەوە بۆ نێو دەستووری هەمیشەیی و لە ماددەی ١٤٠دا داڕێژرایەوە، چارەسەرکردنی کێشەکانی شارەکە ئاماژە بەچەند قۆناغێک دەکات و دواین قۆناغ پێویست بوو لە ٢٠٠٧/١٢/٣١ تێپەڕ نەکات، بەڵام ئەو کارە ئەنجام نەدرا و یەکلاکردنەوەی چارەنووسی شاری کەرکوک بەئەنجام نەگەیشت، لەدوای هاتنی داعش لە ٢٠١٤، بارودۆخی شارەکە لەلایەن هێزەکانی کوردستانەوە بەڕێوە دەبرا و پارێزگار و ئەنجومەنی پارێزگار لەڕووی

ئیداریەوە کاروباری شارەکەیان بەڕێوە دەبرد و هێزەکانی پێشمەرگەش لەچوار دەوری شارەکە بەخوێنی خۆیان پارێزگاریان لەئاسایش و ئارامی شارەکە کرد و بەرەنگاری گەورەترین و سەرسەخترین دوژمنی مرۆڤایەتی بوونەوە، کە داعش بوو، بەڵام لەنێو ئەم شارەدا کێشە گەلی زۆر هەبوون کە دەسەڵاتداریێتی شارەکە و پارتە سیاسیەکان بەدەستیەوە دەیاننالاند، نەک هەوڵی نەدا چارەسەرکردنی کێشەکانی بکات، بەڵکو ڕۆژ بەڕۆژ کێشەکان قوڵتر دەبوونەوە و دەرکەوتەکانی ئاشکراتر و ڕوونتر دەبوونەوە.

**بۆیە لێرەدا پێویستە ئاماژە بەهەندێک لەو کێشانە بکەین کە بریتین لە:**

١. کێشەی نێوان پارتیە سیاسیەکانی کوردستان دەردێکی کوشندە بوو کە بەرۆکی شارەکەی گرتبوو، بوونی دوو ئاسایش و دوو بۆچوونی جیاواز و ململانێی سەختی حزبایەتی، بەتایبەتی لەنێوان یەکێتی نیشتمانی کوردستان و پارتی دیموکراتی کوردستان. ئەم ململانێیە لەزۆربەی جومگەکانی حکومرانی رەنگیدابووەوە و فاکتەرێکیش بوو بۆ ئەوەی نەتوانرێت سیاسەتێکی سەرکەوتوو لەشارەکەدا پیادە بکرێت. گواستنەوەی بەشێک لەم کێشانەوە بۆ بەغداد کارێکی تر بوو کە کاریگەری لەسەر یەکریزی نەتەوەیی دروست کرد.

سەبارەت بەو چەک و کەرەسە سەربازییانەی کە بۆ هێزی پێشمەرگە دەهات. وەستا لێپرسراوی میحوەری چواری باشووری کەرکوک دەڵێت: ئێمە لە ٢% ی ئەو چەکانەی هاوپەیمانان بەهەرێمی کوردستانیان دەدا سودمەند نەبوین و کۆگاکانی چەک لەلایەن پارتیەوە

قــــۆرغ کرابــــوو، فەرماندەیــــەکی تــــر دەڵێت"نــــەمانتوانیوە بەدیــــدێکی نیشــتمانپەروەری پارێزگــاری لەشــاری کــەرکوک بکــەین، بــەڵکو دوای بەرژەوەندیە تایبەتیەکانی خۆمان کەوتین، لەبری پارێزگــاری لە خەلکـی شــارەکەو و پیــادەکردنی ئەرکــی نیشــتمانی، ســەرقاڵی نــەوت بــردن بــووین و نەمــانتوانی تورکمــان و عەرەبــی شــارەکە لــە خۆمــان رازی بکەیــن. تەنــانەت گەنجەکانمــان لــە هەنــدێک شــوێندا غــەدریان لــە نەتەوەکـانی تـر کردبوو. لە درێژەی قسەکانیدا دەلێـت لە کەرکوکـدا سێ حکـومەت فەرمـانرەوایی دەکـرد (عێراق و پارتی و یەکێتی) جــگە لــەوەی تورکمانەکان دانییـان بە کەسـماندا نەدەنـا، چـونکە نەمـانتوانی بــۆ لای خۆمـان کێشـیان بکەیـن و دڵنیـایی پێ بـدەین. ئەمـەش بـە هۆکـارێکی گرنـگ دادەنرێـت کە نەتەوەکـانی تـە دەسـەڵاتدارێکی کـورد لـەو شــارە رەتـبکەنەوە و یـاخیبن لـە هـزری گەرانـەوەی کـەرکوک بۆ سـەر هـەرێمی کوردستان.

٢. کێشــەکانی نێــو یــەکێتی نیشــتمانی کوردســتان: بەشــی هــەرە زۆری ئیــدارەی شــارەکە لــە لایــەن یەکێتیــیەوە بڕیــاری لێوە دەدرا و شـێوازی بەڕێـوەبردنی دیـاری دەکـرا، ئەوەی هەسـتی پێـدەکرا گرژی لە نێوان مەڵبەنـدی دووی کەرکـوک و پارێزگاری شارەکە (دکتـۆر نجم الدین کەریم) بــوو، لە هەمانکاتدا ئەنـدامی مەکتەبی سیاسـی یەکێتی بــوو، تـا دەهــات ئـەم کێشــانە زەقتـر دەردەکەوتـن و هێرشــی راســتەوخۆ و ناراسـتەوخۆیان دەکـردە سـەریەکتری وتـۆمەتی جیاوازیـان بـۆ یەکتری دروســـت دەکـــرد. جـــگە لـــەوەی لـــە نێـــو رێکخســـتنەکانی شـــارەکە تەکەتـولات بـوونی هەبـووە، بەشـێک لە کادیرەکـان فەرامـۆش کرابـوون.

فەرماندەیەکی پێشمەرگە لای وایە ململانێی نێوان باڵەکانی یەکێتی لە شاری کەرکوک بە گشتی و ململانێی نێوان دکتۆر نەجمەدین و بەشێک لە مەکتەب سیاسیەکانی تر، لە سەردەست بە سەراگرتنی ئابوری شارەکە و کۆنترۆل کردنی داهات بووە.

٣. گەندەلی دەردی هەرە کوشندەی کارکردن لەم شارە بووە و گروپی مافیا ئاسا لە نەتەوەی کورد لەم شارەدا پەیدابووبون، کاری نایاساییان ئەنجام دەدا، بە تایبەتی دژی هاولاتیانی نەتەوەی عەرەب و تورکمان، بێ ئەوەی بتوانرێت ئەم دیاردەیە کۆنترۆڵ بکرێت. لە سەردانێکمان بوو لای سەرۆک کۆماری پێشوتر جەلال تالەبانی لە ٢٠٠٩/٣/٢٧ لە ماڵی خۆی لە دەباشانی شاری سلێمانی، دوای کاتژمێرێک گفتوگۆ هاوڕێیەکمان بە ناوی (س.م) بە مام جەلالی وت چەند گروپێکی مافیا ئاسا لە شاری کەرکوک بوونیان هەیە. بەڵام مام جەلال گرنگی بە وتەکەی نەدا و ئامادە نەبوو زیاتر گوێبیستی ئەو بابەتە بێت.

فەرماندەیەک باسی لەوە دەکرد کە بەشێک لە هێزەکانی پێشمەرگە ببووە پاسەوانی بەرژەوەندیە تایبەتیەکان و دەوڵەمەندبوونی هەندێک لە بەرپرسە سیاسی و سەربازییەکان، ئەمەش بازرگانی کردن بەخوێنی قوربانییەکانەوە بوو.

٤. هەڵدانی ئاڵای کوردستان لە لایەن دکتۆر نەجمەدین کەریمەوە کێشەی زۆري نایەوە بەتایبەت لە لایەن نەتەوەی عەرەب و تورکمانی شارەکە بە تەواوی ڕەتکرایەوە. ئێمە پێمان وایە مەسەلەی ئاڵا تەنها بیانوو بوو، ئەگینا حکومەتی عێراقی بەرنامەی

کۆنترۆڵکردنەوەی شاری کەرکوکی هەبووە و هەموو کاتێک بۆ ئەو ئامانجە هەوڵیداوە لە ٢٠١٤ نوری مالکی ئۆپراسیۆنی دیجلەی بۆ کۆنترۆڵکردنی کەرکوک دروست کرد، لە ڕاستیدا هەڵدانی ئاڵای کوردستان کارێکی دروست و پرۆژەیەکی گونجاو نەبووەو تا ئەنجام دراو پەرلەمانی کوردستان بڕیاری لەم بارەوە نەدابوو، تەنانات باس لەوە دەکرێت ئەم کارە بۆ شاردنەوەی تۆمەتەکانی نەجمەدین کەریمی پارێزگاری شارەکە بووە، زیاتر لەوەی پرۆژەیەکی نیشتمانی بوبێت، باس لەوەش دەکرێت کە مەکتەبی سیاسی یەکێتی نیشتمانی کوردستانیش ئاگاداری ئەو بڕیارە نەبووە.

ه. گفتوگۆی هێزی پێشمەرگە و هێزە عێراقیەکان: ئامانجی هێزە عێراقیەکان گەرانەوە بوو بۆ پێش ڕووداوەکانی ٢٠١٤ و بەر لەهاتنی داعش، بەلآم کورد رازی نەبووە ئەو ناوچانە ڕادەستی حکومەتی عێراقی بکاتەوە. وەستا رەسول دەڵێت" ئێمە گفتوگۆمان لەگەڵ هێزەکانی عێراقدا هەبوو، لە ٩/٢٤ شاندی هێزەکانی عێراق سەردانی ئێمەیان کرد. بڕیاربوو ٢٥ مانگیش بێنەوە" بەرپرسانی سوپای عێراق رایانگەیاند کە بە هۆی ریفراندۆمەوە نەهاتوینەتەوە. بەلآم ریفراندۆم باروەدۆخی پەیوەندییەکانی نێوان هێزەکانی پێشمەرگە و هێزەکانی عێراقی گۆڕی و هەلویستی حکومەتی عێراقی چووە قۆناغێکی نوێوە، لە هەمانکاتدا بۆ ئێمە سەخت بوو، کە هێزەکانی حکومەتی عێراقی هاوکار و هەمە ئاهەنگی یەکتربووین لە شەڕی دژ بە داعش و کۆبونەوە و سەردانی یەکترتیمان دەکرد لەو ماوە کورتەدا وەکو دوژمن مامەڵەیان لە گەڵدا بکەین. لە کاتێکدا سەرکردە

سەربازییەکانی عێراق وەکو دوژمن قسەیان لەگەڵ ئێمەدا نەدەکرد، کە بەشێکیان لە کورد بوون. تەنانەت لەکاتی پێشڕەوی و جوولە سەربازییەکاندا نامەی ئاگادارکردنەوە و نەخشەوی جولە سەربازییەکانیان بۆ دەناردین تەنانەت لەنامەکاندا بەبرای خۆشەویست نامەکانیان ئاراستە دەکردین.

سنور میدیا وتەیەکی حەیدر عەبادی لە ڕۆژنامەی لۆس ئەنجلس تایمز گواستۆتەوە و دەڵێت: لە سەرەتای ڕیفراندۆمەوە وتومانە ئێمە هاوڵاتی یەک وڵاتین. ئەمە بە خوێن دەپارێزین- واتە جیابونەوە و ریفراندۆم قبول ناکەین، ئەمە هەڵەیە و بڕیاری تاکلایەنە و جیابونەوە و سنوردانان هەڵە بووە. هەڵبەتە ئەم جۆرە هەرەشانەدی حەیدەر عەبادی چەندین جار ئاراستەی سەرکردایەتی کورد کرا.

٦. پاشەکشەی یەکەم: تالیب مام فاروق دەڵێت: دوای کۆبوونەوەی سەرکردەکانی پێشمەرگە لەرۆژی ١٤ی ئۆکتۆبەر بڕیارماندا هێزەکانمان بۆ سەنگەرە بەردینەکانی ئەم بەرئاوەکە پاشەکشە پێبکەین. چونکە ئێمە هێزەکانمان لە پانتاییەکی فراواندا بڵاوکردبۆوەو ئالیاتی سەربازی حکومەتی عێراقی زۆر بە ئاسانی دەیتوانی هێزەکانمان تێپەڕ بکات، بە مەبەستی تۆکمەکردنی پێگەی جەنگی هێزەکانمان ئەوکارەمان ئەنجام دا. هەروەها دەڵێت: هێزەکانی سوپای عێراق سەردانی سەنگەرەکانی ئێمەیان کرد لە میحوەری چوار، بە پاساوی هێرش بۆ سەر قەزای حەویجە و چەندین وێنە و ڤیدیۆییان تۆمار کرد؟!

هێزەکانی عێراقی لە لایەن ئێرانیەکانەوە ئاراستە دەکران، لە ڕۆژی ١٦ی ئۆکتۆبەر لە کاتی تێکەڵکردنی جیهازەکاندا گوێمان لێ دەبوو بە فارسی قسەیان دەکرد ئەوەی جێگەی سەرنجە هێزەکانی پێشمەرگە لە تێکرای پاشەکشەکاندا بە شێوەیەکی نیمچە هەرەمەکی پاشەکشەیان کردووە، تەنانەت لەوە دەچێت دوای ئەوەی بڕیاری پاشەکشەیان دابێت ئیتر نەیانتوانیووە بە سەر هێزەکانیاندا زاڵ بن و کۆنترۆڵی بکەنەوە. ئەمەش بە خاڵی لاواز بۆ سەرکردە سەربازییەکان دادەنرێت.

لاهوری شێخ جەنگی فەرماندەی هێزەکانی دژە تیرۆر دەڵێت: بڕیار وابوو لە ١٢مانگ هێرشی سوپای عێراق ئەنجام بدرێت. هەولماندا لە ڕێگەی گفتوگۆوە کێشەکە چارەسەر بکەین و لەگەل سوپای عێرقدا ڕووبەری هێرش نەبینەوە. بۆیە داوامان کرد ٤٨ سەعات پێشڕەویان ڕاگرن بۆ ئەوەی کارێک ئەنجام بدەین و هێرش ئەنجام نەدرێت، بەڵام بەهۆی ئامادە نەبوونی مەسعود بارزانیەوە کۆبونەوەکەی دوکان بۆ ١٥ی مانگ دواخرا، بۆیە ناچاربوین داوای٢٤ سەعاتی تریش بکەین، بۆ ئەوەی بەگفتوگۆ چارسەری کێشەکان بکرێت، بڕیاربوو بە نێوەندگیری هێزەکانی هاوپەیمانان هێزەکانی عێراق بێنە سەربازگەی کەیوان و شارەکە بە هەماهەنگی بەڕێوە بەرین، بەلام کۆبونەوەکەی دوکان هەرەشەکانی بە هەند وەرنەگرت.

وەستا ڕەسول فەرمانی بە هێزەکانی پێشمەرگە کرد دەست پێشخەری هەڵگیرسانی جەنگ نەکەن. بەڵام کەمال کەرکوکی فەرماندەی میحوەری پێنج. زیاتر باسی لە حەشدی شەعبی دەکرد و

بە ترسنۆک و بێبەها تەماشای دەکردن، دەیوت دەتوانین دژیان بجەنگین ئاگری شەری خۆش دەکرد . چەندین فەرماندەی تری بەرزی وڵات مەیدان خوازییان دەکرد و ئاماژەیان بەوە دەکرد کە خوازیارن هێزە عێراقیەکان هێرش ئەنجام بدەن لەوانە وەستا رەسول و هێمن هەورامی و شێخ جەعفەر و کەمال کەرکوکی... تەنانەت مەسعود بارزانی لای وابوو کە بە هیچ شێوەیەک هێرشی سەربازی ئەنجام نادرێت، رەنگە ئەمە هۆکارێک بوو‌بێت بۆ ئامادەبوونی ئەو مەیدان خوازییە، چونکە کاتێک هێرش کرا هەموو هەرەشە و لێدوانەکان پێچەوانە بوونەوە و کەوتنە تاوانبارکردنی یەکتر و هێرشی دەزگاکانی راگەیاندن بۆ سەر یەکتری، بە شێوەیەک کە راستیەکان ون کران.

هێزەکانی حکومەتی عێراقی لە سەنگەرەکانی پێشمەرگە بەشێوەیەک نزیک ببونەوە لە هەندێک سەنگەردا پێشەوەی هەمەرەکانیان بە سەنگەری پێشمەرگەوە نوسابوو، جموجۆلی ناجۆریان ئەنجامدا، سەرەرای ئەوەی لە شوێنی جیاوازەوە پەیاممان بۆ دەهات کە شەر روونادات و سوپای عێراقیش رایانگەیاند ئێمە شەری پێشمەرگە ناکەین، تەنها هاتووین بیرە نەوتەکان بگرینەوە، هێزەکانی سوپای عێراق دەیانویست بە ئاراستە هێزەکانی پێشمەرگە پێشرەوی بکەن داعش تەقەی لێیان کرد و پاشەکشەیان کرد، دواتر هەوڵیاندا لە خاربەروت و گوندی مەلا عەبدوڵلاوە پێشرەوی بکەن لەوێشەوە شکستیان هێنا.

بریارێک هەبوو رۆژی چوارشەممە ١٢ ئۆکتۆبەر بۆ نێو شاری کەرکوک یان دوایین خالەکانی چوار دەوری شارەکە پاشەکشە بکەین، بەلام لەرۆژی سێ شەممە ١١ی ئوکتۆبەر لە میحوەرەوە پەیام هات کە پاشەکشە ناکەین، ئێمە هەرگیز بیرمان لەوە نەدەکردەوە، سوپای عێراق بە گلۆپی سەوزی ئەمریکیەکان هێرشمان بکاتە سەر لامان وابوو ئەمریکا رێگە بەو کارە نادات. بەرگری بۆ ئێمە سەخت بوو، چونکە ئەو سەنگەرانەی بۆ شەری دژی داعش دروست کرا بوون بۆ شەرکردن دژی هێزەکان لە عێرقی لەبارو گونجاو نەبوون . یاسین دەربەندی دەڵێت ئێمە تەنها ٣٠ مەتر لە سوپاکەی عێراقەوە دوور بووین، جگە لە تانک و تۆپ و دەیان هەمەرو باجەر ٢١ هاوەنیان بە ئاراستەی سەنگەری ئێمە دانا بوو چاوەڕوانی ڕووداوەکان بووین، هەر چەندە چاوەروانی کاریگەری خراپی کردبوو، لەسەر گیانی بەرگری هێزەکانمان هەبوو.

٧. بەگشتی حکومەتی هەرێمی کوردستان بەشێوەیەکی گونجاو نەیتوانیوە لەئاستە بالاکاندا بەشداری بەکەمە نەتەوەکان بکات و لەپۆستە بالاکاندا شوێنی شیاو و دەسەلاتی پێ بدات بۆ نموونە جێگری سەرۆکی هەرێم یان جێگری سەرۆکی حکومەت یان وەزارەتی ناوەخۆ و دارایی، بەڕێوەبەری ئاسایش... هتد.

## هۆکارەکانی ڕوودانی شانزەی ئۆکتۆبەر

### یەکەم: ئەنجامدانی ڕیفراندۆم

ئەنجامــدانی ڕیفرانــدۆم لەو هەلــومەرجەی کــە کوردســتان پێــی دا تێدەپەری، هەڵەیەکـی سیاسـی زۆر گەورە بـوو، لـەوە خراپتر حیساب نەکــردن بــوو بــۆ سیاســەتی ئەمریکــا دەرحەق بــە کــات و زەمینــەی ریفراندۆم و ڕێکـارە فەرمیەکـانی و نەتەوە یەکگرتووەکان و ئەنجـومەنی ئاسـایش و حیسـاب نەکـردن بۆکاردانەوە توندەکانی تورکیا و عێراق و ئێـران و نەخوێنـدنەوەی لۆژیکــانە بــۆ هەلــومەرجی نــاوچەکە، بەو هــۆیەوە زیــانێکی زۆر گەورەش بەر نەتەوەی کــورد کەوت، ئەوەی هەمــوو خــەلکی کوردسـتان و لایەنـە سیاســیەکان لـە ســەری کــۆکن. ئامـانجی هەمـوو شـۆرش و راپەرینەکـان لە دوا قۆناغــدا ڕوون ئاشـکرا بـووە، جا چ جاردرا بێت یان شـاراوە بێت. ئەوەش پێویسـتی بە بنـاغەو دارشـتنی یاسـایی و سیاسـی و کـۆمەلایەتی و ئـابوری و ئەخلاقی هەیـە، ریفرانـدۆم ئەوەنـدەی ئیعلامــی و گوتــاری نــیە، چونکـە بــە جـاردان و راگەیاندن دروست نابێـت، یاسـر عەرەفــات لـە ســالی ١٩٨٨ وە جــاری دەولەتــی فەلەســتینی داووە، ســـەرەڕای ئەو هەمـــوو پشـــتیوانیە نێــو دەوڵەتیە و بڕیاری ٢٤٢ نەتەوە یەکگرتووەکان. چونکە ئامادەکاری نـەکرد بوو، سەرکەوتوو نەبوو

ئەنجامــدانی ریفرانــدۆم لــە شــاری کەرکــوک نــارەزایی زۆری لـێکەوتەوە و هێرشـی حکـومەتی عێراقی چـالاک تـر کرد و شــەرعیەتی پێــدا، بەمەش پێشــمەرگە پشـتیوانی نێـودەولەتی لـە دەســتدا، لـە لایەن بەشـــی زۆری کـــادیرانی ی.ن.ک لـــە شـــاری کەرکـــوکەوە ئەنجامـــدانی

ریفراندۆم رەتکرایەوە، کە ریفراندوم لە ٢٥ ئەیلولدا ئەنجام بدریت، ئەمەش کێشەی لە نێوخۆی ریزەکانی ی.ن.ک دا زەقتر کردەوە و کاریگەری نەرێی لە سەر روداوەکانی ١٦ ئۆکتۆبەردا هەبوو.

لە ٢٠١٧/١٠/١٦ لە ریگەی تەلەفیزیۆنی ئاسمانی گەلی کوردستانەوە لاهوری شێخ جەنگی لێپرسراوی هێزەکانی دژە تیرۆر رایگەیاند کە ریفراندۆم بنەمای یاسایی نەبووە، پارتی دیموکراتی کوردستان دەیویست یەکێتی لەم شارە بشکێنێ و ئەم ریفراندۆمە سەرچاوەی نەگبەتیەکان بووە و مەبەستی شکست پێهێنانی یەکێتی بووە، بەلام مەسعود بارزانی دەڵێت: کاتێکی گونجاو بوو بۆ ریفراندۆم، سوپای عێراق پێش ریفراندۆم نیازی هێرش کردنیان هەبووە، ریفراندۆم تەنها بیانو بوو، ئەو هەلەیەی کردمان ئەوە بوو کە دەبوایە زوتر ریفراندۆممان ئەنجام بدایە. دیارە جەخت کردنەوە(اصرار) و گوێنەگرتی مەسعود بارزانی هۆکاری سەرەکی لە دەستدانی روبەرێکی گەورەی زەوی بوو، چونکە حکومەتی عێراقی تەنها داوای ناوچەکانی پێش ٢٠١٤ دەکرد، بەلام ئێستا خاکی زیاتری لە دەستداوە، لە کاتێک دا بارزانی گریمانەی لە دەستدانی پشتیوانی ئەمریکای رەچاو کرد بوو، ئەوە رویدا ولەکاتی هێرشی سوپای عێراق بۆ شاری کەرکوک، حکومەتی ئەمریکا بێلایەنی هەلبژارد، ئەمەش دەستی سوپای عێراقی ئاوەلا کرد بۆ ئەنجامدانی هێرشەکەی و دەسەلاتداریتی کوردی لە گۆرەپانەکەدا تەنها هێشتەوە و سەلماندی دۆستی کورد تەنها چیایەکانن.

لەو بارەیەوە ڕێکخەری گشتی بزووتنەوەی گۆڕان عومەری سەید عەلی دەڵێت پشکی زۆرینەی شکستەکان دەکەوێتە ئەستۆی

مەسعود بارزانی، هەروەها رەوەندی مەلا مەحمود، جێگری لێپرسراوی مەلبەندی کەرکوکی یەکێتی. لە چاوپێکەوتنێکی رۆژنامەی هەوالٚ دا، دەڵێت "مەسعود بارزانی لە ١٣ی ئەیلول) چەند ڕۆژێک بەر لە ریفراندۆم ( سەردانی کەرکوی کرد، لە کۆبوونەوەیەکدا هەموویان لە ئاست بەرپرسیارێتیدا بوون، لەناویاندا هەریەک لە دکتۆر نەجمەدین و شێخ جەعفەر و ئاسۆ مامەند و سەلاح دەلۆو کۆمەلێک کادری مەلبەند و لق و کەمال کەرکوکی ئامادەبوون "ڕەوەندی مەلا محمود، لە بارەی ناوەرۆکی کۆبوونەوەکە، ئەوە دەخاتەروو، ئاسۆ مامەند زۆر بە جددی باسی کەرکوی کرد، هەموو ئەو مەترسیانەی خستەروو کە دوای ریفراندۆم ئەگەری رودانیان هەیە. ئاماژەی بەوەش کرد. ئەنجامدانی ئەم ریفراندۆمە زەرەری گەورەی تێدا دەکەن. بەپێی وتەی ناوبراو، لە دوای قسەکانی ئاسۆ ئەلمانی. سەلاح دەلۆ، سەرۆکی ئەنجومەنی سەرکردایەتی پارتی لە کەرکوک- گەرمیان. پشتگریی قسەکانی ئاسۆ مامەندی کرد، بەلاٚم وتی "ریفراندۆم ئەو مەترسیانەی نابێت". رەوەند. ئاشکراشیکردووە. بەر لە کۆبوونەوەکەیان لەگەلٚ بارزانی لەمەلبەندی کەرکوک کۆبوونەوەیەک کرابوو، کۆنوسی کۆبوونەوەکەش داربووە ئەو بۆ ئەوەی لەکۆبوونەوەکەیان لەگەلٚ بارزانی بیخوێنێتەوە. دواجار هەموو ئەو خالاٚنەم خوێندەوە کە لە کۆنوسەکەدا هاتبوو.

لەکۆتایدا بە مەسعود بارزانی وتووە " ئێمە تکات لێدەکەین کەرکوک بەرگەی ئەو بارودۆخە ناگرێ، ئەو برادەرانەی کە زانیاری دەدەن بە تۆ، راستگۆ نین". هەرچەند بەشێک لەبرادەرانی مەکتەبی

سیاسی یەکێتی. زۆریان پێناخۆش بوو، کە ئەو قسەیەم کرد. ئەو بەرپرسەی یەکێتی، ئەوەشی خستەڕوو، مەسعود بارزانی لە کۆبوونەوەکەدا بە ئاشکرا بە ئەوانی وت " ئەگەر ئەم ریفراندۆمە سەرکەوتوو نەبوو، بەڵێن بێ ئەم ولاتە بەجێدەهێلم و دەچم لەجەزیرەیەکدا دەژیم.

هەر لەو بوارەدا دینیس ناتالی لە بابەتێکدا روونیکردۆتەوە، کە کاروان ئەحمەد گوتویەتی: هەڵەی یەکەمی حکومەتی هەرێم ئەوە بوو بۆ ئەنجامدانی ریفراندۆم لەبڕی ئەوەی پشتگیری عێراقییەکان بۆ دروستکردنی دەوڵەت بەدەست بهێنێت بەشێوەیەکی بەرنامەڕێژی کاری پێشینەی بەدەستهێنانی پشتگیری نێودەوڵەتی بۆ پرۆژەکەی کرد. سەرەڕای نەهامەتیەکان سەرکردایەتی هەرێم دیارە وانە و پەند لەهەڵەی ڕیفراندۆم وەرناگرن. لەبڕی ئەوەی دان بەشکستی ستراتیجیاندا بنێن. بارزانی و سەرکردەکانی دیکەی کورد خۆیان بێبەری دەکەن لەبەرپرسیارێتی کاریگەری و کێشەکانی ڕیفراندۆم. ئەم گروپە لەبری ئەوەی سوربن لەسەر چارەسەری کێشەکانی ناوخۆ و چاکسازی بکەن، پێدەچێت بەردەوام بن لەیاریکردن بەم کارتە سوتاوە و لۆمەی یەکتری دەکەن بۆ شکستەکانیان و باس لە هەڕەشە دەرەکییەکانی وەک ئێران و میلشیاکانی دەکەن.

بۆیە دروستە بلێین ریفراندۆم ململانێ و کێشەکانی نێوان حکومەتی هەرێمی کوردستان و حکومەتی عێراقی توندتر کرد و سەرجەم برینە کۆن و نوێیەکانی کولاندەوە، باردۆخێکی ناجۆری بۆ کوردستان بە گشتی و دەڤەری کەرکوک بە تایبەتی دروست کرد، بۆیە

ئەنجامــدانی ریفرانــدۆم فــاکتەری بەهێــز بــوو بــۆ ڕووداوەکــانی ١٦ی ئۆکتــۆبەر، چــونکە ریفرانـدۆم بڕیـارێکی تــاکلایەنە بــوو ئامــادەسازی نێوخــۆی و نێـودەوڵەتــی و هەرێمــایەتی بـۆ نەکرابــوو، لـەبەرئەوەی دەولەتــانی هەرێمــایەتی زۆر بـە خێـرایی دژی وەســتانەوە و هەنگــاوی کرداریــان بۆ شـکستپێهێنـانی نا لەو بارەیەوە هیـوا رەش دیلێـت ئێمـە لـە بـەرەکانی پێشـــەوە ئاگـاداری ئەو مەترســیانە بــووین کـە هەنگــاو بــە هەنگـاو لێمـان نزیکتر دەبێتەوە و ئەو پێشهاتانەمان بۆ مەسعود بارزانی باس کردبوو، بەڵام پێیان وتین کە قۆناغی سەعد ئاباد تێپەڕیوە و کێشـە و کاری سەربازی ڕوونادات، ئێمە ئاگاداری کۆبونـەوە سـەربازیەکانی ئێران و تورکیا بووین، هێزەکانی هاوپەیمانان بە سـەرکردایەتی ئـەمریکا تێبینیـان لەســەر ئەنجامــدانی کــاتی ڕیفرانــدۆم هــەبوو، هیــوا رەش لــە درێــژەی قســەکانیدا دەڵێـت : ئەمریکیــەکان ئامۆژگــاری ئێمــەیان دەکـرد بـەرەنگاری هێزەکــانی عێـراق نەبینــەوە و کێشــەکانمان بــە گفتوگــۆ چارەســەر بکــەین، چونکە ئـەوان نـاتوانن بـەهیچ شـێوەیەک هاوکـاری سـەربازی پێشکەش بە ئێمـە بکـەن، وەسـتا رەسـول دەڵێت ئێمـە ئاگاداری مەترسیەکان بـووین و نەماندەویست ریفراندۆم ئەنجام بدرێت ئەگـەر ئـەنجامیش بـدرێت پێویسـتە لەناوچە دابڕێندراوەکان ئـەنجام نـەدرێت، تەنانـەت شـەوی پێش ڕیفرانـدۆم ویسـتمان بەیاننامـە دەربکـەین، نـاڕەزای و نـەیاری کـادیرانی یـەکێتی لـە شـاری کـەرکوک بڵاوبکەینـەوە، کـە هاتنـە پێشـەوەی هەڕەشـەکانی هێـزە عێراقیـەکان جدین و هـەموو لایـەکی لـێ ئاگـادار بکەینـەوە، بـەڵام گوێیـان لێنەگرتین و بۆچونەکانمانیان بەهەند هەڵنەگرت. فەرماندەیەک دەڵێت "ئێمـە دەمانزانی ناتوانین زیاتر لـە دوو ڕۆژ بـەرگری لـە شـاری کـەرکوک بکـەین چونکە هێزی سـەربازی عێراق خاوەنی چەکی نوێی گولە نەبڕ بوون لـەنێو

ئالیاتی درعدان و گولە نەبڕن، ئێمە هیچمان لەگەڵیان پێنەدەكرا، چونكە هاوسەنگی لە هێزەكاندا نەبوو، بەتایبەت لە ڕووی چەندایەتیەوە. تالیب مام فاروق دەڵێت " لە ڕۆژی ٢٤ ئەیلولدا قاسمی سولەیمانی فەرماندەی هێزەكانی سوپای قودسی ئێران لە مەكتەبی سیاسی ی.ن.ك لە شاری كەركوك ڕاگەیاند ئەگەر ریفراندۆم بكەن شاری كەركوكتان لێ وەردەگرینەوە، ئەگەر ریفراندۆم ئەنجام نەدەن تەنها لەسەر نەوتەكە ریكەون، كەركوك بەدەستی خۆتانەوە دەبێت.

## دووەم : كێڵگە نەوتیەكانی هاڤانە و بای حەسەن

وەكو ئاشكرایە شاری كەركوك خاوەن داهاتێكی زۆری سەرچاوەی نەوتە، كە بەیەكێك لە سەرچاوە بنەڕەتیەكانی ئابوری عێراق دادەنرێت، لەدوای هاتنی داعش بۆ دەڤەرەكە و پەیدابوونی هەرەشەی جدی لەسەر شاری كەركوك و پاشەكشەی هێزە عێراقیەكان، هێزەكانی پێشمەرگە شوێنیان گرتنەوە و پارێزگاریان لەم شارە كرد و لەپێشڕەوویە خێرا و كاریگەرەكانی داعشیان پاراست، ئەمەش بارودۆخێكی دروست كرد پەیوەندیەكانی شاری كەركوك بەحكومەتی عێراقەوە كێشەی زۆری بۆ دروست بوو، بەتایبەت دوای ئەوەی شاری تكریت و ناوچەكانی چیای حەمرین كەوتنە ژێر كۆنترۆڵی هێزەكانی داعش، پاش ماوەیەك هێزەكانی حكومەتی هەرێم و وەزارەتی سامانە سروشتیەكان دەستیان بەسەر كێڵگە نەوتیەكانی هاڤانە و بای حەسەندا گرت، لەكاتێكدا گفتوگۆی حكومەتی هەرێم لەگەڵ بەغداددا هەبوو، وەزیرە كوردەكان لەشاری بەغداد بوون بەلام وەزارەتی سامانە سروشتیەكان بەهێزەوە دەچنە سەر كێڵگە نەوتیەكان، ئەمەش نیگەرانی زۆری بەدوای خۆیدا هێنا. لێرەوە

بارودۆخەکە پەیوەندیە نێوخۆیەکانیشی بە ئاراستەیەکی تردا برد و دەنگۆی نەوتی دزرا و بەناشەرعی بردن پەیدابوو، هەروەکو لە ڕۆژی ١٦ ئۆکتۆبەردا ئەم دەنگە بە ئاشکرا لە کەناڵەکانی ڕاگەیاندنەوە قسەی لەسەر دەکرا و گوایە لەقازانجی یەک لایەندا ئەم نەوتە سودی لێوەردەگیریێ. نەوتی کەرکوک بەگشتی و نەوتی کێڵگەکانی بای حەسەن و هاڤانە بەتایبەتی بە فاکتەرێکی گرنگ و ناراستەوخۆی ڕوداوی ١٦ ئۆکتۆبەردا ئەژمار دەکرێت. فەرماندەیەک دەڵێت : ئابوری شاری کەرکوک لەلایەن یەکێتیەوە کۆنترۆڵ کرا بوو بەمەبەستی بەرژەوەندی کادیران و دۆست و لایەنگرانی خۆیان سودیان لێوەردەگرت و خەڵکیان پێ ڕازی دەکرد، لەهەمان کاتیشدا یەکێتی، تۆمەتەکانی ئاراستەی پارتی دەکرد و بە سەرچاوەی کێشە دەزانی. لە بەرامبەریشدا یەکێتی تۆمەتی بردنی نەوتی بە ناشەرعی دەدایە پاڵ پارتی دیموکراتی کوردستان تەنانەت لە فرۆشتنی نەوتی کەرکوک لەلایەن وەزارەتی نەوتی هەرێمەوە ناڕازی بوو. نامەی نارەزای ئاراستەی حەیدەر عەبادیش کرد، بەڵام کاریگەری نەبوو.

## سێیەم : ماددەی ١٤٠ی دەستوری عێراقی

بەپێی ئەم ماددە دەستوریە ناوچەکانی کەرکوک ناوچەی کێشە لەسەربوون، کە لەڕێگەی ئەم ماددە دەستوریەوە پێویستە بەقۆناغ چارەسەری کێشە هەڵواسراوەکانی ئەم شارە بکرێت، بەمەرجێک کۆتا قۆناغی چارەسەرکردنی کێشەکان لە ٢٠٠٧/١٢/٣١ تێپەڕ نەکات، بەڵام حکومەتی عێراقی لە ئاست جێبەجێکردنی ئەم ماددەیەدا کەمتەرخەمی کردووە و هەمیشە خۆی لەم ماددە دەستوریە دزیوەتەوە، لەکاتێکدا مێژوو و جوگرافیا و ئامارە نێوخۆیی و نێودەوڵەتیەکان و گەشتنامەکان و نەخشە جیاوازەکان ئەوە دەردەخەن کە ئەم شارە دەکەوێتە نێو خاکی کوردستانەوە، ئەمەش بەیەکێکی تر لەو کێشانە دادەنرێت کە بارودۆخی شاری کەرکوکی گەیاندە ١٦ ئۆکتۆبەر، چونکە ئەم شارە چەقی ململانێکانی نێوان کورد و حکومەتی عێراقە.

## چوارەم : قەزای حەویجە

مانەوە و ڕزگار نەکردنی قەزای حەویجە بۆ دوای ڕزگارکردنی موسڵ بەیەکێک لەو هۆکارە ناڕاستەوخۆیانە ئەژمار دەکردێت کە ڕێگە دەدات بە گەڕانەوە و کۆکردنەوەی هێزەکانی عێراقی لە دەوروبەری شاری کەرکوک، بە بیانوی رزگارکردنی قەزای حەویجە، ئەمە لە حاڵەتێکدا ئەگەر هێزی پێشمەرگەی کوردستان و سەرکردایەتی کوردستان ڕێگەیان بەهێزە هەمەجۆرەکانی سوپای عێراقدا لەشاری کەرکوکەوە بەئاراستەی قەزای حەویجە هێزەکانیان پێشڕەوی بکەن، وەکو ئەو سەرکردانەی کەلەپێش ڕزگارکردنی شاری موسڵ بۆ کەرکوک ئەنجام درا، چەندینجار سەرکردە سەربازیەکانی عێراقی سەردانی بەرەکانی

پێشـــەوەی هێزەکــانی پێشــمەرگەیان کــرد بەمەبەسـتی ئامادەســازی بــۆ ڕزگــارکردنی قــەزای حەویجــە، بــۆ ئــەو مەبەســتە هێزەکــانی پێشــمەرگە هاوکارییــان پێشــکەش کــردن و زەمینــەی لەباریشــیان بــۆ ئــەو ئامانجــە ڕەخساندبوو، لەسەردانێکی حەیدەر عەبادیدا تەنانەت سـەعات سفریش بۆ ئـەو مەبەسـتە دانـراوە دکتـۆر عـەبادی وتـی لێـرەوە وا دانـێن دەسـتمان بەئۆپراســیۆن کـــردووە، یاســـین دەربەنـــدی دەڵێت:هێزەکـــانی عێراقـــی دەیانویســـت بەپاســـاوی ڕزگارکردنـــەوەی قـــەزای حەویجـــە بـــەهێزەوە بگەڕێنەوە شـاری کـەرکوک و تەنانـەت دەیانویست بەپشتەوەی هێزەکانی ئێمە بارەگاکانی خۆیان جێگیر بکەن، ناتوانین ئەوە نیازپاکی پیشان دەدات. ئەمـە لەکاتێکدا ئەگـەر هێزەکـانی پێشـمەرگە هەماهـەنگیان لەگەڵدا بکـەن و وەکو دوو هێزی عێراقـی مامەڵـە بکـەن، لەحاڵـەتێکی تـردا ئەگـەر هێزەکانی پێشمەرگە و سەرکردایەتی سیاسی ڕێگە بەگەڕانەوەی ئەو هێزە بۆ شاری کـەرکوک نـەدەن، هەڵوێسـتی عێـراق بـۆ هێرشـی سـەربازی دەگۆڕێت و هەوڵـدەدات بـەهێز بگەڕێتـەوە نێـو شـاری کـەرکوک هـەوەکو لـە ١٦ی ئۆکتۆبەردا ئەنجامی دا، بەشێک لەسەرکردە سەربازیەکان لایان وابوو، کە شاری کەرکوک بەهۆی بارودۆخێکی تایبەتـەوە دەستی بەسـەردا گیرابـوو نەمانتوانیووە حکومڕانێکی مۆدێرنی پێشکەوتوو ئەنجام بدەین کە جێگەی ڕەزامەندی هەموو نەتەوەکانی ئەو شارە بێت، مام جەلال هەمیشـە دەیـوت کێشەی کەرکوک وەکو نەشتەرگەری مێشک وایە پێویستە ژیرانە مامەڵـەی لەگەڵدا بکەین بـەڵام لەکەرکوکدا کێشـەی بچووک گـەورە دەکرا، لەهـەموو حاڵەتێکدا حکومـەتی عێراقـی دوای تێپەڕانـدنی ئـەو بارودۆخـەی بـەهۆی هاتنە پێشەوەی داعشەوە دروست ببوو، دەگەڕێتەوە شـوێنەکانی، لـەمانگی ئۆکتۆبـەری ٢٠١٥ دا هـادی عـامری فەرمانـدەی بـاڵای هێزەکـانی عێـراق

(حەشدی شەعبی) سەردانی شاری كەركوك دەكات، لەو سەردانەدا باس لەوە دەكات، كە پێویستە هێزەكانی پێشمەرگە بۆ هێڵی ٣٦ بگەڕێنەوە، كە هێزەكانی عێراقی بۆ هەر شوێنێک مەبەستیان بێت بتوانن و نابێت كەسێک هەبێت ڕێگەیان پێبگرێت.

## پێنجەم:نابەرامبەری هێز

دەیان هەمەر و تانک بەئارستەی سەنگەرەكانی هێزی پێشمەرگە خرابوونە ئامادە باشیەوە، لەبەرامبەردا هێزەكانی پێشمەرگە ئەو ئالیات و تەقەمەنیانەیان لەبەر دەستیان كەم بوو، بۆ نموونە لەدوو سەنگەری سكەی قیتارەكە و نەهرەواندا سێ بیكەیسی و دوو ئاربیجی و یەک دۆشكەی دوانزە و نیو تۆپێكی ١٠٦ هەبوو، لەبەرامبەردا حكومەتی عێراقی دەیان هەمەر كە زۆرینەیان چەند جۆرە چەكێكی بەسەرەوە بوو، چەند تانک و تۆپ و باجەر ئاراستە كرابوو، كەلەلایەن هێزەكانی فیرقەی نۆی دەبابات و فریاكەوتنی خێرا و پۆلیسی ئیتحادی و هێزەكانی حەشدی شەعبی و فیرقەی زێڕین بوونیان هەبوو كە بەراورد بەژمارەی ڕاستەقینەی پێشمەرگە چەند جار زیاتر بوون.

## ڕووداوەکانی ڕۆژانی ١٤ و ١٥ی ئۆکتۆبەر

لەڕۆژی ١٤ی ئۆکتۆبەرەوە جولەی هێزە عێراقیەکان دەستی پێکرد، ژمارەیەکی زۆری سوپای عێراقی پێشڕەویان دەست پێکرد، بەسود وەرگرتن لەڕێگای بەشیر- تازە، چونکە لەسەرەتای دروستبوونی حەشدی شەعبیەوە هێزێکی تورکمانی سەر بە حەشدی شەعبی لەنێو شاری کەرکوک دروست کرابوون، لەدوای ئازادکردنی گوندی بەشیر، لەو گوندە جێگیر کرابوون، هێزەکانی سوپای عێراقی لەو ڕێگەیەوە دزەیان کرد و بەرەو ناحیەی تازە پێشڕەویان کرد.

تا دەهات هەڕەشەی هێزە سەربازیەکانی عێراق زیاتر دەبوو، دوو جار کاتیان بۆ گفتوگۆ درێژکردەوە جاری یەکەم ماوەی ٤٨ سەعات و جاری دووەم بۆ ماوەی ٢٤ سەعات، بەڵام هەنگاوەکانی چارەسەر و بەسستی بەڕێوە دەچوو تەنانەت نیەتێکی جدی بۆ چارەسەری کێشەکان بەشێوەیەکی دروست نەبوو، چونکە سەرکردایەتی کورد لای وابوو کە حکومەتی عێراقی تەنها فشار دەکات بەڵکو هێرش ئەنجام نادات، بەڵام لەڕۆژی ١٥ی ئۆکتۆبەر حکومەتی عێراقی لەڕێگەی دوو کەسایەتی بەنەتەوە فارس بەناوەکانی حاجی ئیقبال پور و کەسێکی تر بەناوی ئەبو عمار لە سەعات ١١ پێش نیوەڕۆ سەردانی میحوەری چواری کەرکوکیان کرد و لەلایەن وەستا ڕەسول فەرماندەی میحوەرەکە و لیوا مەریوان فەرماندەی هێزەکانی پشتیوانی دووەوە پێشوازی کران، بەوتەی وەستا ڕەسول دەڵێت پێیان وتین بەخۆشی یان بەناخۆشی ئەم شوێنانەمان دەوێت:

١. سەربازگە کۆنەکانی کەرکوک.
٢. بیرە نەوتە داگیرکراوەکان.
٣. جادە حەولیەکەی کەرکوک تاکو گوندی کەلور نێوان ناحیەی پردێ و شاری کەرکوک کە شەقامی سەرەکی کەرکوک و شاری هەولێر و کۆنترۆل دەکات.

دوای گفتوگۆی زۆر سەبارەت بەشێوازی پێشرەو هێزەکانی عێراق نەگەیشتینە دەرئەنجامێکی ئەرێنی، بۆیە وەفدەکە پێیان وتین ئێمە دەرۆین با دوو شت هەیە بۆتانی باس بکەین:

١. لەم ساتەوە وا دانێین کە هێرش دەست پێدەکەین.
٢. تەنها یەک بابەت هەیە کە هێرشەکان رابگرین ئەویش ئەوەیە چاوەڕوانی کۆبوونەوەی دوکان دەکەین ئەگەر بڕیاریان دا لەژێر چەتری دەستوردا کێشەکان لەگەڵ بەغدا یەکلا بکەنەوە ئەوا هێرش ئەنجام نادەین، بەڵام کاتێک کۆبوونەوەکەی دوکان لە ١٥ی ئۆکتۆبەر تەواو بوو، بەیاننامەکەی کۆتایی کۆبوونەوەکە پەیامی چارەسەری کێشەکانی لەژێر سایەی دەستوردا پێنەبووە، بۆیە ئەم بەیاننامەیە نەیتوانی پێش ڕووداوەکانی ١٦ی ئۆکتۆبەر بگرێت.

لەهەمان ڕۆژدا مناوەراتی بەشێک لەسەرکردایەتی یەکێتی نیشتمانی کوردستان بەسەرپەرشتی باڤێل تاڵەبانی کوڕی گەورەی مام جەلال تاڵەبانی هاتە پێشەوە، کە تێیدا بەئیمزا و ڕەزامەندی ٣٨ ئەندامی سەرکردایەتی یەکێتی پێشکەشی کۆبوونەوەکەی دوکان لە ١٥ی ئۆکتۆبەردا کرابوو، گرینگترین ئەو پێشنیارانە بریتی بوون لە:

١. سەرکردایەتی هاوبەشی هاوپەیمانان و عێراقی و پێشمەرگە دروست بکرێت بۆ دەستەبەرکردنی ئاشتی و ئارامی شارەکە و بارەگای سەرەکی لەشاری کەیوان دەبێت.
٢. هیچ هێزێکی سەربازی نەهێندرێتە نێو شاری کەرکوک.
٣. کێشەکانی نێوان حکومەتی هەرێم و حکومەتی عێراق لەڕێگای دیالۆگ و دەستورەوە چارەسەر بکرێن.
٤. نەتەوە یەکگرتووەکان و ئەمریکا هاوکار و پشتیوان بن بۆ جێبەجێکردنی خاڵەکانی سەرەوە.

ڕۆژدا هێزەکانی حکومەتی عێراقی جموجۆڵی زۆری دەست پێکرد و ئالیاتی سەربازی زۆری بەرەو پێشەوە هێنا. ئەمریکیەکان لەڕێگەی کامێراکانیانەوە سوپای عێراقی پیشان داین و داوایان لێکردین کەشەڕی ئەو هێزە زەبەلاحەی پڕ ئالیاتە نەکەین هێزەکانمان بۆ کاتێکی تر ئامادە بکەین، پێیان وتین ئێمە ناتوانین هاوکاریتان بکەین، لەکاتێکدا ئەم پێشنیارە لەلایەن هاوپەیمانان و حکومەتی عێراقەوە جێگەی قبوڵ کردن بوو، بەڵام کۆبوونەوەی دوکان ڕەتیکردەوە.

ئەوەی جێگەی سەرنجە کەمال کەرکوکی لەنامەیەکدا بەرواری ٢٠١٧/١٠/١٥ی بەسەرەوەیە بەنهێنی بەپەلەی لەسەر نوسراوە، لەم نامەیەدا کە ئاراستەی مەسعود بارزانی کراوە ئاماژە بەچەند زانیاریەک دەکات و دەڵێت:" لەسەر فەرمانی جەنابتان لەڕێگەی فازل بەرواریەوە راسپێردراوی پارتیمان لەناو لەشکری عێراق تەنسیقی تەواومان لەگەڵ حکومەتی بەغداد هەیە و جەنابتان دڵنیا دەکەین کەلە میحوەری ئێمە بەهیچ جۆرێک تەقە ڕوونادات بەرامبەر سوپای عێراق، وە نامەکە باسی

لەوە کردووە کە هێزەکانی حەفتا سەر بە یەکێتی بەسەرکردایەتی شێخ جەعفەر هان بدەن لەمیحوەری خۆیانەوە تەقە بکەن بۆ ئەوەی بەرنامەمان سەد لەسەد جێبەجێ بکرێت بەسەرپەرشتی جەنابتان، بەڵام کەمال کەرکوکی لەڕێگەی سایتی گوڵانەوە وەڵامی ئەو نامەیەی داوەتەوە و بەنامەیەکی چەواشەکار ناوزەندی کردووە و دەڵێت هیچ بنەمایەکی نیە.

ئێمە لەسەر ڕاستی دروستی ئەم نامەیە وتەیەکی جدیمان نیە ئەوەی لەسەر واقعدا ڕوویدا لەبەرەی میحوەری پێنج کە "د. کەمال کەرکوکی" لێپرسراوی بوو بێ تەقەکردن کشاوەتەوە دواوە و شەرەکەی بۆ پردێ گواستەوە، تەنها چەند پێکدادنێک لەبەشی باشور و باشوری خۆرهەڵاتی کەرکوکدا ڕوویدا و شەهید و برینداری زۆری لێکەوتەوە کەنزیکەی چوار سەعات شەڕو پێکدادان کراوە.

## فشاری نێودەوڵەتی و عینادی سەرۆكایەنی هەرێم و هەلوێستی پارتە سیاسیەكانی كوردستان

### یەكەم: هەلوێستی نێودەولەتی

سایتی شار پریس لە رۆژی ٢٠١٧/١٠/١٤ دا تەواوی نامەكەی وەزیری دەرەوەی ئەمریكای بە زمانی كوردی بڵاوكردۆتەوە، بەم شێوەیە باسی لێوە كردووە: ریكس تیلەرسن وەزیری دەرەوەی ئەمریكا دوو رۆژ پێش ریفراندۆم واتە ٢٠١٧/٩/٢٣، نامەیەی ئاراستەی مەسعود بارزانی سەرۆكی هەرێمی كوردستان كردووە و وەكو ئەلتەرناتیڤی ریفراندۆم چەندین بابەتی گرنگی خستۆتە ڕوو، لەوانەش داننان بە ریفراندۆم ئەگەر بەغداد لە ماوەی ساڵێكدا ریكەوتنەكانی جێبەجێ نەكرد، ریكس تیلەرسن بەڵێن دەدات زۆرینەی كێشەكان بە ماددەی ١٤٠ ی دەستور و دابەشكردنی دەسەڵات و كێشەكانی پێشمەرگە و فرۆكەوانی لەو ماوەیەدا چارەسەر دەكرێن. جگە لەو نامەیەی وەزیری دەروەی ئەمریكا چەندین هەوڵی تر خرانە گەڕ بۆ ئەوەی ریفراندۆم ئەنجام نەدرێت.

فێدریكا موگرینی كۆمسیاری باڵای سیاسەتی دەرەوە و ئاسایشی یەكێتی ئەوروپا لە بەیاننامەیەكدا رۆژی ٢٠١٧/٩/٢١ ڕایگەیاند، یەكێتی ئەوروپا داوا لە دەسەڵاتدارانی كوردستانی عێراق دەكات رێوشوێنەكانی ئەنجامدانی ریفراندۆم بۆ جیابوونەوە لە عێراق ڕابگرن.

كۆمسیاری باڵای سیاسەتی دەرەوە و ئاسایشی یەكێتی ئەوروپا دەڵێت: یەكێتی ئەوروپا دان بەوەدا دەنێت كە هەندێك پرس هەن كە

لــە نێوان دەســەڵاتدارانی کـورد و بەغـدا چارەسـەر نـەکراون و پێویـستە بەرێگــەی ئاشـتیانە چارەسـەر بکرێن، بەڵام سازدانی ریفراندۆم بێسوودە.

کۆمسیاری بـاڵای سیاسەتی دەرەوە و ئاسایشـی یـەکێتی ئــەورووپا پشــتیوانی یەکێتیەکــەی بـۆ دەستپێشــخەرییەکەی نەتەوە یەکگرتووەکـان نیشانداوە کە داوای دیالۆگ لە نێوان هەرێم و بەغدا دەکات.

ئەمەش پەلی کێشـا بۆ بریـاردانی ئەنجـومەنی ئاسـایش وەکـو لـە سـایتی ئەلعــالەم لـە رۆژی ۲۳ ی سـێپتێمبەردا کـە لـە فـرانس پرێـسی بڵاوکـراوەتەوە، بـاس لە هەڵوێـستی ئەنجـومەنی ئاسایشـی نێـودەوڵەتی ســەبارەت بــە ریفرانــدۆم دەکــات و دەڵێـت ئەنجــومەنی ئاسایشــی نێـودەوڵەتی بە ئامادە بوون و رەزامەندی هەر پانزە ئەندام نەیاری خـۆی بـۆ ئەنجامــدانی تاکلایەنــەی ریفرانــدۆم و ئامــاژە دەکــات بــەوەی ریفرانــدۆم ئەگـەری تێکچــونی ئاسایشــی نــاوچەکەی لێــدەکەوێتەوە و پشـتگری خـۆی بـۆ یەکپـارچەی و سـەروەری خـاکی عێراق راگەیانـد، بـەڵام ســەرۆکایەتی هەرێـم تێکـرای ئەو هەوڵانەی رەتکـردەوە و ئامـادە نەبوو گوێبیستی پەیام و بەڵێنە نێودەوڵەتیەکان بێت.

لـە هـەمان گۆشـە نیگـاوە برێـت مـاکگۆرک نێـردەی تایبـەتی دۆنالـد ترامپ سـەرۆکی ولاتـە یـەکگرتووەکانی ئـەمریکا بۆ جـەنگی دژ بـە داعش تێرۆانینەکانی حکومەتی ئەمریکا لـەپرێس کۆنفرانسـێکدا لـە١٤ی سـێپتێمبەر لەشاری هەولێر دەخاتە ڕوو پرسیاری ڕۆژنامەنووسان وەڵام دەداتـەوە و سیاسەتی ئەمریکی دەربارەی ریفراندۆم ڕوندەکاتەوە کە بە ئاشکرا ئاماژە بەوە دەکات لەو کاتەدا لەگەڵ ریفراندۆمـدا نین، برێت مـەکگۆرک نوینـەری سـەرۆکی ئـەمریکا بـۆ جـەنگی دژی داعـش لـەدرێژەی پـرێس کۆنفرانسـە

رۆژنامەنووسیەکەیدا ڕایگەیاند، ئەو بەدیلەیان خستووەتە بەردەستی بارزانی کە بۆ دواخستنی ڕیفراندۆم داوای دەکرد و لەئێستادا چاوەڕوانی وەڵامی بارزانین بۆ ئەو بەدیلەی پێشکەشیان کردووە.

وتیشی کە ناوەرۆکی بەدیلەکە ناخاتەڕوو و ئەوان لەئێستادا دەیانەوێت لایەنەکان گرنگی بەجەنگی ڕووبەڕووبونەوەی داعش بدەن کە تا ئێستا لەحەویجەدا ماون و نایانەوێت نەهامەتی و ئاژاوە لەناوچەکەدا دروست بێت.

نوێنەری سەرۆکی ئەمریکا بۆ جەنگی دژی داعش ئەوەشی وتووە کە ئەوان هانی سەرکردەکانی کورد دەدەن بە جدیی ئەو بەدیلەی خراوەتەروو وەربیگرن و چاوەڕێن بەدیلەکەیان گفتوگۆی لەسەر بکرێت.

ئاماژەی بۆ ئەوەشکرد، لە بەدیلەکەیاندا جەخت لەسەر بەردەوامی گفتوگۆکانی نێوان هەولێر و بەغدا دەکەنەوە.

جەختی لەسەر ئەوەشکردەوە کە هیچ هێزێکی نێودەوڵەتی نییە پشتیوانی ریفراندۆم بکات و هیچ هێزێک لە ئەندامانی هاوپەیمانێتی جەنگی دژی داعش پشتیوانی ئەنجامدانی ریفراندۆم ناکات. داواشی کرد، سەرکردەکانی کورد بە زووی وەڵامی بەدیلەکەیان بدەنەوە.

چونکە ئەوان نایانەوێت بەهۆی ریفراندۆمەوە کێشە لە ناوچەکەدا دروست بێت. ئەوەش لەکاتێکدایە سەرۆکایەتی هەرێم رایگەیاند، لە کۆبوونەوەی بارزانی و نوێنەرانی نەتەوە یەکگرتووەکان و ئەمریکا و بەریتانیا و فەرەنسا و ئەڵمانیا بەدیلی ریفراندۆم خراوەتەڕوو.

لە راگەیەندراوەکەدا سەرۆکایەتی هەرێم ئاشکرایکردووە "بارزانی وتوویەتی ئەو بابەتە لەگەڵ سەرکردایەتی سیاسی کورد باس دەکات و لە ماوەیەکی نزیکدا هەڵوێستی لە بارەوە رادەگەیەنن.

لە کاتێک دا ماکگۆرک ئەم بۆچونانەی لە شاری دهۆک راستەوخۆ گەیاندبووە مەسعود بارزانی بەلام وتەکانی ماکگۆرک جێگەی گرنگی پێدانی بارزانی نەبوون.

## دووەم: هەلوێستی ولاتانی ئیقلیمی

دەوڵەتی سعودیە کە ماوەیەک بوو لە حکومەتی هەرێم و بارزانی خۆی نزیک دەخستەوە، بەلام نیگەرانی خۆی لە ئەنجامدانی ریفراندۆم نەشاردەوە و لەو بارەیەوە ئاژانسی هەواڵی سعودیە لەزاری بەرپرسێکی عەرەبستانی سعودی بلاویکردەوە"بە لەبەرچاوگرتی ئەو هەلومەرجەی ئێستا ناوچەکە پێیدا تێپەر دەبێت و ئەو مەترسیانەی رووبەرووی ناوچەکە بوونەتەوە و لە پەرۆشی بۆ خۆلادان لە قەیرانی نوێ کە ڕەنگە لێکەوتەی نەرێنی سیاسی و ئەمنی و مرۆیی لێبکەوێتەوە کە هەوڵەکانی هێنانەدی سەقامگیریی و ئارامی ناوچەکە پەرش و بلاوبکات بە بەبنبرکردنی ڕێکخراوە تیرۆرستییەکان و چالاکییە هاوپەیوەندەکانیشیانەوە، هەروەها بۆ گونجان لەگەڵ هەڵویستە هەرێمی نێودەوڵەتیەکان لەوبارەیەوە ئەوا عەرەبستانی چاوی لە حیکمەت و شارەزایی مەسعود بارزانییە بۆ ئەنجام نەدانی ڕیفراندۆمی تایبەت بەسەربەخۆیی هەرێمی کوردستانی عێراق.

بەگوێرەی ئاژانسە سعودیەکە بەرپرسەکە هۆکاری ئەو هەڵوێستەی وڵاتەکەی بۆ ئەوە گێڕاوەتەوە کە عێراق و ناوچەکە لەمەترسی زیاتر بەدووربگرێت کەلەئەنجامدانی ریفراندۆم دەکەونەوە.

جگە لە هەوڵە نێودەوڵەتیەکان حکومەتە هەرێمیەکانیش هەمە ئاهەنگی تەواویان دەکرد بۆ وەستاندنی پرۆسەی ریفراندۆم و وەزیرانی دەرەوەی عێراق و ئێران و تورکیا کە لەنیۆیۆرک کۆبوونەوە، و بەیاننامەیەکی هاوبەشیان بڵاوکردەوە تێیدا ریفراندۆمەکەی هەرێمی کوردستانیان رەتکردۆتەوە و رایانگەیاندووە، ئەو پرۆژەیە هەموو ئەو دەسکەوتانە ڕووبەرووی مەترسی دەکاتەوە کە عێراق لەشەڕی دژی تیرۆردا بەدەستی هێناوە.

وەزیرانی دەرەوەی عێراق و ئێران و تورکیا باسیان لەوەشکردوە، ئەنجامدانی ریفراندۆم مەترسیدارە و لەبەرژەوەندی کورد نیە و دەبێتە هۆی سەرهەڵدانی ناکۆکی نوێ لەناوچەکەدا کە ناتوانرێت بەئاسانی کۆنترۆڵ بکرێت، هاوکات هەرسێ وڵات داوایان لەبەرپرسانی هەرێمی کوردستان کردووە لەو بڕیارە پاشگەزببنەوە، لەڕێگەی گفتوگۆوە کێشەکانیان لەگەڵ بەغدا چارەسەر بکەن، سەرەڕای نیگەرانی و دژایەتی وڵاتانی هەرێمی بەڵام کوردەکانی باکوور و رۆژئاوا و ڕۆژهەلات پشتیوانیان لە پرۆسەی ریفراندۆم دەکرد.

## سێیەم: هەڵوێستی پارتە سیاسیەکانی کوردستان

ماکگۆرک نوێنەری سەرۆکی ئەمریکا بۆ جەنگی دژ بە داعش سەردانی زۆرینەی سەرکردەکانی کوردی کرد و بارەگای پارەتەکانی بەسەرکردەوە ڕاو تێبینی ئەمریکیەکانی لەسەر ریفراندۆم و کاتی ئەنجامدانی بەراشکاوانە پێڕاگەیاندن، بەشێک لەو پارت و لایەنانە بۆچوونەکانی ماکگۆرک کاریگەری لەسەر دروست کردبوون و هەوڵیاندا کە ریفراندۆمەکە دوا بخەن وەکو بزوتنەوەی گۆڕان و کۆمەڵی ئیسلامی بەلام سەرکەوتوو نەبوون، هەڵوێستی ئەم پارتانەش تەنها وابەستە بەدیدی ماکگۆرکەوە نەبووبێت چونکە ئەم پارتانە پێشووتریش نیگەرانی خۆیان لەدیاری کردنی رۆژی ئەنجامدانی ریفراندۆم راگەیاندبوو، تەنانەت ئامادەنەبوون بەشداری لەئەنجومەنی بالای ریفراندۆمدا بکەن، بەپاساوی ئەوەی:

١. ئەنجامدانی ریفراندۆم و دەستنیشانکردنی کاتی ریفراندۆم لەپارلەمانەوە دیاری نەکراوە بەڵکو لەکۆبوونەوەی سەرکردایەتی پارتەکان ئەنجامدراوە.
٢. لەکوردستاندا هیچ ئامادەسازی و زەمینەیەکی ئابووری و سیاسی و کۆمەلایەتی بۆ ریفراندۆم و ئەنجامدانی سەربەخۆیی نەرەخسێندراوە، هەرێمی کوردستان بەزنجیرەیەک لەقەیرانی ئابوریدا تێپەڕ دەبێت و چەند ساڵێکە چارەک و نیوە موچە بە فەرمانبەران دەدرێت و پارتەکان دڕدۆنگ لەیەکتری دەکەن و کۆبوونەوەکان هەمیشە بێدەستکەوت تەواو دەبن.

٣. چ لەئاستی هەرێمایەتی و چ لەئاستی نێودەوڵەتی کاری جدی بۆ ئەنجام نەدراوە و تاکلایەنە ئەم بڕیارە دراوە، ئەمەش بارودۆخەکە نەک چارەسەر ناکات بەڵکو بەرەو خراپتری دەبات. تەنانەت بزوتنەوەی گۆڕان ئاماژەی بەوە دەکرد کە ڕیفراندۆم بۆ سەربەخۆی کوردستان نیە و ڕاکردنە لەچارەسەرکردنی کێشە راستەقینەکانی هەرێم و خۆدزینەوەیە لەدۆزینەوەی ڕێگە چارەیەک بۆیان، جگە لەو خاڵانە ڕەنگە چەندین هۆکاری تریش هەبن کە کۆمەڵانی خەڵکی کوردستانی نیگەران کردبوو پێشوازییان لەریفراندۆم نەدەکرد و هاتنەدی خەونی چەندین ساڵەیان ڕەتدەکردەوە.

یەکێتی نیشتمانی کوردستان لەو بوارەدا ڕاڕای زۆری پێوە دیاربوو، بەشێکیان سەرسەختانە پشتگیریان لە ریفراندۆم دەکرد، وەکو "کۆسرەت ڕەسول عەلی" جێگری یەکەمی ی.ن.ک. و جێگری سەرۆکایەتی ئەوسای هەرێمی کوردستان و زۆرینەی ئەندامانی مەکتەبی سیاسی یەکێتی، تەنانەت باس لەوە دەکرێت لەدانیشتنێکدا "مەسعود بارزانی" وتویەتی هیچ کەسێکم لەگەڵدا نەبێت ریفراندۆمەکە ئەنجام دەدەم و تەواوی بەرپرسیارێتی ئەو پرسە دەگرمە ئەستۆ ئەگەر شکستی هێنا، بەلاّم "کۆسرەت رەول عەلی" ڕایگەیاند بەتەواوی توانامەوە پشتیوانیت دەکەم، بەشێکی تریان سەرقاڵی لەمپەر دروست کردن بوون بۆ دواخستنی ریفراندۆم وەکو لەبەیاننامەی ئەنجومەنی سەرکردایەتی یەکێتی نیشتمانی کوردستاندا هاتبوو کە پێویستە ریفراندۆم لەناوچە کێشە لەسەرەکانیش ئەنجام بدرێت و پارلەمان کارا بکرێتەوە، بەڕای ئێمە جۆرە هەوڵێک بوو

بۆ شکست پێهێنانی ئەنجامدانی ڕیفراندۆمەکە بەڵام سەرکەوتوو نەبوون، چونکە لایان وابوو ئاستەمە پارلەمەن چالاک بکرێتەوە و ریفراندۆمیش لەناوچە کێشە لەسەرەکان ئەنجام بدرێت چونکە:

١. بەلانسی هێز لەبەرژەوەندی یەکێتی نیشتمانی کوردستان دەگۆڕێت و ئەو ناوچانە پتر هەوادارانی یەکێتی تێدا نیشتەجێن.
٢. پارتی دیموکراتی کوردستان بە جدی کار بۆ گەرانەوەی ئەو ناوچانە ناکات چونکە پارتی ئەوەندە خەمی نەوتەکەیەتی ئەوەندە لە بیری خەلکەکەیدا نیە. بەڵام ریفراندۆم لە ناوچە کێشە لەسەرەکان هاتە ئان و ساتی ئەنجامدان و پارلەمانیش پشتڕاستی ریفراندۆمی کرد. ئیتر ناچار لە سۆنگەی هەست کردن بە مەترسیەکان بەشێک لە سەرکردایەتی و کادیرانی مەڵبەندی کەرکوک کەوتنە هەوڵی راگرتن و ئەنجام نەدانی ریفراندۆم لەشاری کەرکوک، هەوڵی جدییان لەو پێناوەدا خستەگەڕ بەڵام "کۆسرەت رەسول عەلی" ڕێگری لەدواخستنی ریفراندۆمەکە لەو شارە کرد، بۆیە ئەم هەوڵانە بێ ئاکام بوون و هیچ دەرئەنجامێکی لێنەکەوتەوە، کەشتی ریفراندۆم لەسەر ڕێرەوی خۆی بەردەوام بوو.

لە١٥ی سێپتێمبەردا نامەی بەیاننامەی کۆشکی سپی ئەمریکا پشتگیری ریفراندۆم ناکات و داواکارە بە گفتوگۆ کێشەکان چارەسەر بکرێ.

فشارە عێراقی و نێودەوڵەتیەکان لەهەموو ئاستەکاندا بەردەوام بوو، هەرەشەکان تا دەهات جدیتر و ئاراستەکراوتر دەبوو، سەرەتای

هەرەشـەکان بەدەرکـەوتن، تـا دەهـات سـوپای عێـراق لەکـەرکوک نزیکتـر دەبووەوە، تورکیا ئۆپراسـیۆنی لـەسـەر سنوور ئەنجامدەدا، کۆبوونـەوەی سـەرکردایەتی سـەربازی ئێران و تورکیـا ئەنجامـدەدرا بـەڵام ئەنجومـەنی بـاڵای ریفرانـدۆم و سـەرۆکایەتی هـەرێم گوێیـان بـەو فشـارانە نـەدات و نالۆژیکانـە لێکدانـەوەیان بـۆ ئەنجامـەکانی دەرکـرد و هێـزە سیاسـیەکانی تریش نەیاری و ترسـی خۆیان شـەرمنانە دەگەیاندە سـەرۆکایەتی هـەرێم، جگـە لـە "بـەرەی نـەخێر لـە ئێسـتادا" هـیچ لایـەنێکی تـر بـەدەنگی بـەرز و بەئاشکرا دژی ریفراندۆم نەبوون.

ناوەنـدی سـتاندەر لە توێژینەوەیەکـدا ڕەخـــنەی تونـد لـە بریـاری ڕیفرانـدۆم دەگێـرت و چەنـدین ئامۆژگـاری دەخـاتە ڕوو، تـوێژینەوەکە لای وایـە ڕیفرانـدۆمێک بـۆسـەربەخۆیی ئەنجـام بـدرێت زۆر جیـاوازە لەگەڵ ڕیفرانـدۆمێک کە لە سـەر بنەمـایەکی پـوچ و بـاتل داڕێژرا بێـت. ئـەم بۆچـونە لەلایـەن بەشـێک لـە چـین و توێژەکـانەوە پشتڕاسـت دەکـرایەوە کە ڕیفراندۆم بۆ سەربەخۆی نەبووە.

## دەرئەنجام

دوای ساڵانێک لە خەبات لەپێناو ئۆتۆنۆمیدا، ڕێککەوتن لەگەڵ بەعس لەم چوارچێوەیەدا (١٩٧٠-٧٤) وە لە هەمووی گرنگتر ئەزموونی عێراقی فیدڕاڵ و دیموکرات (٢٠٠٥-؟؟؟؟)، کوردایەتی لە باشووری کوردستان بەگشتی پێویستی بەپێداچوونەوەیەکی جددی و قووڵ و هەمەڕەهەند، بەبیرکردنەوە و جیهانبینی خۆیدا هەیە. لەڕاستیدا کەوتنی ڕژێمی سەددام لە ٢٠٠٣ دادەرفەتێکی زێڕین بوو بۆ ئەم پێداچوونەوەیە، بەڵام لەگەڵ ئەم ڕووداوە گرنگەدا، کوردایەتی نەک هەر پێداچوونەوەی بۆ نەکرا،بەڵکو کورد زیاتر لە پێهەڵگرتن لەجیهانبینی ئۆتۆنۆمیخوازیەوە ( تۆ بڵێ ئۆتۆنۆمیزمەوە، ڕاستتر بڵێین کوردایەتییە کۆنەکە) چووەوە بەغدا... دەرهاوێشتەی ئەزموونی ڕابوردوو ( ئەزموونی ساڵانێکی دوور و درێژ لەخەبات لەپێناو ئۆتۆنۆمیدا) کۆمەڵێک وانەیە کە گرنگترینیان ئەمانەن:

١) خەبات بۆ بەدەستهێنانی ئۆتۆنۆمی " ئەو ئاسانە نەبووە"، وەک ئەوەی لەلایەن قوتابخانەی ئۆتۆنۆمیخوازەوە بەردەوام بانگەشەی بۆ کراوە، بەڵکو ئەم خەباتە قوربانییەکی زۆرتری ویستوە لەوەی کە زۆرێک لە میللەتانی دیکە بۆ سەربەخۆیی داویانە،.

٢) بە ئەزموون لەباشووری کوردستان دەرکەوت کە ئۆتۆنۆمی (یان فیدڕاڵی) بۆ کوردستان و دیموکراتی بۆ عێراق بەشی چارەسەرکردنی پرسی نەتەوەیی ناکەن، کێشەکەش بەو مانایە عەللاوی و جەعفەری و مالکی و عەبادی و..... هتد نین، بەڵکو کێشەکە لەوە قووڵترە و لەوە فراوانترە: ئۆتۆنۆمی و فیدڕاڵی ناتوانن ببن بەبنەمای هاوتابوون و یەکسان بوونی دوو نەتەوە، تەنانەت بگرە لەسیستمێکی ئەوپەڕی

دیموكراتیشدا. لەڕاستیدا، لە ٦٠-٧٠ ساڵی ڕابوردوودا، كورد لەباشووری كوردستان خەباتی كرد بۆ دیموكراسی لە عێراق و قوربانیەكی زۆریشی لەڕێڕەوی ئەم خەباتەدا دا، بەڵام كە دواجار هەر نەبێت لەفۆڕمدا لە عێراقی دوای سەددام ئەم "دیموكراتییە" بەدەست هات، دەركەوت كە دەستكەوتی خەباتی كورد لەپێناو دیموكراسیدا" دكتاتۆرییەتی زۆرینە" بوو، واتە زۆرینەی عەرەب. ئەمڕۆ پرسی دیموكراسی لە وڵاتانی دەرەوەی ئەورووپا لەمەڕ ستەمكاریی زۆرینە جێگای مشتومڕێكی زۆرە.

دواجار دەركەوت كە دیموكراسی لە كۆمەڵگایەكی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستی وەك عێراق، نەتەوەی سەردەست دەكات بە خاوەنی دەسەڵاتێك كە زیاتر لە دیكتاتۆریەتی زۆرینە دەچێت تا هەر شتێكی دیكە، ڕێك ئەمە یەكێك بوو لە بەهانە هەرە گرنگەكان كە بزووتنەوەی ڕیفراندۆم لەسەرەتای سەرهەڵدانیدا بەتایبەتی لە ساڵی ٢٠٠٤ دا هێنایە دەنگ.

لە عێراقی دوای سەددامدا، لەگەڵ ئەو هەموو دوژمنكاری و ململانێ خوێناویەی لەنێوان عەرەبی سوننە و عەرەبی شیعەدا هەبووە، بەڵام دواجار بەكردار دەركەوتووە كە ئەم دوو پێكهاتەیە لەكەمترین نزیكبوونەوەیاندا لەیەكتر، مەترسی دیكتاتۆریەتی زۆرینە بۆ سەر كورد لە عێراق دروست دەكەن. شێوازی دروستكردنی حكومەتی عەبادی وەك نموونە و چۆن " چۆك بە كورد نرا" و بەڕاشكاوی پێیگوترا، بەبێ بوونی ئێوەش حكومەتی عێراق دادەمەزرێت!

هەر لەبەر ئەوەیە كە بیری سەربەخۆیی دەبێت لەبنچینەو سەرەتادا لە هەڵوەشاندنەوەی دروشم و بەهانەكانی خەباتی سیاسی ڕابوردوو (

ئۆتۆنۆمی- فیدراڵی- بۆ کوردستان و دیموکراتی بۆ عێراق) پێ هـەڵبگرێت. بـەبێ ئـەم هەڵتەکاندن و هەڵوەشـانەوەیە قسـە دەربـارەی سـەربەخۆیی و هەنگاونان بەرەو سەربەخۆیی شتێکی پڕ کێشە دەبێت.

دەکرێت لەم هەڵوەشاندنەوەی مێژووەدا ئەوەش ببینرێت، یا ڕاسـتتر بڵێین پێویسـتە ببینرێت، کـە خـەبات بـۆ ئۆتـۆنـۆمی لـە ماوەیـەکی دوور و درێژدا بـوو بـە بەشـێک لـە یارییـەکی ئیقلیمـی کـە تیایدا داگیرکارێکی دیکـە ئامادەبوو بۆ بەرژەوەندی خـۆی پشـتگیری کـورد لـە عێراق بـۆ ئۆتۆنـۆمی بکات، بەمەش بزاڤێکی "ئازادیخواز" بوو بە بزاڤێکی وابەستە.

بەهانەیـــەکی ئۆتۆنۆمیخـــوازان، بـــۆ وەدەستخســـتنی یارمـــەتی لـــە داگیرکـارێکی دیکـە، بـەردەوام ئـەوە بـووە کـە " ئەگـەر داوای زیـاتر لـە ئۆتۆنۆمی بکـەین کـەس پشتگیریمان ناکات"، بـەڵام دەرکـەوت هـەر هـەمان پشـتگیری ( تـۆ بڵـێ وابەسـتەیی)، بەشـێوازی جـۆراو جـۆر بـۆ کـورد پشتشکێن بووە، وەک بۆ نموونە پشتشکان و نسکۆکەی ١٩٧٥.

هەڵبەتـە پێویسـتە ئـەوە بڵێین کـە لەخـەباتی ئۆتۆنۆمیخوازیدا تـۆوی ئەو کەلتوورەی کە تیایدا داگیرکارێکی دیکە کرا بە فریادڕەس هەر لەساڵی (١٩٦١) ەوە، لەگـــەڵ دەســـتپێکردنی بزاڤـــی ئـــەیلول،چێنراوە. ٣١ی ئـــابی ١٩٩٦یش بەرهـەمێکی ئـەو تـۆوە بـوو، ئەگـەر چـی ٣١ی ئـاب لـە زەمـەنێکی دیکـەدا ڕووی دا، بـەڵام لۆژیکـە هاوبەشـەکە ئـەوە بـوو: لـەپێناو مانـەوەی خـۆم و بردنەوەی شـەڕ، لـە وەرگرتنـی یارمەتیدا هـیچ هێڵێکـی سـوور نییـە! پێشتر ئەم لۆژیکە بۆ ماوەی ١٤ ساڵ بووە بەهانەی ئـەوەی بزاڤی ئـەیلول شـای ئێران بکات بـە فریـادڕەس، بـەڵام دواتـر لـە ٣١ی ئابدا بۆ بردنـەوەی شـەڕ دژی " براکان"، دیسـان هێڵـی سـوور بـەزێنرا و ئـەمجارەیان یارمـەتی

لـە ئەنـدازیاری ئـەنفال و کیمیابـارانکردنی هەڵەبجـە، سـەددام حوسـەین، وەرگیـرا. لەبەرامبـەر ئەمەشـدا پشتبەسـتن بـەهێزی پاسـداری ئێـران بـۆ لـەناوبردنی هێزێکـی دیکـە، دیـوێکی دیکـەی هـەمان دراو بـوو. پێشـتریش هەرەس و شکستی ١٩٧٥یش بەرهەمێکی دیکەی ئەم تۆوە چاندراوە بـوو. لەبەر ئەوە گرنگە لە هەڵدانەوەی لاپەڕەی مێژوو ئەو پرسیارە بکرێت، ئایا خـەبات بـۆ ئۆتۆنـۆمی چەنـد کـەوتوە لەسـەر کـورد؟ ئـەم پرسـیارە و زۆر پرسـیاری دیکـە، ڕوو لـە مێـژوو و وەڵامدانـەوەیان، زۆر گـرنگن بـۆ ئامـادەکردنی هـزر و ئەندێشـە بـۆ قبـوڵکرانی، یـا قبوڵانـدنی، دروشـمی سەربەخۆیی.

ئـەمڕۆ دوای ئـەم هـەموو ئەزموونـە، پێویسـتە ئـەم پرسـیارە بکرێت: ئایا ئەوە دەهێنێت و بـواری ئـەوە مـاوە، دوای ئە هـەموو ئەزموونـە، چیتر کـورد وەبـەرهێنانی سیاسـی لـە دەوڵەتێکدا بکـات کـە بەهـەموو پێوەرێـک شکسـتی خـواردووە، هـەروەها هیـوا هـەڵبچێت کـە ئـەم دەوڵەتـە شکستخواردووە ببێت بە دەوڵەتێکی سەقامگیر و سەرکەوتوو؟

لەئێسـتادا دوو ئاڕاسـتە لەمـەڕ بانگەشـەی سـەربەخۆیی لـە هـەرێمی کوردستان باڵا دەستن، یەکێکیان بە موناسـەبە و بێ موناسـەبەوە زۆرجـار لەڕێگای دەستبردن بۆ هەست و نەستی خەڵک باسی سەربەخۆیی دەکات، بەڵام ئاڕاستەی دیکەیان بە بەهانەی ئامادەنەبوون و پڕ کێشـەیی بابەتەکە دەخوازێت باسکردن لەم مەسەلەیە دوابخات.

لەلایـەکی دیکـەوە،دەکرێت بڵێـین مانـەوەی ئـەم مەسـەلە گرنـگ و سـتراتیژییە بـەم دوو ئاراسـتەییە مەترسـییەکی گـەورە بـۆ سـەر خـودی بڕاردەی جیابوونـەوە و سـەربەخۆیی. هـەنگاوێکی گرنـگ بـۆ چارەسـەری

ئـــەم ئیشـــکالیەتە ئەوەیـــە کـــە پێویســـتە گۆڕانکـــاری بەســـەر هـــەردوو ئاڕاستەکەدا بێت:

١) ئـەو ئاڕاسـتەیەی کـە زۆرتـر بـاس لـە کێشـەکانی نـاوەرۆکی پـڕۆژەی سەربەخۆیی دەکات و دەخوازێت جاریَ کورد بە کردار باش خۆی ئامادە بکات بەرلەوەی ئەو دەوڵەتی سەربەخۆیە ڕابگەیێنێت، پێویستە گۆڕانکاری بەسەر بۆچوونەکەیدا بهێنێت. ئەم ئاڕاستەیە دەبێت ئەو تێگەیشتنە بەجێ بهێڵێت کە دەخوازێت بڵێت ئەوانی دیکە، تۆ بڵێ ئاڕاستەکەی پارتی، " تـەنها موزایـەدە بەمەسـەلەی سـەربەخۆییەوە دەکـەن و هیچـی دیکـە". هەنـدێک جـاریش بەکەمکردنـەوە لەبـەهای قسـەکانی پـارتی لەمـەڕ سـەربەخۆیی دەخوازێت" بەتەنزەوە" بڵێ" باشە ئەگەر ڕاستدەکەن با دەوڵەتی سەربەخۆ ڕابگەیەنن، ئێمەش ئەو کاتە دەستخۆشی و پیرۆزباییان لێ دەکەین".

٢) لەڕاسـتیدا ئـەوەی پـارتی دەیکـات، بـەباش و خـراپ، کاریگـەری لەسـەر بیرۆکـە و ئاڕاسـتەی کـارکردن بـۆ سـەربەخۆیی دادەنێـت، هەرنـەبێت بـۆ دوارۆژ پارتی دەکات بەخاوەنی شانازی سەربەخۆیی. جگە لـەوەش پارتی هەرچییـەک بکـات لـە ئاڕاسـتەی پـڕۆژەی سـەربەخۆییدا، لـە فەزایـەکی سیاسی خاڵیدا نایکات، بەڵکو لەفەزایەکدا دەیکات کە کۆمەڵێک کاریگەری دادەنێت و دەبێتە هـۆی کۆمـەڵێک کاردانـەوە لەلایـەن هێزە سیاسییەکان و کۆمەڵگای مەدەنی و توێژە جیاجیاکان و تاکەکان..... هتد.

جگـە لـەوەش لەئاسـتی ئیقلیمـی و نێودەوڵەتیشـدا، کاریگەرییەکـە حاشاهەڵنەگرە، تا پارتی بەردەوام بێت لە قۆرخکردنی فایلی سەربەخۆیی و سەرکێشـی و پێـداگری تاکلایەنـە لەسـەر ئـەوەی کـە ڕیفرانـدۆم و سەربەخۆیی پڕۆژە و شـانازی ئـەو حیزبـەن، ئەوەنـدەش زیـاتر هاوکـات

زیان بەو پڕۆژەیە دەگات. بەپێچەوانەشەوە چەند زوو ئەم پڕۆژەیە لەم قۆرخکاریی و تاکلایەنییەی پارتی ڕزگار بکرێت و ببێت بەهی هەمووان، ئەوا زووتر پڕۆژەکە دەرفەتی دەبێت ببێت بەپڕۆژەیەکی نیشتمانی.

## کورتەیەک لە ڕێکەوتنامەی (هەرێم و بەغدا و ئەمریکا)

لە ئەنجامی ڕووبەڕوو بوونەوەی داعش ئاستی دیپلۆماسیەتی سەرانسەری کوردستان بەرزبوویەوە، ڕێککەوتنامەی گرنگ مۆر کراوە لەگەل ئەمریکا، لە (٢٠١٦/٧/٢٢) پێکهاتبوو لە (٨) مادده، ئەرێنی و نەرێنی ئەوەیە کە ئیش بەکورد دەکرێت ، بۆ موسل.

1- ریکەوتنەکەی هەرێم پاراستنی سەروەری خاکی کوردستان نەپاریزراوە بەرامبەر هێزەکانی حکومەتی عیراقی و حەشدی شەعبی(ماددەی ١ و ٢).

2- لەو ریکەوتنە مەرجی ئەوە بەسەر هەرێم سەپێنراوە کە هاریکاری تەواو لەگەل عێراق و سوپاکەی بکات (مادده٣).

3- حکومەتی عێراق دەتوانێ خاکی کوردستان بەکاربهێنێ (ماددەی ٤).

4- بەکارهێنانی خاکی کوردستان (هەتا لەلایەن هاوپەیمانانیشەوە )دەبێت بە رەزامەندی عێراق بێت (ماددەی ٥).

5- لە ریکەوتنی هەرێم بەلێنی داوە کەلەدوای پرۆسەکە هێزەکانی پێشمەرگە دەگەڕێتەوە شوێنی خۆی (مادده ٦).

6- ڕێکەوتنامەکەی هەرێم بۆ ماوەیەکی کورتە لەگەل تەواو بوونی پرۆسەکە تەواو دەبێت (ماددەی ٧).

7- لە ڕێکەوتنامەی هەرێم لەلایەن سەرکردایەتی کوردەوە داوای ٤١٥ ملیۆن دۆلار کرابوو لەبەرامبەر بەشداری هێزی پێشمەرگە لە رزگارکردنی موسل (ماددەی٧) ڕێکەوتنەکە زۆر لاواز دەکات.

8- لەلای هەرێم بەناچاری قایل بووە کە چاکسازی لەو وەزارەتە بۆ بکەن (ماددەی٨ ).

9- بەگوێرەی ڕونکردنەوەی وەزارەتی بەرگری عێراق ئەوەی لەنێوان هەرێم و بەغدا و ئەمریکا واژوو کرا ڕێکەوتن نیە ،بەڵکو بەڵگەنامەی لێکتێگەیشتنە (وەسیقە تەفاهوم) ، دوو ڕێککەوتنی نهێنی پارتی و یەکێتی ڕێککەوتنە سەرنەگرتووەکەی پارتی و یەکێتی لە کۆتاییەکانی مانگی ئابی ئەمساڵ (٢٠١٧) ، لیژنەیەکی ١٠٠ کەسیان لە هەردووک لا پێکهێنا، بەمەبەستی نوسینەوەی " ڕێکەوتنامەیەکی نوێی ستراتیژی" بۆ بەردەوامبوون لەسەر بەڕێوەبردنی سیستەمی حکومڕانی هەرێمی کوردستان بە هاوبەشی.

ڕێککەوتنامەکە، لە ١٠٠ مادده و چەندان برگەی لاوەکی و، پاشکۆیەک پێکهاتبوو، کە تایبەت بوو بە نەخشە ڕێگای سەربەخۆیی هەرێمی کوردستان.

یەکێک لە ئامانجەکانی ئەو ڕێککەوتنە، بەردەوام بوون بوو لەسەر بەڕێوەبردنی هەرێمی کوردستان لە لایەن هەردووک لایەن بە هاوبەشی تاوەکو ساڵی ٢٠٢١.

بەپێی ڕەشنووسی ئەو ڕێککەوتنە نهێنیە ( تاوەکو ئێستاش بەشێکی زۆر لە سەرکردایەتی و مەکتەبی سیاسی ئەو دوو حزبە نەیانبینیوە)، ناوەڕۆکەکەی بۆ چەند بەش و تەوەرێک دابەشکرابوو لەوانە: چۆنیەتی کاراکردنەوەی پەرلەمان و هەموارکردن و داڕشتنی یاسایی نوێ لە پەرلەمان، شێوازی حکومڕانی داهاتووی هەرێم لە نێوان هەردووک لا، ڕێککەوتن لەسەر پۆستی ویلایەتی سەرۆکی هەرێم، پێداچوونە بەشێوازی مامەڵەکردن لەگەڵ تورکیاو ئێران و داڕشتنی سیاسەتێکی نوێ، چۆنیەتی چاکسازیکردن لە بواری حکومڕانی ، چۆنیەتی بەڕێوەبردنی سێکتەری نەوت و غاز و ئەکتیفکردنی ئەنجومەنی باڵای نەوت غاز، مامەڵەی

داهاتووی هەرێم لەگەڵ بەغدا، لەگەڵ چەند بەشێکی ترو، پاشکۆیەکی تایبەت بە نەخشەڕێگای سەربەخۆیی هەرێمی کوردستان.

بە پێی ئەو ڕێککەوتنە، پارتی و یەکێتی، تاوەکو ساڵی ٢٠٢١ هیچ جۆرە هەڵبژاردنێکیان ئەنجامنەدەدا، لە پلانیشیاندا بوو بە پشت بەستن بە ڕێککەوتنەکەیان لەگەڵ کۆمپانیای" ڕۆز نەفت" ی ڕووسی بەرهەمهێنانی نەوت بەرزبکەنەوە و، تا ساڵی ٢٠٢١ غازی سروشتی هەناردە بکەن.

لە بەشێکی تری ئەو ڕێککەوتنە، ئاماژە بەوەکرابوو، دوای کاراکردنەوەی پەرلەمان ڕاستەوخۆ، حکومەت لە ڕێگەی پەرلەمانەوە دەستدەکات بە دەستکاریکردنی پاشەکەوتی موچەی فەرمانبەران و، هەمواركردن و دارشتنی کۆمەڵێک پرۆژە یاسایی پەیوەست بە: یاسایی بەکرێدانی خانووبەرە، تیرۆر، پرۆژەی چاکسازیکردن و ریفۆرم لە حکومەت، یاسایی سندوقی نەوت و غازی هەرێم و، چەندین یاسایی تری پەیوەست بە ژیانی خەڵک.

بە پێی ڕەشنووسی ڕێککەوتنامە نهێنییەکە، کە دواتر بۆتان باسدەکەم بۆچی سەری نەگرت؟ پارتی و یەکێتی لە ماددەیەکدا ئاماژەیان بە هێنانە ناوەوەی هێزی تری سیاسی کردبوو بۆ ناو ڕێککەوتنەکە، لەگەڵ ئەوەشدا جەوهەری ڕێککەوتنەکە بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ چەند ماددەیەکی تێدابوو، کە تایبەت بوو بە دابەشکردنەوەو پێداچوونەوە بە سەرجەم پۆستەکان لەسەر ئاستی سەرۆکایەتی هەرێم، ئەویش بە درێژکردنەوەی ماوەی دوو ساڵ بۆ ویلایەتی بارزانی و، دووبارە گۆڕانکاریکردن لەسەرۆکایەتی پەرلەمان و هەندێ لە وەزارەتەکان.

ئامانجێکی ڕێککەوتنە سەرنەگرتووەکەی پارتی و یەکێتی، باشترکردنی باری دارایی و ئابووری هاووڵاتیان بوو، بۆ ئەوەی

نارەزاییيەکانی هاووڵاتیان لە ماوەی ٢ تا ٣ ساڵ کەمبکنەوە، پاشان وادەیەک بۆ هەڵبژاردنەکانی داهاتوو دیاریبکەن و، بۆ ئەوەی خەڵکی نەهامەتی چەند ساڵەی لەبیربچێتەوەو، قەناعەتیان بەوەبێت، کە تەنها پارتی و یەکێتی دەتوانن حکومڕانی هەرێم بکەن.

بەپێی رێککەوتنەکەش، بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ هەریەک لە بزوتنەوەی گۆڕان و کۆمەڵ ئاوت دەکران (هەرچەندە هیچ مادده و برگەیەک نەبوو بە ڕاستەوخۆ ئاماژە بەوەبکات)، بەڵام دارشتنەکەی بەشێوەیەک بوو، کە جەماوەر لەو دوو حزبە ئۆپۆزسیۆنە دووربخەنەوە ئەویش لە رێگەی باشترکردنی گوزەرانی خەڵکی.

ماددەی یەکەمی رێککەوتنەکەش، تایبەت بوو بە کاراکردنەوەی پەرلەمان لە (١٠ ئەیلول تاوەکو٢٠ی ئەیلولی ٢٠١٧)، دواجار پەرلەمانیش لە هەمان وادە کاراکرایەوە.

هێشتا ڕیککەوتنامەکە ڕەشنووس بوو، هەریەک لە "نێچیرڤان بارزانی" و "مەلا بەختیار" لە کۆنگرەیەکی رۆژنامەوانیدا، لە مەکتەبی سیاسی یەکێتی هەولێر، دوای کۆبوونەوەی هەردوولا، باسیان لە نووسینەوەی ڕێککەوتنێکی نوێ کرد، بەبێ ئەوەی ئاماژە بە هیچ شتی تربکەن ( دەتوانن بگەڕێنەوە بۆ کۆنگرە ڕۆژنامەوانیەکە).

لەسەروبەندی پاککردنەوەی ڕەشنووسەکەو، گەیشتن بە سیغەی کۆتایی لە نێوان هەردوولا، وادەی ئەنجامدانی ڕیفراندۆمی بەسەردا هات، ئەمەش هەرێمی کوردستانی ڕووبەرووی قەیرانێکی سەختی سیاسی و ئابووری و دیبلۆماسی کردەوە، هەرێم کەوتە ژێر گەمارۆی سەر عێراق و وڵاتانی دراوسێ، دواتریش ڕووداوی ١٦ی ئۆکتۆبەری بەسەرداهات، پارتی و یەکێتی بەشێوەیەک لە شێوەکان لێکترازان و، بارزانیش

دەستبەرداری پۆستەکەی بوو، بۆیە چارەنووسی ڕەشنووسی ڕێککەوتنەکەش بە نادیاری مایەوەو، نەیانتوانی بیکەنە ڕێککەوتنامەیەکی درێژخایەنی ٣ ساڵی.

## ڕێككەوتنە ٣ مانگیە نوێیەكەی پارتی و یەكێتی

دوابەدوای گرژییەکانی ئەم دوایەی نێوان پارتی دیموکراتی کوردستان و یەکێتی نیشتمانی کوردستان، سەرهەڵدانی نارەزایی لە هەرێمی کوردستان لە لایەن بەشێک لە حزبەکان و هاووڵاتیان، ئەو دوو حزبە بەهۆی ترسیان لە ئەگەری ئەنجامدانی خۆپیشاندانی سەرتاسەری و ڕووخانی حکومەت، ڕێککەوتنێکی سیاسی و سەربازی کاتیان ئەنجامداوە.

**خاڵەکانی ڕێککەوتنەکەش بریتین لە :**

١-تا سێ مانگی تر هەڵبژاردن بکرێت ( بە گوێرەی هەل و مەرج و بارودۆخی هەردووک لا).

٢-لەئەگەری زیادبوونی نارەزایی لە هەر پارێزگاو قەزایەک، کەسێک وەکو حاکمی سەربازی دابنرێ.

٣-لە ئەگەری پێویستبوون بەهێزی سەربازی، پارتی دەتوانێ هێز بنێریت بۆ سنووری یەکێتی، بە پێچەوانەشەوە.

٤-هەڵمەتی ڕاگەیاندن لە دژی یەکتر ڕابگیرێت، بە تایبەت لە قەزیەی ١٦ ئۆکتۆبەر و شەنگال.

٥-ڕێککەوتنەکە بۆماوەی ٣٣ مانگ دەبێت ( تا هەڵبژاردنی داهاتوو)، ئەگەری درێژکردنەوەشی هەیە.

## سەعدی ئەحمد پیرە :بەبێ بانگەشە، بەشداریمان لە ریفراندۆم کرد

سەعدی ئەحمەد پیرە ڕایدەگەیەنێت وەک یەکێتی تا کۆتا ساتەکان داوامان لە "کاک مەسعود" کرد ریفراندۆم دوابخەین بەڵام سەرکەوتوو نەبوین و دواتریش بڕیارماندا بەبێ هەڵمەتی هەڵبژاردن بەشدار بین تیایدا.

ئاماژەی بۆ ئەوەش کرد"پێمانوابوو نامەی وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا بۆ دواخستنی ڕیفراندۆم وەک بەڵێننامەی بەلفۆر گرنگ بوو".

## پرسی ریفراندۆم و کورسی سەرۆکایەتی هەرێم

پرسی ریفراندۆم لە هەرێمی کوردستان زۆر لە سەنگی خۆی گەورەتر کراوە، بە شێکی زۆری ئەوانەی باس لە ریفراندۆم دەکەن بە داخەوە بە باشی تێینەگەیشتوون، یاخود دەتوانین بڵێین ریفراندۆم لە کوردستان لە چەمکە راستەقینەکەی خۆی لادراوەو کراوە بە ئامڕازی گەمەیەکی سیاسی قێزەون، کە خەریکە کۆمەڵگای کوردی زیاتر لە ناخەوە دابەش دەکات! بەر لەهەموو شتێک پێویستە ئاماژە بۆ ئەو راستیە سادەیە بکەین کە ریفراندۆم تەنیا پێوەرێکە بۆ خوێندنەوەو تێگەیشتن لەرای گشتی دەربارەی مەسەلەیەکی دیاریکراو، واتە نە ئەوەی دەنگ بە "بەڵێ" بدا بۆ مەسەلەکە دەبێتە قارەمان و نەئەوەی بە"نەخێر" دەبێتە خائین، چونکە لە راستیدا مەبەستی ریفراندۆم زانینی ژمارەی ئەو بەڵێ و نەخێرانەیە، ئەگەر هەمووی هەر بەبەڵێ یاخود بەنەخێر وەڵام بداتەوە، واتە لە بنەڕەتدا ئەو ریفراندۆمە بە هەڵە ئەنجام دراوە، چونکە ریفراندۆم، بە تایبەتی لە هەندێک مەسەلەی گرنگدا، بۆ پێوانی رای خەڵکە، جا ئەوەی بە نەخێر وەڵامی دایەوە تۆ بە خائین وڵات فرۆشی لەقەڵەم بدەی و سووکایەتی پێ بکەی، ئەمە واتای سەپاندنی رای کەمینەیەک دەگەیەنێت و لەگەڵ پرەنسیپەکانی دیموکراسیدا یەک ناگرێتەوە، لە راستیدا کێشەی

ریفراندۆم لە کوردستان دەربارەی مەسەلەی سەربەخۆ بوون یاخود سەربەخۆ نەبوون نیە، وەک میدیاکان و لایەنگرانی حزبەکان وێنای دەکەن، چونکە ریفراندۆمی ۲۰۰۵ ئەوەی سەلماند کە زۆرینەی رەهای کوردستان لەگەڵ جیابوونەوە لە عێراق و سەربەخۆ بوون دایە، لە راستیدا ئەوە خەڵکی کوردستان نەبووە مانەوەی لە عێراق هەڵبژاردووە، ئەوە سەرکردایەتی کورد، بەتایبەتی(یەکێتی، پارتی) بوون کە ئێستا دەیانەوێت خەڵک تاوانبار بکەن، کە خۆیان لەعێراقیەکانی تر عێراقی بووینەو لە چەندین دەرفەتی مێژوویی گرنگی تردا، کاریان لەسەر دروستکردنەوەی عێراقی نوێ کردووە، وەک ئەوەی عێراقی کۆن خێرو بێری بۆ کورد زۆر هەبووبێت! بە بێئەوەی حیسابێک بۆ رای خەڵکی کوردستان بکەن، لە ریفراندۆمی ۲۰۰۵ خەڵکی کوردستان گوتی بەڵێ بۆ جیابوونەوەو سەربەخۆیی، کەچی ئەوان عێراقیان ئاوەدان کردووەو دەستووریان داناو کاریان لەسەر ئەوە کە پێویستە مافەکانی کورد لە دەستووری عێراق جێی بکرێتەوە، وەک ئەوەی دەستوور ئەو ئامێرە ئەفسووناویە بێت بە کون فەیکونێک بتوانێت هەموو مافەکانی کوردستان دابین بکات! کەواتە ئەوەی لە هەرێمی کوردستان دەربارەی ریفراندۆم و سەربەخۆیی دەگوزەرێت، دەربارەی پرسی جیابوونەوەو دامەزراندنی دەوڵەتی کوردی نییە، ئەگەرچی بە ئەنقەست هەوڵدەدرێت وێنەکە وانیشانی خەڵک بدرێت، چونکە خەڵکی کوردستان کێشەی لەسەر بڕیاری جیابوونەوەو سەربەخۆ بوون نییە، ئەو بڕیارە پەرلەمانی کوردستانیش دەتوانێت بیدات، بەڵام بۆچی پەنا بۆ پەرلەمان نابردرێت هەوڵدەدرێت پەنا بۆ ریفراندۆم ببردرێت؟ بەر لەهەموو شتێک ریفراندۆم دەربارەی ئەو مەسەلانە دەکرێت کە پەرلەمان بە هۆی هاوسەنگی دەنگەکان نەتوانێت

یـەکلایی بکاتـەوە، بـەڵام دەربـارەی مەسـەلە چارەنووسسـازەکان، ئـەوە پەرلـەمان وردتـرو کارامـەتر دەتوانێت بڕیـاری پێویسـت گەڵاڵـە بکـات، بـە تایبـەتی بـۆ مەسـەلەیەکی وەک مەسـەلەی جیابوونـەوەو سـەربەخۆیی. لـە ڕووی تیۆرییـەوە یـەکێک لـەو ڕەخنانـەی لـە ریفراندۆم دەگیرێت ئەوەیـە کەشێوازێکە لە شێوازەکانی بازدان بەسەر پەرلەمان، لەکاتێکدا هـەردوو لا نوێنەرایەتی رای گەل دەکەن، لە پەرلەمان بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ و لـە ریفرانـدۆم بـە شـێوەیەکی ڕاسـتەوخۆ، کەواتـە یـەکێک لـە مەبەسـتە سیاسـیەکانی پشـت مەسـەلەی ریفرانـدۆم لـە هـەرێمی کوردسـتان زیـاتر بێبایەخکردنی پەرلەمانی کوردستانە، دەیانـەوێت بـە خـەڵک بڵێن پەرلـەمان هەبێت یاخود نـەبێت، ئـەوان دەتـوانن بڕیـار لەسـەر پرسـی چارەنووسسـاز بدەن و بگەڕێنەوە بۆ رای خەڵکیش!!!

کەواتە پرسی ریفراندۆم لە هەرێمی کوردستان ڕەهەندێکی قـووڵتری هەیە لە مەسەلەی تەنیا ئەنجامدانی پرۆسەیەک بۆ زانین و وەرگرتنی رای خـەڵک، لەکوردسـتان تـاوەکو ئێسـتا ریفرانـدۆم ڕێـک پێچەوانـەی مەبەستەکەی خۆی پێکاوە، لـە جیاتی ئـەوەی کۆدەنگیـەک دروست بکرێت بۆ مەسـەلەیەکی چارەنووسسـاز، ئەگـەر گریمـانی ئـەوە بکـەین کـە ئـەوان ڕاسـت دەکـەن و بەڕاسـتی ریفرانـدۆم بـۆ مەسـەلەیەکی چارەنووسسـاز ئـەنجام دەدەن، کۆمـەڵگای کـوردی زیـاتر دابـەش کـردووە، واتـە لـە ریفراندۆمـەوە زەمینـە سـازی ناکرێت بـۆ یـەک دەنگـی، بـەڵکو وا زەمینـە سازی دەکرێت بۆ زیاتر دابەشکردن و لـەتکردنی باشـووری کوردسـتان، پاشان کێیە مافی ئەوەی هەیـە داوای ریفرانـدۆم بکـات؟ بێگومـان حکومـەت مـافی ئـەوەی هەیـە دەربـارەی هـەر مەسـەلەیەک داوای ریفرانـدۆم بکـات، چونکە لایەنێکی جێبەجێکارە، بەڵام پێویستە لـە کـەمترین حاڵەتدا حکومـەت

شەرعیەتی یاسایی خۆی هەبێت!ئایا حكومەتی هەرێم لە رووی یاساییەوە شەرعیەتی ماوە؟ بێگومان نەخێر، كاتێك ئەو پەرلەمانە لەكاردەخرێت كە شەرعیەتی بە حكومەت داوە، ئەوا بێگومان حكومەتیش شەرعیەتی نامێنێت، كەواتە حكومەت لە رێگای ئەو هێزەی كە ناردیە رێگای سەرۆكی پەرلەمان و پەرلەمانی لەكارخست، شەرعیەتی یاسایی لە خۆشی سەندەوە و بووە حكومەتێكی زەوتكەری دەسەڵات، ئەگەر دەزگای سەرۆكایەتی هەرێمیش ئەو بڕیارە بدات، ئەوا بێگومان پارتی خۆی دڵنیایە لەوەی كە بارزانی ئەو شەرعیەتەی نەماوەو ماوەكەی بەسەرچووە، تەنانەت خودی بارزانی خۆشی ماوەیەكی زۆرە ئامادە نیە وەك سەرۆكی هەرێم ئیمزا بكات، واتە ئەویش دەزانێت و دان بەوەدا دەنێت كە شەرعیەتی نەماوە، كەواتە كێ داوای ریفراندۆم دەكات، پارتی دیموكراتی كوردستان؟ حزبێك بە تەنیا ناتوانێت نوێنەرایەتی هەموو خەڵكی كوردستان بكات، لە كاتێكدا خاوەنی نیوەی دەنگەكانی كوردستانیش نییە، بەو هەڵبژاردنە پڕ لە گومان و راپرسیەش كە ئەنجامدرا؟كەواتە بەرلەهەموو شتێك بۆ ئەوەی حكومەت شەرعیەتی بگەڕێتەوە پێویستە پەرلەمان كارابكرێتەوە، هەرچۆنێك بێت و لەژێر هەر ناو و سەرۆكایەتیەك بێت، گرنگ ئەوەیە دەبێت دەزگای یاسادانان لە كوردستان كارا بێت بۆ ئەوەی حكومەت شەرعیەتی بۆ بگەڕێتەوە. یەكێك لەكێشەكانی ریفراندۆم دروست بوونی پرسیارە دەربارەی كاتی ریفراندۆم، كە ئەمە زیاتر گومان لای خەڵك و لای حزبە دژەبەرەكانی پارتی دروست دەكات، لە ماوەیەكە كەبەر لە ماوەی هەڵبژاردنی گشتی هەرێمی كوردستانە، بۆچی لەگەڵ هەڵبژاردن ناكرێت، لە رووی

داراییشەوە تێچوونی كەمتر دەبێت! بە كورتی دەتوانین دیاریكردنی ئەو ماوەیە، واتە ٩/٢٥ بۆ ریفراندۆم بە چەند فاكتەرێك ببەستینەوە:

1- بەو گۆڕانانەی كە دوای شەڕی مووسڵ دێنە ئاراوە، دیارە بەڕێز بارزانی بەرلەشەڕی مووسڵ هەڕەشەی كردوو تەنانەت بە شێوەیەكی نا راستەوخۆش بە یەكێك لە هۆكارەكانی كەوتنی مووسڵ لەقەڵەم دەدرێت، دەست بەتاڵ بوونی حكوومەتی عێراق لە مووسڵ، واتای تەسفیەی حیساب دەبێت لەگەڵ بارزانی! بە تایبەتیش گومانی ئەوە دەكرێت، كە یەكێتی نیشتمانی كوردستانیش وەک بەشێک لە هاوپەیمانیەتی شیعە، هەوڵ بدەن بارزانی بخەنە دۆخێكەوە كە زیاتر بچووكی بكەنەوە، لە كاتێكدا توركیای هاوپەیمانی بارزانی لە قەیرانی گەورەدایەو ئەمریكا هەڵویستی بەرامبەری وەكو پێشووتر نیە، كەواتە پارتی خۆی دەبینێتەوە هەر لە شەنگالەوە تاوەكو دوا خاڵی زۆنی زەرد ئابڵووقە دراوە، بۆیە دەیەوێت لە رێگای مەسەلەی ریفراندۆمەوە كێشەی حزبەكەی بكا بە كێشەی هەموو كوردو هەموو كورد رابكێشێتە نێو ململانێ و شەڕێكی چارەنووس نادیارەوە، وەک ئەوەی لە ساڵی ١٩٧٥ "مستەفا بارزانی" ئەنجامیداو تاک لایەنە بڕیاری شەڕی دا، لەو بوارەوە بریماكۆف لە كتێبەكەی (رۆژهەڵاتی ناوەڕاست و جیهان) دەڵێت دكتۆر محمود عوسمان هاتە لام و داوای لێكردم بەڵكو بارزانی رازی بكەم كە دەرفەتی زیاتر بە دانوستان بدات و هێشتابوار بۆ دانوستان ماوە، بریماكۆف دەڵێت: كاتێک ئەوەم بە بارزانی راگەیاند، گوتی هەموو شتێكمان لەگەڵ ئێران براندۆتەوەو ئەوان خۆراک چەک و تەقەمەنیمان بۆ دابین دەكەن، بەم چەشنە تاک لایەنە بڕیاری هەڵگیرسانەوەی شەڕی داو تاک لایەنەش شەڕەكەی راگرت و خەڵكی رەوانەی ماڵەوە كرد!بەڵام لە قۆناغی ئێستا

پارتی ئەو دەسەڵاتەی نییە، کە بە تەنیا هەموو کۆمەڵگای کوردی بۆ بۆسەیەک رابکێشێت کە خۆی دایناوەتەوە،بگرە دەبێت بەرەکەی فراوان بکات کە ئەمەش لەو دۆخەی پارتی تێدایە کارێکی ئاسان نییە!

2- پارتی خوێندنەوەیەکی گوماناوی و رەشبینی بۆ هەڵوێستی هێزە نێودەوڵەتیەکان هەیە، کە هەمیشە پێ لەسەر یەک پارچەیی خاکی عێراق دادەگرن، گەیشتۆتە ئەو دەرئەنجامەی کە دوای شەڕی رێکخراوی دەوڵەتی ئیسلامی (داعش) مەسەلەی کورد لە باشوور لە قەوارەی خۆی بچووکتر دەکرێتەوە، هەڵوێستی بارزانیش دیارە بە هۆی داخستنی پەرلەمانەوە لە دۆخێکدا نیە ئێرەیی پێبردرێت، بۆیە کار لە دروستکردنی قەیران دەکات وەکو کارتێکی فشار بەکاری دەهێنێت؟

3- مەسەلەی سەرۆکایەتی هەرێم وەک لەبەشەکەی تر ئاماژەی پێکرا یەکێکە لە هۆکارەکانی قەیرانەکانی هەرێم، بارزانی ماوەکەی تەواو بووە و ناتوانێت بەرێگایەکی دیموکراسی خۆی هەڵبژێرێتەوە، لەبەرئەوەی دوو خوولی تەواو کردووە، هاوکات پۆستی سەرۆکایەتی هەرێم لەرێگای ململانێیەکانەوە هێندە سووک کراوە بۆتە بارێکی گران بۆ بارزانی، بەڵام پۆستی سەرۆکی هەرێم بە تەنیا پەیوەندی بە ململانێکانی پارتی لەگەڵ هێزە نەیارەکانیدا نیە، بەڵکو پەیوەندی بەململانێیە نێوخۆییەکانی پارتیشەوە هەیە، کێ دەبێتە جێگرەوەی بارزانی ؟ ئەوە کە دیارە لە بنەماڵەی بارزان دەرناچێت، بەڵام کوڕەکەی یاخود برازایەکەی، ئەمەش کێشەیەکی تری بارزانیە، ئایا ئەو سەرکردە سەربازی و سیاسیانەی کە وەلایان بۆ بارزانی هەیە، وەلایان بۆ کام لایەن دەبێت، یاخود هەمان وەلایان دەمێنێتەوە؟ لەکاتێکدا بەشێکی زۆریان لە ناخەوە رووخاون بە هۆی سیاسەتی پارتی لە قەیرانێکی دەروونیدا دەژین؟

4- بەهۆی دزێوبوونی پارتی و زیاتر دزێوكردنی لە لایەن ركابەرەكانی و میدیاكاندا، پارتی هێندە ناشرین بووە كە زۆرینەی خەڵكی كوردستان بە هۆكاری هەموو شكستەكانی دەزانن، قۆرخكردنی پۆستی سەرۆكایەتی هەرێم و كۆنترۆڵكردنی كایە هەستیارەكانی هەرێم، وایكردووە كە پارتی لە ئاستی ئەم بەرپرسیاریەتیەدا نەبێت، بۆیە چوونە ناو هەڵبژاردن بەو دۆخەوە، بواری ساختەكردنی دەنگەكانیش فریای ناكەوێت، دڵنیایە لەوەی كە قەوارەی ئێجگار بچووك دەبێتەوە، بۆیە بۆ پەكخستنی هەڵبژاردن، پەنا بۆ ریفراندۆم دەبات و مەسەلەیەكی زەقی نەتەوایەتی ، كە مەسەلەی سەربەخۆیی و دەوڵەتی كوردیە دەكاتە قەلغان و شكستەكانی خۆی لە پەنا دەشارێتەوە، ئەگینا پارتی خۆشی دەزانێت، كە هیچ زەمینە سازییەكی نەكردووە بۆ سەربەخۆیی، تەنانەت ئەو چوارچێوە جوگرافیەی، كە ریفراندۆمی تێدا ئەنجام دەدرێت لە ژێر كۆنترۆڵی بارزانیدا نیە، پارتی ناتوانێت تەنیا لەرێگای تەخوینكردنی بەرامبەرەوە رای گشتی بجووڵێنێت و یاری بە تۆپەكە بكات، هاوكات لەسەر ئاستی نێودەوڵەتیش هەڵویستەكان پۆزەتیڤانە نییە، بارزانی دەیتوانی بە بەرەیەكی ناوخۆیی یەكگرتوو بەهێز، كاریگەری لەسەر رای گشتی نێودەوڵەتی دروست بكات، یاخود هەر نەبێت بتوانێت بۆ ماوەیەک خۆی بەرامبەر هەڵویستە نێگەتیف و پەرچەكردارەكانیان بگرێت، بەڵام بەو ناوماڵە ئەمەشی بۆ ناكرێت، بۆیە تاكە رێگا لەبەردەم پارتی ئەگەر لەو مەسەلەیە راستگۆ بێت، دەبێت كار لەسەر یەكگرتنەوەی ناوماڵی كورد بكات، كە خۆی هۆكارێكی گەورە بووە لە پەرتەوازەكردنیدا.

5- ساختەكردنی مێژوو، دیارە پارتی دەزانێت كە كورد دوای شەڕی داعش قۆناغێكی سەختی لەبەردەمە، دەشزانێت نە ئەوان و نە حزبەكانی

تریش لە ئاستی بەر پرسیاریەتی دا نەبوونەو ئەوان هەرێمی کوردستانیان بەو دۆخە سەختەی ئەمڕۆ گەیاندووە، بۆیە کار لەسەر ساختەکردنی مێژوو دەکەن، دەیانەوێت خۆیان بە سەربەخۆ خواز و خاوەنی "پرۆژەی دەوڵەتی کوردی" نیشان بدەن و ئەوانەی تریش بە دژە دەوڵەت، واتە خۆیان لەبەرپرسیاریەتی هەر شکسێک بدزنەوە کە چاوەڕێیان دەکات و بیخەنە ئەستۆی لایەنەکانی تر، ئەگینا پارتی نە هەستیارترین قۆناغی دوای راپەڕین و یەکەم هەڵبژاردنی کوردستاندا، کە کۆی هاوسەنگی سیاسی لەسەر ئاستی هەرێمی و نێو دەوڵەتی و تەنانەت سیستەمی جیهانی گۆڕان، ئەوان نەیانتوانی لە حوکمی زیاتر داوا بکەن، هەر بگەڕێینەوە بۆ بۆ رۆژنامەکانی خۆیان، کەپڕن لە بانگەشە کردن بۆ دیموکراسی، بارزانی لە کۆڕو کۆبوونەوەکان بانگەشەی ئەوەی دەکرد کە ئەوان نایانەوێت (دژی تەیار مەلە بەکەن)، کەچی لەو قۆناغەی ئێستادا خۆیان کرووەتە خاوەنی پڕۆژەی دەوڵەتی کوردی، کە قۆناغێکی زۆر ئاڵۆزترەو بۆ ماوەی زیاتر لە چارەکە سەدەیە هەر خۆیان لەگەڵ هاوپەیمانەکانیان بە هەموو توانایان کار لەسەر تێکدانی هەموو بنەماکانی دامەزراندنی دەوڵەتی کوردی دەکەن!

6- دیارە پارتی تا رادەیەکی گوماناوی تێکەڵ بە تورکیا بووە، بەرادەیەک کە گومانی ئەوە دەکرێت و خوێندنەوەی ئەوەی بۆ دەکرێت کە هیچ ئیرادەیەکی لە دەست خۆی نەماوە، بۆیە یەکێک لە ئەگەرەکان لەکاتی چڕ بوونەوەی ململانێکان لەگەڵ عێراق، کە گومانی تیانیە چڕ دەبێتەوەو هەموو ئاماژەکان بۆ ئەوە دەچن رووبەرووبوونەوە لەنێوان کوردو حەشدی شەعبی و سوپای عێراق، کە گەیشتوونەتەوە سەر سنوورەکانی هەرێمی کوردستان روودەدات، لەوحاڵەتەدا ئەگەر پارتی بە تەنیا

بمێنێتەوە ئەوا ریفراندۆم وەک ئامڕازێک بەکاربهێنرێت بۆ گەڕاندنەوەی ویلایەتی مووسڵ، بە تایبەتی دەڤەری زەرد بۆ سەر تورکیا، جا لە ژێر هەر ناوێکی بریقەداردا بێت، بەتایبەتیش ئەگەر هاتوو ئەوەمان زانی کە ماوەیەکی زۆرە کادیرەکانی ئاکپارتی لە کۆڕو کۆبوونەوەکانیان باسی ئەوە دەکەن کە لە ڕێگای ریفراندۆمەوە ژمارەیەک لە ناوچەکانی دەوڵەتی عوسمانی رووخاو دەگەڕێننەوە سەر ئیمپراتۆریەتی عوسمانی نوێ، لەمەشدا ناوی باکووری عێراق دەهێنن! کە دیارە ناتوانن بە هۆی دابەش بوونی سیاسی و رۆڵی ئێران ئەمە لەناوچەی زەردیشدا بکەن، بۆیە ئەو دۆخەی پارتی دەقۆزنەوە و سیاسەتەکەی خۆیان پراکتیزە دەکەن!

هەر چۆنێک بێت، تاوەکو ئێستا بەرزکردنەوەی ئەو دروشمە لە لایەن پارتیەوە متمانەی پەیدا نەکردوە، بەڵام لە هەموو حاڵەتەکاندا، وەک پێشتر ئاماژەکان پێکرد، هەرێمی کوردستان بە قۆناغێکی زۆر مەترسیداردا دەڕوات و پێویستی بە بەخۆداچوونەوەیەکی جدی هەیە.

## تارمایی بارزانی

زۆرجاران کەسێک دەڵێت تارمایی فڵان شت یان کەس هاتە بەرچاو، ئەمە زیاتر بۆ کەسە نادیارەکان یان ون بووەکان دەوترێت، "مەسعود بارزانی" لە دوای ریفراندۆم لە بری ئەو بەڵێنە ئاگرییانەی دەیدا، لە بری ئەوەی خۆی بچێتە کەرکوک و داکۆکیی لێ بکات، لەبری ئەوەی سەری بداتە دەست خەڵک و بڵێ چیم لێدەکەن بیکەن، لەبری ئەوەی بڵێت من خۆم لەگەڵ بەغداو ئەمریکا لەپێش دەستپێکردنی پرۆسەی ئازادکردنی موسڵ رێککەوتووم کە لەدوای کۆتایی هاتنی داعش دەبێت هێزەکانی هەرێم بگەڕێتەوە بۆ ئەو شوێنانەی کە لە پێش هاتنی داعش لێی بوون هەر بۆیە کەرکوکیشیان پێوە لووش دا (چونکە دەسەڵاتی یەکێتی تیایدا لەسەر بوو) لە بری دەرکردنی بەیاننامەیەک کە تیایدا دان بە سیاسەتی شکستی کارەسات هێنەردا بنێت و داوای لێبوردن بکات. یان لە جێی ئەوەی واز لە کاری سیاسی بێنێت و دوور کەوێتەوە، هاتوون سیناریۆ شاراوەکەیان کە هەمیشە بە درێژایی مێژوو هەیان بووە خستویانەتە گەڕ.

ئەوان لێرەو لەوێ باس لەوە دەکەن کە ناکۆکی لە نێوان بنامالّەی بارزانیدا هەیە (کە هەرگیز نابێت) ئەمەش بۆ ئەوەی وا لە خەڵک بکەن کە کەمتر چاو لەسەر یەک پلانی و یەکگرتوویان دابنێت.

سەرۆکی پارتی کە لە ئێستادا زۆر کەم دەردەکەوێت، کوڕەکەی و برازاکەی وەک تارمایی خۆی خستوەتە گەڕ و بەملاو بەولادا دێن دەڕۆن. دوایین دەرکەوتنی ئەو دوانە لە میونشنی ئەڵمانیایە کە هەردووکیان و دوو داردەستەکەیان لەگەڵ عەبادی کۆبوونەتەوە و بە خەڵکیش دەڵێن ئێمە ئامادەین لەگەڵ بەغدا بە گفتوگۆ کێشەکان چارەسەر بکەین.

هەمـوان دەزانـین کاتێـک عەبـادی دەڵێـت هەنـدێک کەس و لایەن لە هەرێـم هۆکـاری ئەم بـارودۆخەن و ئەوان لە دژی یەکێتـی خـاکی عێـراق لێدوان دەدەن و پیاوی دەرەکین و بەپێی دەستوور هەنگاو نانێن و زۆر شتی دیکە، مەبەستی عەبادی دیارە کە لە پارتی و مالّی بارزانییە، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە حەزی لە چارەیان نیە و ناشیەوێت ئەوان وەکو تاکە نوێنەری خەڵکی هەرێم بناسێت هەر بۆیەش لە دوای هەرکۆبوونەوەیەک لەگەڵ ئەوان زیاتر بۆ چەسپاندنی مەرجەکان پێداگری دەکات.

کـورد لەسـەر دەسـتی پـارتی و بـارزانی بـارودۆخەکەی بە ئەمـڕۆ گەیانـد، ئەوەش بەو مانـایە دێـت کە ئەوان سـەرکەوتوو نەبـوون لە رابەرایەتـی کردنـی پرۆسـەکە و گەیانـدنی بە ئامـانجی باشـتر لەوەی رابـردوو، ئەوان خۆیـان دەیـانووت دەبێت کارێـک بکەیـن دەسـکەوتەکانی راپەڕین بپارێزین بەلّام بە پێچەوانەوە کارێکیان کرد نەک دەسکەوتەکان و هەستی نەتەوەیی بەڵکو هەستی ئینتیمابوونیان بۆ خاکیش لای تاکی کورد سڕییەوە، هەستی خۆشەویستی بۆ شارو گوندیان لای خەڵک نەهێشت، تـاکی کـورد هەیە هەمـوو گەڕەکـی شـارەکەی خـۆی بە بسـتێک خـاکی ئەوروپا دەگۆڕێتەوە، خەڵک ئەوەندە بێزارە بە تەنها چەقەنەیەکی بەغدا ئامـادەیە بە تەقلە لێدان بڕوات، ئەوان (مـاڵی بـارزانی) کارێکیـان کـرد لە ئێستادا سیاسییەکان و سەرۆک خێڵەکان بیر لەوە دەکەنەوە چۆن خۆیان بە دەسەلّاتی بەغداوە گرێ بدەن، هەر پەرلەماتارەو دەلّـێ عەبـادی داوای لێ کردووم، بەلّام رەتم کردوەتەوە، باشـە ئەگەر لێـێ رانەبینێت داوای لـێ دەکات؟

ئەمە ئەو زەنـگە خەتەرنـاکەیە کە لە ئەنجـامی عینـادی بـارزانی و حسـاب بـۆ نەکردنـی بەرامبەرەکـانی هـاتنە پـێش، لە سـالّانی شەسـتەکان

کاتێک بەرەی خەڵک و بەرەی حکومەت جیاکرایەوە لە ئەنجامی هەمان رەوتی بارزانی باوک بوو لە بەرامبەر بیرو بۆچوونە جیاوازەکانی ناو پارتی دەیکرد، ئەوە بەردەوامی هەبوو تا وای لێهات لە کوردستاندا بە سەدان هەزار چەکداری کورد (جاش) لە حکومەتی بەغدا پارەیان وەردەگرت و دژی پێشمەرگە کەتنیان پێدەکرا.

دیسانەوە ئەم دیاردەیە سەرهەڵئەداتەوە، چونکە لە مانگی حوزەیرانی ۲۰۱۷ دا بارزانی بە هەموو حزبەکانی وت ئەگەر بە تەنیاش بووە خۆمان ریفراندۆم ئەنجام دەدەین، واتا حساب بۆ کەس ناکەین، ئەمڕۆش کوڕانی بارزانی لە لووتکەی دەسەلاتی شکست خواردودان، شکست خواردوو بەو مانایەی کە نەیانتوانی بارودۆخەکە بەرەو پێش و باشتر بەرن، نەیان توانی دەسکەوتەکان بپارێزن، ژیانی ئابووریيان تێکدا، هەیبەتیان بۆ هەرێم نەهێشت، ئاسایشی هەرێمیان خستە ژێر مەترسی و دەسەلاتی دەستی دەرەکییەوە، هەرێمیان خستە ژێر قەرزەوە و گوزەرانی خەڵکیشیان خراپتر کرد، مووچەیان شاردەوەو پارەکەیان بردە دەرەوە، هەیبەتی پەرلەمانیان شێواند و بەراست و چەپدا پەرلەمانتاریان دەرکرد و دەرگایان داخست، لە ناو پەرلەماندا پەرلەمانتاریان دەستبەسەر کرد و بەزۆر خستیانە بەردەم کامێرا بۆ ستایش کردن، ئەگەر هەموو ئەمانە کاری ئەم حکومەتە بێت ئیدی سیاسییەکانی ئەم هەرێمە بۆ بێدەنگن و دوایش دەڵێن ئێمە تاوانبار نین سەربەخۆیی نەتەوەیی و پرسی دیموکراسی ئەگەر ئەوە لەبەرچاو بگرین کە بارزانی دوای تەواوبوونی ماوەی یاسایی خۆی نایەوێت دەستبەردار بێ و پەرلەمانیشی پەککخستووە، لەم سۆنگەیەوە باسی ئەوە دەکرێت کە بیرۆکەی ریفراندۆم تەنیا بەهانەیەکە بۆ بارزانی و حیزبەکەی، تا دەسەلاتی ڕاگرێت و

سەرجەم قەیرانە ناوخۆییەکان پەردەپۆش بکات، نەک ئەوەی وەڵامی خواستی مێژوویی کورد بداتەوە؟

کەلە بارەی پەیوەندی دیموکراسی و سەربەخۆییەوە دەتوانین لە دوو ئاستەوە تەماشای بکەین؛ سەرەتا دەبێ بڵێین لە نەریتی چەپ لە ئاستی لۆکاڵیدا و بە گشتی لە ئاستی جیهانیشدا تێگەیشتنێکی نوقسان بۆ پرسی دەسەڵاتی نەتەوەیی و سەربەخۆیی بوونی هەیە؛ لانیکەم لە ڕووی پەیوەندی نێونەتەوەییەوە، بابەتێک کە گومان هەڵناگرێت ئەوەیە کە ناوەڕۆکی سیاسی و کۆمەڵایەتی دەوڵەتەکان پەیوەندی بە قەوارەی نێونەتەوەیی ئەو دەوڵەتانەوە نییە. نمونەیەکی دیاری ئەم باسە یەکێتی و سۆڤیەت و ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە جەنگی سارددا بوون؛ هەردوو وڵات بە ئایدۆلۆژیا و ستراکتۆری سیاسی و کۆمەڵایەتی جیاواز و تەنانەت دژبەیەک، ملکەچی ڕێسا نێودەوڵەتییەکان و پێویستییە جیۆپۆلۆتیکەکان بوون. ئەمە مانای وایە کە شەرعیەت و تەنانەت بابەتی دەوڵەت بەمانا گشتییەکەی کۆمەڵی سیاسی (political community) کە دەوڵەتی نەتەوەی فۆرمێکە لە فۆرمەکانی، پابەستی ناوەڕۆکەکەی، بە تایبەت بەڕێکخستنی دیموکراسی نییە. ئەگەر وا بووایە هەر ئێستا دەبوو نەوەد لە سەدی دەوڵەتەکانی جیهان، لە بەریتانیاوە تا کۆماری ئیسلامی ئێران، هەڵبوەشانایەتەوە. کەواتە، لە ڕووی شیکارییەوە، زۆر گرنگە ئەم دووانە، واتە ناوەڕۆکی دەوڵەت و قەوارە یان فۆرمەکەی لە یەکتر جیا بکەینەوە. ئاستی خوازراوبوون و بابەتیبوونی سەربەخۆیی نەتەوەیی، نەک لەو ناوەڕۆکەی دەوڵەتی نەتەوەیی دەیگرێتە خۆی، بەڵکو دەبێ لە شوێنێکی تر سۆراخی بکەین. واتە ئەوەی لە سەردەمی دەرکەوتنی دەوڵەت نەتەوە وەک خشتی بینای جوگرافیای سیاسی جیهان، دەسەڵاتی

نەتەوەیی (هەر لەگەڵ دانپێدانانی نێودەوڵەتیدا) دەتوانێ ماف و پاراستن بۆ خەڵکەکەی دابین بکات. بۆ نموونە جینۆسایدی "بەرمە" بە نموونە وەربگرین، ئەگەر موسوڵمانانی ئەو ناوچەیە دەوڵەتێکیان هەبووایە یان دەوڵەتی "بەرمە" دەستورێکی هەبووایە کە ئەو وڵاتەی وەک وڵاتێکی فرەنەتەوە بناساندایە، ئەم کارەسات و کوشتارەی ئێستای لێنەدەکەوتەوە، یان ئەگەری دەرکەوتنی زۆر کەم دەبێتەوە و زەمینەی دەرکەوتنی ململانێی لەم جۆرە نەدەهاتە ئاراوە. نموونەی لەم جۆرەمان زۆر لە بەردەستە. بەهەرحاڵ مەبەستی من ئەوەیە کە سەربەخۆیی نەتەوەیی فۆرمێکە نەک ناوەڕۆکێکی سیاسی و دووەمیش، لە نێوان ئەم دوو ئاستەدا پەیوەندییەکی ڕاستەوانە بوونی نییە .

ئەگەر بگەڕێینەوە بۆ مێژووی جیهانی مۆدێرن، دەبینین کە بەوجۆرە نەبووە کە دامەزراوە نەتەوەییەکان (نەک دیموکراسییەکان) پێشوەخت لە جوگرافیایەکی تایبەتدا هەبن و دواتر بەرگی نەتەوەییان لەبەر کردبێت. لە زۆربەی حاڵەتەکاندا پێچەوانەی ئەمە ڕوویداوە. سەرەتا قەوارەیەکی نەتەوەیی دامەزراوە و دواتر بە شێوەی شۆڕش یان بەکاوەخۆ، دامەزراوە ناوخۆییە سیاسییەکان لەو یەکە جوگرافییە و کۆمەڵگا دیاریکراوەدا ڕەگی داکوتاوە و گەشەی سەندووە.

کوردستانی عێراق، لەگەڵ ئەمانەش حاڵەتێکی تایبەتی هەیە. من مەرج نییە هەمیشە لایەنگری سەربەخۆیی بم، بەڵکو لایەنگری مافی چارەی خۆنووسینی خەڵک یان نەتەوەکانم. بەڵام لەبەر هۆکاری مێژووی جۆراوجۆر و لەم ناوچەیەدا، دەتوانین بڵێین مافی چارەی خۆنووسین بە شێوەیەکی حاشاهەڵنەگر بە ڕێگەی سەربەخۆییدا دەڕوات.

خەڵکانی هەرێمی کوردستان لە یەکەم ڕۆژی دامەزراندنی دەوڵەتی کۆڵۆنیالی عێراقەوە هێرشیان کراوەتە سەر، کۆکۆژی و کیمیاباران و ئەنفال کراون، بەدەر لەوەی ناوەڕۆکی دەوڵەتی سەربەخۆی کوردستان چۆن بێت یان سەرکردەکانی پێشکەوتووخواز بن یان دواکەوتووخواز، دەوڵەت نەتەوە دەتوانێ پاراستنێکی نێونەتەوەییان لە چوارچێوەی نۆرم و بنەڕەتە نێونەتەوەییەکان بۆ دابین بکات. دەوڵەت نەتەوە (بەو مەرجەی لە ئاستی نێونەتەوەییدا دانی پێدا بنرێت) دەتوانێ لەمپەرێک بێت لەبەردەم دەرکەوتنی بەردەوامی سەرکوت و کۆنترۆڵ لە عێراقی مۆدێرندا، و ئەم مەترسییە بۆ هەمیشە ببڕێنێتەوە. لەم حاڵەتەدا نابێ دابرانی سیاسی هەرێمی کوردستان لەگەڵ دەوڵەتی ناوەند و دانانی هێڵێ قەدەغەکردنی فڕین لە بیستوپێنج ساڵی ڕابردوودا لە بیربکەین. دوو نەوە لە خەلکی کوردستانی عێراق ئێستا هیچ پەیوەندییەکی ئۆرگانیکی کلتووری و سیاسیان لەگەڵ دەوڵەتی ناوەندی عێراق نەماوە و بەشێکی زۆریشیان ناتوانن بە عەرەبی قسە بکەن.

## سەربەخۆیی نەتەوەیی و پرسی مێژوو

**وادیارە ئێوە قەوارەی سەربەخۆیی نەتەوەیی لە ناوەڕۆکی دیموکراسی لە پێشتر دەزانن. ئەگەر وایە ئایا ئەم لە پێشتردانانە ئەزموونییە یان بە جۆرێکی بونیادی لە چوارچێوەی جۆرێک کرۆنۆلۆژیای تایبەتدا مانا وەردەگرێت؟**

نا، من ئەوە لە پێشتر دانانێم. و ئەگەر ئاماژەم پێدا بێت کە دروستکردنی قەوارەی نەتەوەیی بە زۆری پێش دروستبوونی دامەزراوەی نێوخۆیی کۆمەڵایەتی و سیاسیە لە یەکە جوگرافیەکاندا، ئەمەم تەنیا بەلەرچاوگرتنی دەوڵەتی نەتەوەیی وەک دیاردەیەکی تایبەت بە مۆدێرنێتەی سەرمایەداری وت و نابێ لێیەوە نەبوونی دەوڵەت لە فۆرمە پێش مۆدێرنەکەیدا، پێش گەشەکردنی سەرمایەداری لێ بخوێنینەوە. جگە لەوەش، مەبەستەکە لە پێشدانانی سەربەخۆیی بەرامبەر دیموکراسی نییە. ئەوەی لە ڕووی ئەزموونییەوە دەسەلمێت، لە پێشتربوونی ڕۆڵی دەوڵەتە و ڕۆڵە نێودەوڵەتییەکەیەتی لەسەر چین و فۆرمەی جیاوازەکانی ڕێکخستنی سیاسی ناو دەوڵەت نەتەوەیەک. ئەم واقیعە ئەزموونییە مێژووییە، هەڵبەت بە شێوەیەکی چەمکیانە و تیۆریکیش دەتوانین بە گەڕانەوە بۆ ئایدیای "گەشەی ناهاوسەنگ و تێکەڵاو" بخەینە ڕوو.

ڕازیبوون لە ڕیزبەندی لۆجیکیانە یان مێژوویی – ئەزموونیانەی "دیموکراسی" و "سەربەخۆیی نەتەوەیی" پیشت بەو گریمانە ناڕاستە دەبەستێت کە گوایە دەوڵەت و دیموکراسی دوو دیاردەی جیاواز و سەربەخۆ و دوور لە یەکترن. سەربەخۆیی نەتەوەیی و دیموکراسی لە خەسڵەتەکانی دەوڵەتن لە مانا بونیادی و گشتییەکەیدا واتە "بونیادی

دەسـەلاتی گشـتی". دیموكراسـی لە مانـا گشـتییەكەیدا "حكـومەتی خەڵـك لەسـەر خەڵك" فۆرمێكی مێژوویـی تـایبەت لە "بونیـادی دەسـەلاتی گشـتی" یان هەمان دەوڵەتە. لە گوتاری چەپدا ئەم گریمـانە ناڕاسـتە دەرهاوێشـتەی ناڕاسـتی گریمـانەیەكی دیكەیە لە ماركسـیزمی كلاسـیكدا كە دەڵـێ: دەوڵەت دروستكەری چینە كۆمەلایەتییەكانە، لە كاتێكدا چەندین تـوێژەر بـۆ نمـوونە ئالن وود، بیرمەندی ناوداری سـەر بە نەریتی ماركسـیزمی سیاسـی كە بەم دواییانە مـرد، پێـی وابـووە و لە ڕووی ئەزموونیشـەوە سـەلماندوویەتی كە لەڕاسـتیدا لە ڕووی مێژووییەوە چینە كۆمەلایەتییەكـان بەرەنجـامی ڕۆڵـی دەوڵەتن لەو مانا گشتییەی لەسەرەوە باسمان كرد، نەك پێچەوانەكەی.

بەم جۆرە لەبارەی كوردستانی عێراقەوە، پرسیارەكە تێكەڵكردن یان لە پێشدانانی دامەزراندنی دیموكراسی یان دەوڵەت نییە. لەم لایەنەوەیە كە ئایـــا دیموكراســـی، كە بە سروشـــتی خـــۆی مـــافی ژیـــان و یەكســـانی نێـــونەتەوەییش گرەنتـــی دەكـــات، لای كوردەكـــان لە قـــاڵبی دەوڵەتـــی پێیشـــوەختەی عێـــراق مســـۆگەرترە و بەردەســـتترە یـــان لە چوارچێـــوەی دەوڵەتـــی ســـەربەخۆی كوردســـتان؟ وەلامـــدانەوەی ئەم پرســـیارە (بە لەبەرچـاوگرتنی تایبەتمەنـدی و ئەزمـوونی مێژوویـی و سیاسـی وڵاتـی عێـراق كە پێشـتریش باسـم كـرد)، ئەوەیە كە: یـان لە چوارچێـوەی كوردستانێكی سەربەخۆ و یان دەوڵەتێكی كۆنفیدراتیڤ كە پێكهاتووە لە یەككگرتنـی ئـازادانە و یەكسـانی دوو دەوڵەتـی سـەربەخۆی كوردسـتان و عێراق. جۆری دووەم بەڕای من ڕەنگە لای سـەركردە كوردەكانیش قبـوڵ بێت، بەلام وادیارە لایەنەكانی دیكە نەیانخستۆتە ڕوو.

**ئێوە پەنجە دەخەنە سەر دۆخی تایبەتی کوردستانی عێراق و زەمینەی مێژوویی ئەو ناوچەیە، هاوکات دەگەڕێنەوە بۆ ساڵانی سەرەتای دوای شۆڕشی ئۆکتۆبەر و بە ناڕاستەوخۆ ئاماژە بە هەڵوێستی لینین دەکەن لەبارەی مافی چارەنووس تا ئاستی جیابووەوە؛ ئایا گەڕانەوەیەکی لەم جۆرە بۆ سەرەتای سەدەی بیستەم، زەمەن شێواوی یاخود ئاناکرۆتیک (anachronic) نییە؟**

گریمانە مێژووییەکەی ئەم پرسیارە ڕاست نییە. ئەگەر بگەڕێینەوە بۆ سەرەتای سەدەی ڕابردوو، ئەوە ویلسۆنی ئەمریکی بوو کە لەگەڵ لینین لە "چواردە بنەڕەتەکەیدا" مافی چارەنووسی نەتەوەکانی خستە ڕوو و بەرگری لێکرد. لە ڕاستیشدا، ویلایەتە یەکگرتووەکانیش ئاڵاهەڵگری مافی چارەنووس بوو: یەکێک لە هۆکارە سەرەکییەکانی ئەم پرسە ئەوەیە کە کەڵەکەی سەرمایەدارانە بە پێچەوانەی شێوازەکانی پێش سەرمایەداری، پشت بە داگیرکردنی زەوی و جوگرافیا و هەرێم نابەستێت و هەربۆیە خۆی لە سنووری نەتەوەییدا قەتیس ناکات. لۆجیکی کەڵەکردنی سەرمایەداری، لەگەڵ ئەوەی پێناسەیەکی تەواو ئابوورییانەی هەیە، هەم لە ناوەوە و هەم لەو دیوی سنوورە نەتەوەییەکانەوە لە گەڕدایە. تێپەڕینی سەرمایە لە سنوورە نەتەوەییەکان بە مانای لادان لە حاکمیەتی نەتەوەیی نایەت، چونکە دەسەڵاتی نەتەوەیی مۆدێرن، وەک پێشتریش ئاماژەی پێکرا، پێناسەیەکی تەواو سیاسی هەیە و سەرمایە دیاردەیەکی ئابووری دەزانرێت. خودی ئەم دۆخەش بەرەنجامی دیاردەیەکی تاقانەی جیاکردنەوەی دامەزراوەیی، نەک بونیادی، پانتایی ئابووری و سیاسەتە لە شێوازەکانی بەرهەمهێنانی سەرمایەداری، کە

کەڵەکەکردنی سەرمایە لە داگیرکردنی دەوڵەت، بە شێوەی دامەزراو، جیا دەکاتەوە. دووانەی بازاڕ و دەوڵەت لە زانستی ئابووریدا دەرخەری گۆڕانکارییەکی مێژوویی بێ وێنەیە کە سەرمایەداری لەگەڵ خۆی هەڵیگرتووە. لە سەردەمی پێش سەرمایەداری وڵاتەکان وەزارەتێکی جەنگ (نەک بەرگری)یشان هەبوو. بۆچی؟ چونکە یەکێک لە ڕێگە سەرەکییەکانی کەڵەکەکردنی سەرمایە، داگیرکاری بوو و لەم مانایەدا ئابووری و جیۆپۆلەتیک جیا نەدەکرانەوە.

**مەگەر گەشەسەندنی ناهاوسەنگ و تێکەڵ، کە بنەمای شیکاری بەڕێزیشتانە بۆ مۆدێرنێتە لە ئێران، پشت بەم خەسڵەتە تایبەتییە لۆکاڵی و ناوچەییانە نابەستێ؟**

ئایدیای گەشەسەندنی ناهاوسەنگ و تێکەڵ، لە بنەڕەتەوە لە ناهاوسەنگی جیهانی کۆمەڵایەتییەوە دەست پێدەکات و تێکەڵبوونی ڕەوەندەکانی گەشەی کۆمەڵایەتی و فرەهێڵبوونی مێژوویی لە بونیادیترین ئاستی تیۆریشدا دەخاتە ڕوو و هەرسی دەکات. هەر بۆیە ئەم ئایدیایە لە فرەیی سیاسی جیهانیشەوە هاتووە و لەبەر ئەم هۆکارەش لەبەر بونیادی بوونناسی کۆمەڵایەتی کێشەی دەروونی تیۆری و میتۆدیکی مارکسیزمیشی نییە. لەڕووی شیکاریشەوە ئەم ئایدیایە تیۆرییانە جیۆپۆلەتیکیش لەبەرچاو دەگرێت، کە لە زۆربەی نەریتە مارکسیستییەکان بە دیاردەیەکی لاوەکی سەیر دەکرێت؛ بابەتێک کە هەڵەی شیکاری و ستراتیژی فراوانی لە بزوتنەوە کۆمۆنیستییەکاندا دروست کردووە. ئەم ئایدیایە دەتوانێت شی بکاتەوە کە بۆچی سەرمایەداری وەک سیستمێکی جیهانی لە یەکەی بچوکتری ئاسان بۆ بەڕیوەبەردن، کارایی زیاتری هەیە و ڕێکخستنیشی بە گوڕترە. لەبەرئەمەشە کە سەرباری لۆجیکی جیهانییانەی سەرمایە،

ئـێمە لەگەڵ جیهانێکـدا مـامەڵە دەکەیـن کە زیـاد لە دووسـەد وڵاتـی سەربەخۆی تێدایە. لەڕاستیدا باسێکی فراوانیش لە نێوان مارکسیستەکانی پەیوەندی نێودەوڵەتی لە ئارادایە کە بۆچی سەرباری لۆجیکی جیهانیی سەرمایە، یەکەیەکی جوگرافی جیهانی دروست نەبووە. مەگەر لۆجیکی سەرمایە، بەوجۆرەی کە مارکس لە گرۆندریسەدا دەیڵێت: وا ناخوازێت کە کات بەسەر شوێندا سەرکەوێت؟ چۆن پاش سێ سەدە سەرمایەداری، جیهان لە ڕووی جیۆپۆلیتیکەوە پارچەپارچەیە؟

ئەگەر باسـەکە کـورت بـکەمەوە، دژیەکـیەک لە نێـوان سـنووی نەتەوەیی و ڕەوتەکانی کەڵەکەی سەرمایە لە ئارادایە. ڕێک لەبەرئەمەشە کە ویـلایەتە یەکگرتووەکـان وەک گەورەتـرین وڵاتـی سـەرمایەداری لە سەرەتای سەدەی بیستەم، بە فەرمی بەرگری لە مافی بڕیاری چارەنووس دەکـات. ئەگەرچـی سـەرباری ئەمە، دروشـمی بەرگریـی مـافی چـارەی خۆنووسـین لە لایەن ئەمریکـاوە، بـۆ ئەم وڵاتە کە دەیویسـت هەژمـوونی ئیمپریالیستییانەی بەریتانیا کەم بکاتەوە، ڕۆڵێکی دیکەی هەبوو و ئەوەش ئەوە بـوو کە ڕێگەی خـۆش دەکـرد سـەرمایەی ئەمریکـی بچێتە نـاو ئەو شـوێنانەی کە سـەرمایەداری بـەریتانی لە ژێـر کـۆنترۆلی خۆیـدا بـوون. هەربـۆیە ئاناکرۆنیزمێـک کە لە پرسـیارەکەتاندا خـرایە ڕوو، ئەگەرچـی شایانی تێگەیشتنە، بەڵام قەیرانێکی جەوهەری نییە .

**بە ڕای ئێوە ئایا لە نێوان ناسیۆنالیزم بزوتنەوە نەتەوەییەکانی دەیەی شەست و حەفتا کە لە چوارچێوەیەکی دژە ئیمپریالیستی، دژە کۆنالیزم و هەڵبەت ئنیتەرناسیۆنالیزمدا کەناڵیزە دەبوون، جیاوازییەکی گرنگیـان نییە لەگەڵ ناسـیۆنالیزمی سـەردەمی ئێسـتا کە گوتـارێکی**

**هاوکات سەرمایەدارانە، شوناسگەرا و میلیتاریزەکراوی لەگەڵدایە. بە زۆری داهێنەری شتێکی نوێ نییە و زیاتر پشت بە ڕابردوو (ڕابردوییەکی دزراو) دەبەستێ و نمونەی دەرکەوتنە دیارەکەی دەتوانن لە شۆڕشی ڕەنگە جیاوازەکاندا ببینین؟**

سەرەتا دەبێ بڵێم لە بارەی ڕوانگەی دژە کۆلۆنیالیزمی بزوتنەوە نەتەوەییەکانی ڕابردوو، ڕوانگەیەکی هاوشێوەشمان لە کوردستان هەبووە. بۆ نموونە لە سەردەمێکی درێژ لە کوردستانی تورکیا چەمکێک کە کوردەکان و بە تایبەت پەکەکە بۆ ڕوونکردنەوەی دۆخی کوردستان سوودی لێ وەردەگرت، چەمکی "کۆلۆنیالیزمی ناوخۆیی (internal colonialism بوو. بەو مانایەی کە کوردستان کۆڵۆنییەکی ناو سنورەکانی تورکیایە. شوێنەواری کۆلۆنیالیزم تەنانەت لە کوردستانی ئێرانیش بەرچاوە، چ جای عێراق کە لەوێ ئەنفالیش ڕووی داوە. سەردەمی داگیرکاری خۆرئاوا ئەگەرچی کۆتایی هاتووە، بەڵام کرداری داگیرکاری تەنیا تایبەت نییە بە ڕۆژئاوا. وڵاتانی جیهانی سێیەمیش دەتوانن کردار و ڕەفتاری داگیرکارییان لە پەیوەندیدا بە بەشگەلێکی خۆیانەوە هەبێت. لە بارەی چوارچێوە و کەناڵیزەبوونی بزوتنەوە نەتەوەییەکان لەلایەن مارکسیزمەوە، باسێکی تیۆری دێتە ئاراوە کە ڕاستەوخۆ پەیوەندی بە سەربەخۆیی کوردستان و ئەم باسەوە نییە و دەرفەتی باسکردنیمان نییە، و ئەوەش ئەوەیە کە سۆسیالیزم چوارچێوەیەکی نەتەوەیی نییە.

ئەگەر بگەڕێینەوە بۆ مێژوو و جیاکاری بکەین لەو خەون و ویستانەی لە دووسەد ساڵی ڕابردوودا ڕووی داوە، دەبینین کە هەموو هەوڵ و خەباتەکانی ژێر ئاڵای مارکسیزم یان سۆسیالیزم هەمیشە

فۆرمێکی نەتەوەییان هەبوو و هیچکات لەم فۆرمەش لایان نەداوە. نموونەی بەناوبانگی ئەمەش ئەوەیە کە لینین ئەوکاتەی لە ڕۆژنامەدا خوێندییەوە کە سۆسیال دیموکراتەکان دەنگیان بە بودجەی جەنگی دەوڵەتی ئەلمانی قەیسەری داوە بۆ دەستپێکی جەنگی جیهانی، ڕۆژنامەکەی فڕێدا و وتی: پۆلیسی ئەڵمانیا ئەمەی ساختە کردووە، چۆن دەبێ سۆسیالیستەکان یارمەتی جەنگی نەتەوەیی وڵاتەکەیان بدەن؟ گەڕانەوە بۆ هەڵوێستی ئەمڕۆی هەندێ لە چەپە ئێرانییەکان بۆ بەرگری لە دەستێوەردانی ئێران لە سوریا و سەربەخۆیی ئێران بە هەر نرخێک، پەیرەوی لە لۆجیکێکی هاوشێوە دەکات.

ڕاستییەکە ئەوەیە کە فرەجۆربوونی جیۆپۆلۆتیکی جیهان بابەتێکی وەک دەڵێن ڕێکەوت و زووتێپەڕ contingent نییە. بەشێکی زەڕوورییە لە بوونناسی جیهانی واقیع. دابەشکردنی جیهان بۆ یەکەی جۆراوجۆر، بابەتێکە کە  مارکسیزم نزیکەی دوو سەدەیە نەیتوانیوە بە شێوەی واقیعی مامەڵەی لەگەڵ بکات. لەڕاستیشدا باسی گەشەسەندنی ناهاوسەنگ و تێکەڵ کە ئاماژەمان پێکرد، تاکە بەشی ناو مارکسیزمە کە بابەتەکە بە جیدی وەردەگرێت و دەیسەلمێنێت کە هەمیشە و هاوکات زیاد لە یەکەیەکی کۆمەڵایەتی و کۆمەڵگای جۆراوجۆر بە قەوارەی سیاسی لەیەک جوداوە، دینامیزمێکی تایبەت لە مێژوودا دروست دەکەن کە لە دینامیزمی کار و سەرمایەدا کورت نابێتەوە. ئەم مەسەلەیەش لە ئامادەکردنی تیۆرێکی چەمکەکان و لە ئامادەکاری سیاسی ستراتیژیشدا هەمیشە دەبێ لەبەر چاو بگرین.

ئەگەر پرۆژەی سۆسیالیزم لە وڵاتی ستالین بەسەر پرۆژی سۆسیالیستی  نێودەوڵەتی ترۆتسکیدا سەرکەوت، تەنیا بەهۆی

زەبروزەنگی ستالینەوە نەبوو، بەڵکو بونیادێکی واقیعی لە ئارادا بوو؛ سەرکردە سەرەکییەکانی مارکسیستەکانی ڕووسیا، ترۆتسکی و پاش ئەویش لینین، پێیانوابوو کە شۆڕش لە ڕووسیا دەبێتە هۆی شۆڕش لە وڵاتانی گەشەسەندووی پیشەسازی بە تایبەت لە ئەڵمانیا و پرۆلیتاریای بە هێزی ئەڵمانیا دەگاتە فریای پرۆلیتاریای دواکەوتووی ڕووسیا بۆ ئەوەی سۆسیالیزم، تاوەکو سۆسیالیزم کە بە پێی پێناسەکەی ڕێکخستنێکی پێشکەوتوترە لە سەرمایەداری دابمەزرێنن. بەڵام شۆڕش ڕووی نەدا و لە دوو ئەگەریش زیاتر لە بەردەست نەبوو؛ سپاردنی خۆویستانەی دەسەڵات بە بۆرژوازی ڕووسیا تا کاری گەشەسەندنی سەرمایەداری بگەیەنێتە دوا مەبەستی لۆجیکی خۆی و زەمینەی سۆسیالیزم فەراهەم بکات. یان قومار لەسەر داهاتوو و چاوەڕێکردنی هەلومەرجی گونجاوی جیهانی و هەوڵ بۆ دروستکردنی سۆسیالیزم لە وڵاتێکدا. بیرۆکراتی سۆڤیەت کە لە چەند ساڵێکی پاش شۆڕش و جەنگی ناوخۆیی هاتبووە ئاراوە، مەبەست و بەرژوەندەی خۆی لە پاراستنی دەسەڵاتی سیاسیدا دەبینی کە لەگەڵ ئایدیای "سوسیالیزم لە یەک وڵاتدا" یەکی نەدەگرتەوە. گۆشەگیری ئەوکاتی ترۆتسکی دەرهاویشتەی ئەو واقیعە سەرەکییە بوو، ڕەگی ئەم پرسە و بونیادی ئەم مشتومڕەش، دابەشکردنی سیاسی جیهان بۆ کۆمەڵگای جۆراوجۆر و جیاوازە کە لە تیۆریای کۆمەڵایەتی مارکسدا لە بەرچاو نەگیراوە. مارکس پێی وابوو کە سەرمایە سنورەکان لە ناو دەبات و ململانێی کۆمەڵایەتی دەبێتە ململانێی سەرەکی دینامیکی مێژوو، لە کاتێکدا ئەزموون سەلماندوویەتی کە دینامیزمی سیاسی جیهان ناکرێ تەنیا لە ململانێی کار و سەرمایەدا ببینینەوە. ئەم بەرکەوتنە بەهێزە هەمیشە لە تێکەڵکردن و یەکتربڕین

کۆمەڵێک دژیەکی دیکەش بەرەو پێشەوە دەچێت کە تەنانەت لە هەندێ بارودۆخدا پێش ململانێی کار و سەرمایەش دەکەون. ئەگەر نمونەیەکی دیکەش بهێنمەوە، جەنگی جیهانی یەکەم ناکرێ بە شیکاری مارکسیستی شی بکەینەوە، چونکە ئەڵمانیا هیچ ڕکابەرییەکی توندی داگیرکارییانەی لەگەڵ بەریتانیا و ئەمریکادا نەبوو کە بەهۆیەوە جەنگ بەرپا بکات.

**بەپێی ئەم قسانە و بەلەبەرچاوگرتنی جەختکردنی ئێوە لەسەر دەرکەوتنی نەتەوەییانەی سۆسیالیزم، ڕەنگە ئێوە بەرگری لە لێگزیت Lexit – Left wingBrexit بریگزیتی چەپ، بکەن؟**

من زۆرباش لەوە تێدەگەم کە بۆچی بەشێک لە چەپەکانی لە شوێنێکی وەک بریتانیا ڕەنگە هاوکۆک بن لەگەڵ چوونەدەرەوەی بریتانیا لە یەکێتی ئەورووپا. زۆر سەختە کەسێکی چەپ چارەنووسی کارەساتی یۆنان کە لە ژێر دەسەڵاتی یەکێتی ئەورووپا و بە تایبەتی ئەڵمانیا گەیشتۆتە ئەم ئاستە، ببینێت و مەیلی ئەوەی نەبێت کە ئەم یەکێتییە کە دامەزراوەیەکی وێرانکەری سەرمایەداری و سیاسەتی نیۆلیبراڵە، جیا بێتەوە. من خۆم دەنگم بە بریگزیت نەدا، بەڵام زۆر هاوسۆزم لەگەڵ ئەم پرسە. بەڵگەی لایەنگرانی بریگزیتی چەپ، تەنیا بۆ باشترکردن هەلومەرجی کرێکارانی بەریتانیا نییە، بەڵکو لەبەرئەوەشە کە بچوکبوونەوەی یەکێتی ئەورووپا ڕەنگە دینامیزمەکانی جێگیرەوەیەک بڕەخسێنێت کە دژی پرۆژەی نیۆلیبرالیزم بوەستێت. ئەگەرچی بە سەیرکردنی هاوسەنگی هێزی چەپ و ڕاست لە ئەورووپا، من زۆر بەم ئاسۆیە گەشبین نیم.

## سەربەخۆیی نەتەوەیی و پرسی دەوڵەت

ئاماژەتان بە گرنگی دەوڵەتی نەتەوەیی وەک گرەنتییەک بۆ دەستکەوتنی ماف و پاراستنی نێودەوڵەتی کرد، لەبارەی مافی "خەڵکی بێ دەوڵەت" لە ژێر ناونیشانی پرسی نەتەوەی جوو، مشتومڕی زۆر کراوە و بە زۆری لە دەوری ئەم پرسیارەدا بووە کە ئایا دروستکردنی دەوڵەتی نەتەوەیی و بە دیاریکراوییش وڵاتی ئیسرایيل دەتوانێ ڕێگەچارەیەکی بونیادی بۆ مەسەلەی جوو و لە ڕاستیدا کێشەی خەڵکانی بێ دەوڵەت بێت یان نا، وەڵامی زۆر لە بیرمەندان لە ئارێنت-ەوە تا ئاگامبێن نەخێر بووە؛ دەوڵەت و بونیادی "لەناکاو"ی دەسەڵات (دەسەڵاتێک بەرمەبنای ساختە و سڕینەوەی هەڵاوێردی جوو، کورد، تورکمان و .... کار دەکات و بەردەوام دەبێت) نەک وەڵام بەڵکو خودی پرسەکەشە. لەبەرئەمەشە کە ئەمڕۆ زۆرێک لە ڕۆشنبیران و تیۆریستە فەلەستینییەکان، لەبری بیرۆکەی دانانی دەوڵەتێکی نەتەوەیی، ئەمڕۆ بەرگریکار و بانگەشەکاری ئەڵتەرناتیڤی پۆست ناسیۆنال و دامەزراندنی دەوڵەتێک دیموکرات و سیکۆلارن بە ئامادەیی عەرەب و جووەکان (هەڵبەت بە مەرجی گەڕانەوەی هەموو ئاوارەکان). لە ڕووی بونیادی و پشتبەستوو بەم باسانە، ئایا دەوڵەت دەتوانێ کێشەی کوردەکان لەم ناوچەیە چارەسەر بکات؟

کێشەی ئیسرایيل و فەلەستین پرسێکی جیاوازە. لێرەدا دەستوپەنجە لەگەڵ داگیرکاری کۆچبەرەکان settler colonislism دەکەین؛ ئەمە لەگەڵ کێشەی کوردستان جیاوازییەکی جەوهەری هەیە. جگە لەوەش ئەگەر بە هەڵەدا نەچووبم هانا ئارێنتیش، دواجار دژایەتی دەوڵەتی

نەدەکرد؛ ئارنت تەنانەت پێی وابوو کە دەوڵەت لە بنەڕەتەوە هەلومەرجی ماف بۆ هاوڵاتیان دابین دەکات.

لەبارەی ئەڵتەرناتیڤی "یەک نەتەوە"ش باسەکە هەر بەم جۆرەیە؛ ئەگەر بڵێین "کۆنفیدرالیزمی دیموکراسی" پرۆژەیەکی دژە دەوڵەتییە، ئاستێک لە هەڵەی تیۆری و مێژوویی تێدایە. گریمان پرۆژەی کۆنفیدرالیزمی دیموکراسی، نەک تەنیا لە سوریا و عێراق ، لە هەموو ناوچەکەش بێتە دی، تا ئەوکاتەی کە جوگرافیا سیاسییەکەی هەموو جیهان نەگرێتەوە، لە شوێنێک سنورەکانی کۆتایی دێت و دەگاتە بەردەم یەکەی سیاسی و دەوڵەتی تر کە لە پەیوەندیدا پێیانەوە بە ناچاری وەک دەوڵەت مامەڵە دەکات. وەک چۆن ئێستاش فیدراسیۆنی دیمواتیکی باکوری سوریا (ڕۆژئاوا) لە پەیوەندیدا لە دەوڵەتی ناوەندی و دەوڵەتەکانی دەوروبەر و جیهان وەکو دەوڵەتێکی سەربەخۆ هەڵسوکەوت دەکات. واتە هەمیشە "دەرەوە"یەک بۆ پرۆژەی "نادەوڵەت" هەبوو و لە پەیوەندیدا دەرەوەیەوە، ئەم پرۆژەیە جیاواز لە ناوەڕۆکەکەی فۆرم و ڕەفتاری دەوڵەت وەردەگرێت. تەنانەت ئەگەر خۆشی ئەم دەرکەوتنە خۆی ڕەت بکاتەوە، بەرامبەرەکەی لە دەرەوە وەک دەوڵەتێک مامەڵەی دەکات. ئەمە بۆ هەمان پرسی سەرەتایی دەگەڕێتەوە کە جیهان لە ڕووی سیاسی و کلتووری و گەشەسەندنەوە، فرە جۆرە و ئێمە هیچ سیستمێکی سیاسیمان نەبووە لە مێژوودا هەموو جیهان بگرێتەوە. لە ڕاستیدا ئێمە هەمیشە دەوڵەتەکانمان هەبووە نەک دەوڵەت؛ بە مانایەکی تر، دەوڵەت چەمکێک پەیوەندیگەرایە و پێویستی بە دەستڕاگەیشتنە بەوی دی. لەم پرۆسەیەی ڕاگەیشتنەشدا، ناوەڕۆکی ناوەکی ڕێکخستنێکی کۆمەڵایەتی

پەیوەندییەکی وەهای بە فۆرم و بیچمەکەیەوە نییە و دەبێ لە نێوانیاندا جیاکاری بکەین .

به گشتی، دەسەڵاتی نەتەوەیی ڕووخسارێکی ڕوو لە ناوەوەی هەیە و ڕوخسارێکیش بەرەو دەرەوە. لەبارەی کوردستانی عێراقەوە، باسەکەی مـن پەیوەسـتە بە دەرەوە و پەیوەنـدی نێـودەوڵەتی. بێگومـان لە کوردستانێکی سەربەخۆ ئەگەر سوکانی دەسەڵات بە دەست بارزانی و کەسانی هاوشێوەی ئەوەوە بێت، هەلومەرج و پەیوەندی دەروونی چینە کۆمەڵایەتییەکان و کەمینەکان بەراورد بە کوردستانێک کە دەسەڵات لای پەکەکە بێت، زۆر جیاواز دەبێت. لە ڕوانگەی دەرەکیی و نێودەوڵەتیەوە بەڵام جیاوازییەکی جەوهەری نابێـت. سـتەمکارترین و دیموکراسـیترین دەوڵەتانی جیهان، جیاواز لە دۆخی ناوخۆییا، هەردووکیان لە ڕووی ڕوخساری دەرەوە، دەوڵەتن.

**بەم پێیە، ئایا پرۆژەی کۆنفیدرالیزمی دیموکراسی، لە کۆتاییدا دەبێ ئەڵتەرناتیڤی دەسەڵاتی نەتەوەیی پرۆژەی هەرێمی کوردستان هەڵبژێرێت، یان ئەم پرۆژەیەش لە ژێر ئایدیای دەسەڵاتی نەتەوەیی مانا وەردەگرێت؟ لە ئایدیای کۆنفیدرالیزمی دیموکراسی، وادیارە، لانیکەم لەسەر کاغەز، دیاریکردنی مافی چارەنووس، پێویستی بە جیابوونەوە و سەربەخۆیی پێویستی بە دەوڵەتسازییە. بە ڕای ئێوە جیاوازی گرنگی نێوان ئەم پرۆژەیە لەگەڵ ناسیۆنالیزمی هەرێمی کوردستان چییە؟**

جیاوازی سەرەکی لە شێوازی ڕێکخستنی کۆمەڵایەتی ناو ئەو یەکە سیاسیەدایە کە لە دەرەوە واباوە پێی بوترێت دەوڵەت. کۆنفیدرالیزمی

دیموکراسی، ناسێنەری ئایدیایەکە لە ڕێکخستنی کۆمەڵایەتی کە تیایدا ڕوانگە و نیگایەکی جیاوازی سەبارەت بە چەند مەسەلەیەکی وەک جێندەر، وەبەرهێنانی ئابووری و ژینگە هەیە. بێگومان لەبەر ئەم بەرکەوتنە جیاوازنەش لەگەڵ ئەم پرسانەدا، پەیوەندی ئەم یەکە سیاسییە لەگەڵ داپلۆسینی سەرمایەداری نیۆلیبراڵ فۆرمێکی تر وەردەگرێت. بەڵام تا ئێستاش بونیادێکی دەسەڵاتی سیاسی هەر لە کۆمەڵگادا دەمێنێت، بونیادێک ئەگەرچی ناچڕ و پەرتەوازە لە دیمەشق یان بەغدا بەڵکو بە شێوەی بەربڵاو و فرەلایەن و لەسەر بنەمای کۆمۆنەکان. لە هەمان کاتدا، هەر ئەم ڕێکخستنە کە دەسەڵات تیایدا بە شێوەی پێشکەوتنخواز و ڕادیکاڵ ڕێکخراوە، لە کاتی بەرکەوتن لەگەڵ جیهانی دەرەوە، دەبێ و ناچاریشە بە شێوەی یەکگرتوو، ڕێکخراو ڕەفتار بکات. لە ئاکامدا، لێرەشدا دەبێ جیاوازی نێوان دوو ڕەهەندی ناوەکی و دەرەکی دەوڵەت وەک دیاردەیەکی مێژوویی لەبەر چاو بگرین.

**ریفراندۆم جۆشوخرۆشێکی زۆری خستۆتە ناو خەڵکی کوردستانەوە، لەبەرامبەردا ئارستەی دژ، بۆ نموونە ئێران بە شێوەی جۆراوجۆر هەوڵ دەدەن خەڵک بەرەو هێمنی و دوورکەوتنەوە لە ریفراندۆم هان بدەن. لەکاتێکدا خۆیان وەها مامەڵەیەک ناکەن؛ ئەوان خەڵکی لە لێکەوتەکانی ئەم خواستە سیاسییەیان، بە دیاریکراوی لە جەنگ و خوێنڕێژی دەترسێنن، وەک ئەوەی پێشتر ناوچەکە هیچ جۆرە جەنگ و ئاژاوەیەکی تێدا نەبێت. وتەبێژانی ئەم گوتارە لە ئێراندا بە زۆری ئەوانەن بە بیرهێنانەوەی بەهاری عەرەبی و بزوتنەوەی سەوزی ئێران، هەموو جۆرە هەوڵێک بۆ گۆڕانکاری لە ناوچەکە بە**

**ترسناک دەدەنە قەڵەم. ئەم هەژموونەی گوتاری ترس لە کوێوە دێت و بە گشتی ڕای ئێوە، ترس تا کوێ دەتوانێ بنەمای بڕیاری سیاسی بێت؟**

قۆناغەکانی قەیران و گواستنەوە، وەکچۆن مارکسیش لە ئاستێکی تردا باسی دەکات، هەمیشە پڕ لە ئازار، شڵەژان و لەرزین بووە. ئەمڕۆش ئێمە لە ئاستی جیهانیدا، (ئاوابوونی دەسەڵاتی ئەمریکی و ڕۆیشتن بەرەو جیهانێکی چەند جەمسەری) و هەم لە ئاستی ناوچەییش (پێناسەکردنەوەی ڕێکخستنی سیاسی لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست) لە قۆناغێکی وەهادا دەژین. لەم قۆناغەی گواستنەوە و تەنگەژە و ململانێیەدا، بێگومان گەڕانەوە بۆ گوتاری ترس، کە هەمیشە بەشێک بووە لە سیاسەت، زیاتر دەبێت.

سەیر ئەوەشە کە پشتبەستن بەم گوتارە، زیاتر لەلایەن دەوڵەتە هەنوکەییە چەسپاوەکانەوە زیاترە. بۆ نموونە ئێران و تورکیان کە خەڵکی لە قیامەتێک دەترسێنن؛ لە بەرامبەردا، دەوڵەتی هەرێمی کوردستان هەوڵ دەدات پەنجە بخاتە سەر خاڵە گەش و باشەکانی داهاتوویەکی باشتر و خەڵکی لەبری هاندان بەرەو کردە و کردار بانگهێشت بکات. لە ئەورووپای ئەمڕۆش، زیاتر ڕەوتە ڕاستەکان و لایەنگرانی دۆخی چەسپاون کە گوتاری ترس بڵاو دەکەنەوە، لەبەرامبەردا، بۆ نموونە گوتاری سیاسی حیزبی کرێکارانی بریتانیا لە ژێر سەرکردایەتی سەرۆکە ڕادیکاڵە تازەکەی، جەخت لەسەر ئەگەرەکانی ژیانێکی باشتر دەکاتەوە.

ئێـوە لە چوارچێـوەیەکی یاسـایی و لە ڕوانـگەی نێـودەوڵەتییەوە باسەکەتان خستەڕوو و وەڵامتان دایەوە، دواتر دەگەڕێینەوە بۆ بابەتی "نەتەوە بێ دەوڵەتەکان"، بەڵام پرسیاری من پێشوەخت لەباری هاوسەنگی و پەیوەنـدی دەسـەڵات بـوو لە چوارچێـوەی سیاسـی و لە ڕوانـگەی نـاوخۆییەوە، مەبەسـتم ئەوەیە کە ئـاڵاهەڵگری خسـتنەگەڕی بیـرۆکەی ریفراندۆم و دەوڵەتی نەتەوەیی لە کوردستان کەسێکە کە زۆرێک خودی خۆی بە ڕێگر لەبەردەم دیموکراتیزەکردنی هەرێمی کوردستان دەزانـن. پرسیارم ئەوەیە؛ ئایا ریفراندۆم، وەڵامێکە بۆ خواستێکی مێژوویی خەڵکی کوردستان، یان تەنها بیانوویەکە بۆ بارزانی بۆ کڕینەوەی شـەرعیەت و هەڵهاتن لە بنەڕەتی کێشەکان؟

هەڵـبەت تێگەیشـتنی مـن لەم پرسـیارە ئەوە بـوو لەبەرئەوەی لە هەرێمـی کوردسـتان، گەنـدەڵی و دیکتـاتۆری هەیە و بـارزانی لە ڕوانـگەی ڕەوتی چەپەوە، ڕوخسارێکی کۆنپارێزە و شـایەنی بەرگری نییە، نـاتوانین بەرگـریش لە سـەربەخۆیی و دەوڵەتـی نەتەوەیـی کوردسـتان بکەیـن، لە وەڵامیشدا هەوڵم دا ڕوونی بکەمەوە کە بۆچی سـەرباری هەمـوو ئەمـانە، بیرۆکەی سـەربەخۆیی نەک تەنها ڕەت نـاکرێتەوە، بەڵکو لە درێژ مـاوەدا تەنانەت ناچاریشە.

سـەرەتا دەبێ ئەوە بزانین کە هاوسەنگی هێز لە هەرێمی کوردسـتان، لە سـەرەتاوە تـا ئەمـڕۆ لە بەرژەوەنـدی هێـزە دواکەوتووەکـان بـووە. لە دۆخێکی وەهادا، هێزە پێشکەوتنخواز و پێشـڕەوەکانی کوردسـتانی عێراق، کە کـێش و دەسـەڵاتێکی زۆریشـیان نیـیە، لەگەڵ پێـدراوێکی واقیعیـدا

دەستوپەنجە نەرم دەکەن؛ ریفراندۆم خراوەتە ڕوو و چاوەڕێ دەکرێت زۆرینە پشتگیری بکەن.

لە هەلومەرجێکی ئاوهادا، ستراتیژیەتی واقیعی هێزێکی پێشکەوتنخواز و چەپ، نابێ و ناتوانێ ئەوە بێت کە لەبەردەم زریان دیوار بەرز بکاتەوە، بەڵکو لەبەردەم زریان دەبێ چارۆکە هەڵبدات. چەپ لە بنەڕەتەوە و بەڕای من زۆر بە دروستی، هەمیشە بەرگری لە مافی چارەی خۆنووسین کردووە. لە کوردستانی عێراق، لەبەر هۆکاری مێژوویی کە ئاماژەم پێدا، تەنانەت بابەتیبوونی سەربەخۆیی زیاترە. بە لەبەرچاوگرتنی ئەم بابەتە بنەڕەتییە و بابەتە مێژووییەکەش، لۆجیکی نییە چەپێک لەبەر نەخوازرابوونی کورت مەودا، ئەم مافە لە گشتێتییەکەی بسەنێتەوە.

لەم لایەنەوە و بە کورتی؛ "بەڵێ بۆ مافی دیاریکردنی چارەنووس و سەربەخۆیی نەتەوەکان و نەخێر بۆ بارزانی و حکومەتی خێڵ و عەشیرەت و کۆنپارێزی" دەکرێ هەڵوێستێکی دروست بێت. ئەو هێزانەی کە بە ئاشکرا و بێ پەردە و بەبێ ژێرنووس و بەرچاوڕوونی، نەخێرێک پێشکەش بەم خواست و شەپۆلە سیاسییە دەکەن، لە پەراوێزدا دەمێننەوە. دەتوانین نموونەی زۆر و جۆراوجۆر بهێنینەوە. بەلشەفیکەکان یەکسەر دوای شۆڕشی ئۆکتۆبەر بۆ پاراستنی جوگرافیای سیاسی شۆڕشە تازە دامەزراوەکەیان، لە ڕووی جیۆپۆلۆتیکەوە چییان کرد؟ لینین، ترۆتسکی ڕەوانەی لیتۆفسک کرد و وتی: بۆ مسۆگەرکردنی ئاشتی لەگەڵ ئاڵمانیای ئیمپریالیست، هەتا ئەگەر ناچار بوویت تەنورەش لە پێ بکە." بۆ سەربەخۆیی کوردستانیش هەر ئەم لۆجیکە ئیش دەکات .

جگە لەوەش تەنیا لەبەرئەوەی بارزانی نوێنەری ناسیۆنالیزمێکی خێڵەکی دواکەوتووە، مانای وانییە سەربەخۆیی کوردستانی نەوێت. تەنانەت لە ئاستی دەروونناسیی تاکەکەسی و خێزانیشدا دەتوانین هەستی پێبکەین کە بارزانی دەیەوێت ناوی وەک کەسێک تۆمار بکرێت یەکەم دەوڵەتی کوردستانی لە مێژوودا دامەزراندووە. سەربەخۆیی، هاوکات، زۆرێک لە بیانووە بێ پاساوەکانی دۆخی خراپی ئابووری خەڵکی کوردستانی عێراق لە دەوڵەتی داهاتووی کوردستان، لە حیزبی بارزانی دەسەنێتەوە. چەند بیانوییەکی وەک ئەوەی بودجەکەمان لە بەغداوە بڕدراوە و مەجالی سیاسەتکردنی تەواوەتیمان نییە و ...هتد. تەنانەت ئەگەر ریفراندۆم تاکتیکی بارزانی بۆ چارەسەرکردنی کێشەی شەرعیەتی خۆی بێت، دییسان ناتوانین بڵێین کە تاکتیکێکی دیاریکراو لە لایەن بکەرێکی دیاریکراو و لە زەمینەیەکی دیاریکراو، هەمیشە بە ویستی ئەو کەسە دەڕوات. لە دۆخێکی پرگۆڕانکاری وەک کوردستانی عێراق، دەرەنجام و لێکەوتەکانی ئەم بیرۆکەیە بێگومان لە ئەنجام و لێکەوتە ویستراوەکانی فراوانتر دەبێت و یەکێک لە دەرکەوتە نەویستراوەکانی لە ماوەناوەند و درێژماوەدا ڕەنگە بەهێزتربوونی ڕەوتی ڕادیکاڵ و پێشکەوتنخوازی ناو بزاڤی کورد و لاوازبوونی ڕەوتە دواکەوتووەکەی بارزانی بێت .

## سەرکردایەتی کورد لە دەولەتداری پەشیمان بوویتەوە

دوای ئەوەی ئەنجامی ریفراندۆم جارڕدرا و لە ٩٢%ی دەنگی بەلێ بوو ، سەرۆکی هەرێم وتارێکی لاوازی پیشکەش کرد داوای دانوستانی لە عێراق کرد (لەکاتێکا ریفراندۆم کۆتایی دانوستانە نەک سەرەتا)، دەبوایە جاڕی جیابوونەوەی بدابایە وەک لە ریفراندۆمە سەرکەوتوەکان بۆ دەولەتداری ئەوە هەنگاوی یەکەمە ، سەرۆک وەزیرانیش وتی ئەوە بۆ دەولەت و جیاکردنەوەی سنور نیە ، گومانیکی زۆر لێرەوە دروست دەبێت کە ئەو ریفراندۆمە بۆ دەوڵەتی کوردستانی نەبێت ، چونکە دەلێن مەرج نیە یەکسەر دەولەت ڕابگەیەنین ، نمونەو بیانۆ دەهێننەوە و دەلێن: نێوانی ریفراندۆم و دەولەت دوو تا سێ ساڵی پێویستە ، ئەوەی زیاتر ئەو گومانە خەست تردەکاتەوە هێشتا شەڕ لەسەر پۆستەکانی بەغدا دەکرێت و هیچ حزبێک جورئەتی ئەوە ناکات فراکسیۆنەکەی خۆی بکشێنێتەوە لەبەغدا ، لە راستیدا ئەوە(خەت رەجعەیە ) ، ڕاستە لەهەندێ ولات دەولەت جاڕدان وا تاخیر بوە بەهۆی هەلگیرسانی جەنگ ، بەلام ئامارەی پێش دەولەت دروست کردن هەیە ، لە ڕاستیدا هەنگاوەکانی پیش جاڕدانی دەوڵەت بریتیە لە:

ا- ئەو رۆژەی بە بەلێ سەرکەوتوو دەبێت عادەتەن سەرۆکەکە لەگەل سەرکردایەتی وولات بە تەنیشت یەکەوە جاڕی ئەو سەرکەوتنە دەدەن و بڕیاڕی جیابوونەوە یەکسەر دەدەن ، واتە جارێکی تر پێویستت بەبەغدا نامێنیت و پەرلەمان و وەزیر و سەرۆک کۆمار دەکشێننەوە.

ب- چەند رۆژێک دوای ئەوە سنورو سیادەی ئەو ولاتە جار دەدرێت.

ت- دوای ماوەیەکی کەمی تر جاڕی سەربەخۆ دەدرێت.

پ- ئەو ٣ هەنگاوەی سەروو جیایە لەگەل دەوڵەت ، هیچ بیانۆیەک نیە ئەوانە نەکرێت ، ئینجا نۆرەی بینای دام ودەزگای دەوڵەت دەکرێ کە لەهەندێ شوێن ماوەی جیاجیای خایاندوە.

## دەقی کورتە تویژینەوەکە

لە کوردستان بێمتمانەییەکی زۆر لە نێوان دەسەلات و میلەت پەیدا بووە ، بەشێکی زۆر پێیان وایە خودی ئەو ریفراندۆمەش ئەبدەیتێکە بۆ تەکاندان بەو بارودۆخە نالە بارە نەک بۆ دەولەت، بەتایبەتی کە لێدوانی ناکۆک دەدرێ لەبارەی ئامانجەکانی ریفراندۆم ، یەکێک لەهەرە لێدوانە گوماناویەکانی بەرپرسان ئەوەیە دەڵێن ئەو ریفراندۆمە یەکسەر بۆ دەولەت نیە، باسی سەربەخۆیی و جیابونەوەش ناکەن ، دەلێن چەندین سالی تر دانوستان ئینجا ڕەنگە بگەینە ئەنجامێک .. ئەو بۆچونە سەرلەبەری چەوتە ، ناکرێ میللەت بەیاسا بخەیە ریفراندۆم و هەموو میللەت داوای سەربەخۆیی بکەن ئینجا ئەو داوایە بخەیتە گفتوگۆ و سازش و دانوستان و بۆ کەمتر لەوەی میلەت داوای کردووە ، لەهیچ شوێنێکی جیهان ئەوە نەکراوە، چونکە ئەوجۆرە ڕێفراندۆمە ئیلزامیە ( Mandatory referendum)نەک(Optional referendum)، هەردەم گفتوگۆ و سازش و دانوستان پێش ریفراندۆمە، کە گەیشتە ریفراندۆم دەبێت ریز لە ڕای میللەت بگیرێ، پێویستە ئەگەر دەولەتیش ڕانەگەیەنێ ئەوا یەکسەر سەربەخۆیی ڕابگەیەنێ و جیابیەوە، هەموو ریفراندۆمەکان یەکسەر سەربەخۆیی راگەیەنرایە، بەڵام هەندێکیان بوون بە دەوڵەتیان دوا دەکەوت بەهۆی هەلگیرسانی شەڕ، ئەوانە نمونەکانن:

١- جەزائیر بەپێی ڕێککەوتنی ئیڤیان لە نێوان فرنسا و بەرەی ڕزگاری جەزائر لە ١٩٦٢/٠٣/١٩ بڕیاری ڕاپرسی درا، لە یۆلیۆی ١٩٦٢ ڕاپرسی ئەنجامدرا. لە ٩٩.٧% دەنگی بە بەڵێ دا، لە هەمان مانگ سەربەخۆیی ڕاگەیاندرا.

٢- ئەریتریا لە ١٩٩١/٥/٢٥ ڕژێمی مانگستۆ تێک ڕووخا ودەسەلاتیکی نوێ دامەزرا، لەژێر چاودێری نەتەوە یەکگرتووەکان و کۆمکاری عەرەبی و (منظمة الوحدة الافريقية) ڕێکەوتن کرا لە نێوان (الجبهه الشعبيه لتحرير ارتريا ) و حکومەتی نوێی ئەسیۆبیا لەسالی ١٩٩١، ریفراندۆم لە مانگی ٤/ ١٩٩٣ ئەنجام درا. بە پێی ڕێکەوتنی ئەدیس ئەبابا ، ڕێژەی ٩٩.٨% دەنگی بە بەڵێ دا، هەر ئەو شەوە سەربەخۆیی ڕاگەیەنرا ، لە مانگی ١٩٩٣/٥ سەربەخۆیی و دەوڵەتیان ڕاگەیاند ، واتە یەکسەر سەربەخۆیی و جیابونەوە بوو ، یەک مانگ نێوانی دەوڵەت و ریفراندۆم بووە.

٣- خوارووی سودان: کۆنگریسی ئەمریکا لەسالی ١٩٤٤وە پالپشتی خۆی بۆ مافی چارەنوسی خوارووی سودان دابوو ، بەپێی ڕێککەوتنی ئاشتی نیڤاشیا (٢٠٠٣-٢٠٠٥) بڕیاری ژ: ١٥٩٠ مادده ٤ لەنەتەوە یەکگرتوەکان دەرچوو بۆ ریفراندۆمی خوارووی سودان ، بوە بنچینەی ڕێکەوتنی نێوان حکومەتی سوودان و حەرەکەی شەعبی(مۆرکرا لە نێوان جۆن گەرەنگ و عەلی عوسمان تەها لە ١/٩ /٢٠٠٥ ) لە ژێر چاودێری (الهيئه الدوليه للتنميه Intergovernmental Authority on – Development)و (إيگادIGAD ) مجموعه من الدول المانحه) ، بڕگەی (ڕوها) لە بەندی (٣) پرۆتۆکۆلی (مشاکۆس ٢٠٠٢ز) تیایدا ریفراندۆم لە ٢٠٠١/٠١/٠٩ بکرێت ، ئینجا لە ماددەی (٢٢٥)ی دەستوری سودانیش ئەو ڕیکەوتنە تۆمارکرا، لەکاتی خۆی ئەنجام درا، ڕێژەی دەنگی بەڵێ ٩٨%

بوو، یەکسەر جیابوونەوەو سەربەخۆییان ڕاگەیاند ئینجا سیادە، لە ٢٠١١/٩/٠٩ دەوڵەتیان راگەیاند.

٤- تەیمووری رۆژهەلات: پاش ریککەوتن لە نێوان ئەندەنووسیا و پورتوگال و ئەمریکا بەسەرپەرشتی نەتەوە یەکگرتووەکان(بە پێی بریاری ژ:١٢٤٦) ریکەوتنی نێوان تەیموربەسەرۆکایەتی (جۆسماو) و ئەندۆنیسیا سالی ١٩٩٩ کرا، سەرۆکی ئەندەنوسیا بڕیاری ڕاپرسی دا، جۆری پرسیارەکەش ئەوەبوو (ئۆتۆنۆمی یان سەربەخۆیی) لە ١٩٩٩/٨/٣٠ ریفرادۆمەکە کرا، لە ٧٨.٥% دەنگی بە جیابوونەوە دا، یەکسەر سەربەخۆییان ڕاگەیاند ، بووە شەڕ دوای هاتنی هێزی دەولی (قوه حفظ السلام) نێردەی نەتەوە یەکگرتوەکان (سیرجیو دی میللۆ) وەک حاکمی کاتی دەستبەکار بوولە دیسێمبەری ١٩٩٩ تا ئایاری ٢٠٠٢، لەمانگی ١٠/ ١٩٩٩ پەرلەمانی ئەندۆنیسیا ئەنجامی ریفراندۆمەکەی قەبوول کرد، ئینجا دەوڵەتیان راگەیاند. لە ٢٧/مایۆ/٢٠٠٢ بووە ئەندام لە نەتەوە یەکگرتووەکان.

٥- کۆسۆڤۆ لە تەموزی ١٩٩٠ راپرسی ئەنجام درا، بەیەکلایەنی (واتە بیرەزامەندی سربیا)ریفراندۆم کراو جاڕی جیابوونەوەیان دا لە سربیا ، بەلام جاڕی دەوڵەتی نەدا ، لە ١٩٩٢ سەرۆکیان هەڵبژارد بەلام کۆمەڵگای نێودەوڵەتی دانی پێدا نەنا. لە ١٩٩٨ شەر دروست بوو، کۆمەڵگای نێودەوڵەتی تەدەخولی کرد، بەپێی بڕیاری ئەنجوومەنی ئاسایش (١٢٤٤) رۆژی ١٩٩٩/٢/١٧لەژێر سەرپەرشتی دەولی(مجموعه المراقبه الدولیه) مایەوە، هاشم تانجی سەرۆکی کۆسۆڤا رۆژێک پێش هەلبژاردن وتی رۆژی دوای هەلبژاردن بە (بەلێ)یەکسەر سەربەخۆیی ڕادەگەیەنین ، لە ٢٠٠٨/٢/١٧ پەرلەمانی کۆسۆڤا سەربەخۆیی راگەیاند، ئەو کاتە دەولەتیان

ڕاگەیاند کە سربیا کەوتە ژێر بەندی (٧)ی میساقی نەتەوە یەکگرتوەکان، هاوپەیمانـــان پشـــتیان گـــرت و ریفرانـــدۆمە یەکلایەنـــیەکە بەو هـــۆیە سەرکەوتوو بوو، سربیا قایل نەبوو دۆسیەکە چووە لای دادگای لاهای ناچار ئەو پشتیوانیە دەولیە تەنها توانی لە دادگای لاهای (محکمە العدل الدولیە) لە ٢٠١٠/٧/٢٢ یەکلا بکرێتەوە، بەو شێوەیەی خوارەوە بوو:

بەپێـی بڕیـاڕی ( الجمعـیە العـامە – د:٦٤ بنـد:٧٧ ٨ سـبتمبر٢٠١٠) دۆسیەی کۆسۆڤاچوە دادگای لاهای ئەوەش دەقی وەلامی دادگایە اعلن هیساشی اوادا رئیس محکمە العدل الدولیە فی قصـر السـلام فی لاهای إن المحکمە "خلصت إلى رن " إعلان الاستقلال فی ١٧ شباط/فبرایر ٢٠٠٨ لـم ینتهـک القـانون الـدولی العـام") ، لە ١٠/ سـبتمبر/٢٠١٢ (مجمـوعە المـراقبە الـدولیە)کۆتاییان بەکارەکـانی خۆیـان هێنـا و بەومانـایەی سـەربەخۆیی و سـیادەی کۆسـۆڤا تەواو بـوو ،بەلام تـا ئەو سـاتەش نەبـۆتە ئەنـدام لە نەتەوەیەکگرتوەکان بەهۆی ئەو هەڵوێستەی سربیا.

٤- سـەحرای غەربـی و فـەلسـتین و تـایوان و ... کێشـەی (سـەحرای غەربـی)زۆر تـایبەتە چـونکە شـێوەیەکە لە مـافی چـارەنوس و مـافی جیـابوونەوە، لەژێـر دەسـتی ئیسـپانیا بـوو، لەسـالی ١٩٧٦ جـاڕی سەربەخۆیی داوە بەلام یەکلایەنە سەرکەوتوو نەبوو زۆر ئالۆزتری کرد ، مەغریـب و مۆریتانیـاش داوایـان دەکـردەوە، بەرەی پۆلیسـاریۆش داوای سەربەخۆیی دەکرد ،ئەو دۆسیەیە چووە دادگای لاهـای، ئەویش وەلامـی بەوە دایەوە کە شـمولی بڕیـاڕی ١٥١٤ دەکـات (واتە سـەربەخۆیی) مـادام (شـعب)ە لەدۆسـیەی نەتەوەیەکگرتوەکـان، ئیسـپانیا ڕێـکەوت لەگەل پۆلیساریۆ لە سالی ١٩٧٥ کەبەناوی ڕێکەوتنی مەدرید ناوزەند دەکرێت، کشـایەوە، بەپێـی بڕیـاری ١٥١٤ نەتەوە یەکگرتوەکـان ڕێـی ڕیفرانـدۆمی

پێداوە ، دوای ئەوەی زیاتر لە ٧٠ ولاتیش دانیان پێدا هێنا ئینجا شای مەغریبیش هاتە ڕایی ،بەلام هەروا مەغریب کێشەی بۆ دروست دەکا نەکراوە.

سەحرای غەربی بریاری نێودەولەتی بۆ دەرچووە بۆ ریفراندۆم بەلام کە دەولەت بوونیان مسۆگەر نیە نایکەن.. تایوان تا ئەو ساتە ١٥ جار داوای بە ئەندام بوونی کردووە رەزامەندی بۆ نەکراوە، کاتی خۆشی ئەو ئەندام بوو نەک چین، فەلەستین لە ١٥ی سپتمبری ١٩٨٨ەوە جاری دەولەتی داوە کەچی تا ئێستا هەر جارِدانە. هەر بۆزانینیش لەمادەی ٦٤ی سیڤەر ڕەهەندی ریفرۆندامی تێدا بوو ، بەلام بە ئاڕستەیەکی تر بردرا.

ئەزمونی کۆمەلێک ولاتی تر: ئەوانە کۆمەلێک ئەزمونن ماوەی نێوان ریفراندۆم و دەولەت بوون پیشان دەدا ، ئەگەرچی ماوەیەکی هەیە نێوانی دەولەت بوون و ریفراندۆم بەلام نێوانی ریفراندۆم و جیابوونەوەو سەربەخۆیی و بەرپاری سیادە زۆر دەماو دەستە لەگەل ریفراندۆم، ئەوەی کاتێکی زیاتری ویستوە بەرپای دەولەتە نەک سەربەخۆیی، نمونەکان:

**ولاتی ئیستۆنیا**

رۆژی ئەنجامدانی ریفراندۆم ٣ / ٣ / ١٩٩١ رۆژی ئەندام بوون لە نەتەوەیەکگرتوەکان ١٧ / ٩ / ١٩٩١.

رۆژی راگەیاندنی سەربەخۆیی ٩ / ١٩٩١ ماوەی نێوان ریفراندۆم و ئەندام بون لە نەتەوەیەکگرتوەکان شەش مانگ.

**ولاتی لاتیڤیا**

رۆژی ئەنجامدانی ریفراندۆم ٣ / ٣ / ١٩٩١ رۆژی ئەندام بوون لە نەتەوەیەکگرتوەکان ١٧ / ٩ / ١٩٩١.

ڕۆژی ڕاگەیاندنی سەربەخۆیی ٩ / ١٩٩١ ماوەی نێوان ڕیفراندۆم و ئەندام بوون لە نەتەوەیەکگرتوەکان شەش مانگ.

**وڵاتی کرواتیا**

ڕۆژی ئەنجامدانی ڕیفراندۆم ١٩ / ٥ / ١٩٩١ ڕۆژی ئەندام بون لە نەتەوەیەکگرتوەکان ٢٢ / ٥ / ١٩٩١.

ڕۆژی ڕاگەیاندنی سەربەخۆیی ٦/٢٥ / ١٩٩١ ماوەی نێوان ڕیفراندۆم و ئەندام بون لە نەتەوەیەکگرتوەکان ساڵێک.

**سلۆڤینیا**

ڕۆژی ئەنجامدانی ڕیفراندۆم ٢٣ / ١٢ / ١٩٩٠ ڕۆژی ئەندام بون لە نەتەوەیەکگرتوەکان ٢٢ / ٥ / ١٩٩٢ ڕۆژی ڕاگەیاندنی سەربەخۆیی ٢٥/ ٦ / ١٩٩١ ماوەی نێوان ڕیفراندۆم و ئەندام بون لە نەتەوەیەکگرتوەکان ساڵێک و پێنج مانگ.

**ماڵتا**

ڕۆژی ئەنجامدانی ڕیفراندۆم بۆ دەستوری نوێ ٢-٤ / ٥ / ١٩٦٤ ڕۆژی ئەندام بون لە نەتەوەیەکگرتوەکان ١ / ١٢ / ١٩٦٤ ڕۆژی ڕاگەیاندنی سەربەخۆیی ٩/٢١ / ١٩٩١ ماوەی نێوان ڕیفراندۆم و ئەندام بون لە نەتەوەیەکگرتوەکان شەش مانگ.

**مۆنتینیگرۆ**

ڕۆژی ئەنجامدانی ڕیفراندۆم ٢١ / ٥ / ٢٠٠٦ ڕۆژی ئەندام بون لە نەتەوەیەکگرتوەکان ٢٨ / ٦ / ٢٠٠٦.

ڕۆژی ڕاگەیاندنی سەربەخۆیی ٣/ ٦ / ١٩٩١ ماوەی نێوان ڕیفراندۆم و ئەندام بون لە نەتەوەیەکگرتوەکان مانگێک و هەفتەیەک.

**ليتوانيا**

رۆژی ئەنجامـدانی ریفرانـدۆم ٨ / ٢ / ١٩٩١ رۆژی ئەنـدام بـون لە نەتەوەیەکگرتوەکان ١٧ / ٩ / ١٩٩١

رۆژی راگەیانـــدنی ســـەربەخۆیی ٦/ ٩ / ١٩٩١ مـــاوەی نێـــوان ریفراندۆم و ئەندام بون لە نەتەوەیەکگرتوەکان حەوت مانگ هەفتەیەک.

**ئەرمینیا**

رۆژی ئەنجامدانی ریفراندۆم ٢١ / ٩ / ١٩٩١ رۆژی ئەندام بـوون لە نەتەوەیەکگرتوەکان ٢ / ٣ / ١٩٩٢

رۆژی راگەیانـــدنی ســـەربەخۆیی ٩/٢١ / ١٩٩٠ مـــاوەی نێـــوان ریفراندۆم و ئەندام بوون لە نەتەوەیەکگرتوەکان ٥ مانگ

**ئازربایجان**

رۆژی ئەنجامـدانی ریفرانـدۆم ١٠ / ١٢ / ١٩٩١ رۆژی ئەنـدام بـوون لە نەتەوەیەکگرتوەکان ٢ / ٣ / ١٩٩١.

رۆژی راگەیانـــدنی ســـەربەخۆیی ١٠/١٨ / ١٩٩١ مـــاوەی نێـــوان ریفراندۆم و ئەندام بون لە نەتەوەیەکگرتوەکان دوو مانگ.

**تورکمانستان**

رۆژی ئەنجامدانی ریفراندۆم ٢٦ / ١٠ / ١٩٩١ رۆژی ئەنـدام بـون لە نەتەوەیەکگرتوەکان ٢ / ٣ / ١٩٩٢.

رۆژی راگەیانـــدنی ســـەربەخۆیی ٨ / ١٩٩٠ و رۆژی پەســـەندکردنی ١٩٩١/١٠/٢٧ ماوەی نێوان ریفراندۆم و ئەندام بون لە نەتەوەیەکگرتوەکان ٤ مانگ.

ئۆزباکستان

رۆژی ئەنجامدانی ریفراندۆم ٢٩ / ١٢ / ١٩٩١ رۆژی ئەندام بوون لە نەتەوەیەکگرتوەکان ٢ / ٣ / ١٩٩٢.

رۆژی راگەیاندنی سەربەخۆیی ٣١ /٨ / ١٩٩١ ماوەی نێوان ریفراندۆم و ئەندام بوون لە نەتەوەیەکگرتوەکان ٢ مانگ.

**لەو ئەزمونانەی سەروو بۆمان دەردەکەوێت: بەشێک لەو دەرەنجامانەمان لە تویژینەوەکەی رابووردوو باس کرد، ئەوەش بەشێکی ترە کە هەرە گرنگەکەیان خالی (٣)ی خوارەوەیە:**

١. ریفراندۆمی سەربەخۆیی کارتی فشارو کارتی دانوستان و هیچ جۆرە کارتێک نیە جگە لە سەربەخۆیی و دەولەت بوون.

٢. ریفراندۆم کۆتایی دانوستان و مفاوەزاتە نەک سەرەتا، هەم بۆ دەسەلاتی کوردی ناشرینە سەودا لەسەر ریفراندۆم بکا هەم بەغداش ئامادە نابێت دانوستان بکات لەدوای ریفراندۆم – بەتایبەتی دوای دەرچوونی بڕیاری دادگای فیدرالی ، ئەو وەلامانەی پیش ریفراندۆم دەیدات دوای ریفراندۆم نایدات.

**هەنگاوە یاسایی و سیاسیەکانی دوای ریفراندۆمی کوردستان**

تا ئیستا بە ڕوونی لای سەرکردایەتی کورد هەنگاوەکانی دوای ریفراندۆم دیاری نەکراوەو نازانرێ چ دەکرێ ، لێدوانی جیاجیا هەیە، (ریفراندۆم بۆ سەربەخۆیی – ریفراندۆم بۆ کۆنفیدرالّی – ریفراندۆم وەک کارتی دانوستان — ریفراندۆم تا بزانین ئەو میللەتە چی دەوێت — ریفراندۆمی سەپاندنی ئەمری واقع ( دیفاکتۆ) –...) لەهەرە دوایش وەفدێک چووە بەغدا باس لە خواستەکانی هەرێم کرابوو لەگەل بەغدا هەتا پرسی شایستە مادیەکان و ١٢ ملیار هاتە ناو ئەو باسە، واتە نازانرێ

دوای تەواو بوونی ریفراندۆم چی لێدەکەن ، لەوەش مەترسیدار تر هێشتا وەک پرۆژەو نەخشە ریگەش دانەڕژاوە تا گفتوگۆی زانستی لە سەر بکەین.

## ریفراندۆم.. شکست، پەراوێزخستن، گۆشەگیریی

تا رۆژێک پێش ئەنجامدانی ریفراندۆم لەلایەن مەسعود بارزانی و هاوئاوازەکانیانەوە، بە دەیان باڵیۆز و وەزیر و سەرۆکی وڵات و بەرپرسانی باڵای وڵاتانی جیهان لەگەڵ هەرێمدا لەسەر خەت بون، دواترینیان پێشنیازەکەی وەزیری ئەمەریکا بو بۆ هەرێم، بەڵام پشتگوێخستنی بۆچون و پێشنیاری وڵاتانی دۆست لەلایەن بارزانی و هاوئاوازەکانیانەوە، هەرێمی کوردستانی خستە تەنگەژە و پەراوێزخستنێکەوە کە رۆژ لە دوای رۆژ پاشەکشە لە هەڵوێستەکانی دەکات و بەدوای دەرچەیەکدا دەگەڕێت بۆ ئەوەی لەسەر بنەمای دەستور گفتوگۆ لەگەڵ بەغدا بکاتەوە.

## پێش (٢٥)ی ئەیلول چی رویدا؟

رۆژی (٧)ی حوزەیرانی ئەمساڵ، بارزانی بە ئامادەبونی ژمارەیەک لە حیزب و لایەنەکان، جگە لە بزوتنەوەی گۆڕان و کۆمەڵی ئیسلامی بڕیاریاندا رۆژی (٢٥)ی ئەیلول وەکو رۆژی ئەنجامدانی ریفراندۆم دیاری بکرێت.

هەر لە سەرەتاوە بزوتنەوەی گۆڕان و کۆمەڵی ئیسلامی بەشدارییان لەو لیژنە حیزبییەدا نەکرد کە دەستنیشان کرابوو بۆ سەرپەرشتیکردنی ریفراندۆم و جەختیان لەوە دەکردەوە کە دەبێت

دامەزراوە شەرعییەکان ئەو ئەرکە لە ئەستۆ بگرن، نەک حیزب و لایەنە سیاسییەکان.

دواتر ئەو ئەنجومەنە بڕیاریدا کە شاندێک بۆ گفتوگۆکردن دەربارەی ئەنجامدانی ریفراندۆم رەوانەی وڵاتانی ئەورووپا و ئەمەریکا و وڵاتانی دراوسێ و بەغدا بکات، بەڵام هەر لە دەستپێکی سەردانەکەیاندا بە سەرۆکایەتی بارزانی لە رۆژی (١٠)ی مانگی تەمموزدا سەردانی برۆکسلی کرد، بەڵام وەفدەکە بە شکستێکی گەورەوە گەڕانەوە و نەیانتوانی هیچ پشتیوانییەک بە دەست بهێنن.

بزوتنەوەی گۆڕان هەمیشە لە کۆبونەوە و بەیاننامەکانیدا جەختی دەکردەوە لەسەر ئەوەی، راگەیاندنو دامەزراندنی دەوڵەتی سەربەخۆی کوردستان ئامانجی هەموو خەڵکی کوردستانو بزوتنەوەی گۆڕانە و ریفراندۆم ئامرازێکە پێش راگەیاندنی سەربەخۆیی ئەنجام دەدرێ. بەڵام ریفراندۆمی (٢٥)ی ئەیلول لە دەرەوەی زەمینەسازی یاساییو هەلومەرجی لەباری سیاسیو ئابوریو ئەمنیو کۆمەڵایەتی دراوە و پێویستە ئەو پرسە بۆ کاتو هەلومەرجێکی لەبار دوابخرێو بخرێتەوە بەردەم پەرلەمانی کوردستان.

هەروەها شکستی پەیوەندییە دیپلۆماسییەکان یەکێکی دیکەبوو لەو هۆکارانەی ئێستا هەرێمی کوردستانی پەراوێز خستوە، چونکە رۆژانە چەندین وەفدی باڵای وڵاتانی دەرەوە سەردانی هەرێمی کوردستانیان دەکرد و جەختیان دەکردەوە لەوەی کاتی ئەنجامدانی ریفراندۆم گونجاو نیە.

تەنانەت چەند رۆژێک پێش ئەنجامدانی ریفراندۆم، نوێنەری تایبەتی سەرۆکی ئەمەریکا بۆ هاوپەیمانی نێودەوڵەتی دژ بە داعش کە

نــــوێنەرایەتی (٧٠) وڵاتـــــی جیهـــــان دەکــــات، لەگەڵ نــــوێنەری نەتەوە یەکگرتوەکان و ئەڵمانیا و ئەمەریکا، سەردانی مەسعود بارزانیان کرد و پێشنیازی بەدیلێکیان کرد بۆ دواخستنی ریفراندۆم کە تێیدا بەشێکی زۆر لە خواست و داواکارییەکانی کوردی تێدابوو، بەڵام بارزانی ئەو بەدیلەی رەتکردەوە و سوربو لەسەر ئەنجامدانی ریفراندۆم و سەرجەم هۆشداری و هەڕەشەکانی وڵاتانی دراوسێ و جیهانی پشتگوێ خست.

تەنانەت بەهۆی بڕیاری ریفراندۆمەوە، سەرکردایەتی سیاسی کورد زۆرێک لە دۆستەکانی دوێنێی هەرێمیان کرد بە دوژمن و بە شێوازی جیاجیا هەڕەشەیان لە هەرێمی کوردستان دەکرد.

## مانگێک لە دوای ئەنجامدانی ریفراندۆمەوە

رۆژێک دوای ئەنجامدانی ریفراندۆم و بەپێچەوانەی وتەکانی کاتی بانگەشـە، کە جەختیـان لـەسـەربەخۆیی هەرێمـی کوردسـتان دەکـردەوە، بەرپرسانی باڵای هەرێم داوای گفتوگۆیان لەگەڵ بەغدا دەکرد و باسیان لەوە دەکرد، ریفراندۆمەکە بۆ سەپاندنی ئەمری واقیع و دیاریکردنی سنور و سەربەخۆیی نەبووە.

لەکاردانەوەی ریفراندۆمەکەشدا بەغدا و ئێران و تورکیا دەستیان کـرد بە گەمـارۆدانی هەرێمـی کوردسـتان، ئەوەش لەرێـگەی داخسـتنی سنوری وشکانی و ئاسمانی بەڕووی هەرێمی کوردستاندا.

لەدوای ریفرانـدۆم هەرێمـی کوردسـتان لەڕوی نێـودەوڵەتییەوە پەراوێزخرا، بەجۆرێک پێش ریفراندۆم کەم کات هەبوو بەرپرسێکی باڵای وڵاتانی ئەوروپا و ئەمەریکا کە سەردانی بەغدای دەکرد، دواتر سەردانی هەولێری نەکردایە، بەڵام لەدوای ریفراندۆمەوە هەرێم توشی جۆرێک لە گۆشەگیری کرا.

لە کۆبونەوەیەکی "مێژووییدا" نیوەی خاکی هەرێم لەدەستدرا رۆژی (١٥)ی ئۆکتـۆبەر، یەکێتـی نیشـتیمانی کوردسـتان و پـارتی دیمـوکراتی کوردستان لە هاوینە هەواری دوکان کۆبونەوە، مەلا بەختیار، لێپرسراوی دەستەی کارگێڕی مەکتەبی سیاسی یەکێتی نیشتیمانی کوردستان دوای کۆبـونەوەکە لەکـۆنگرەیەکی رۆژنامەوانیـدا وتـی" کۆبـونەوەیەکی مێژووییمان کرد"، بەڵام (٤٨) سەعات بەسەر ئەو کۆبونەوە "مێژوویية"دا تێنەپەڕی، کاتێـک سـوپای عێـراق بە مەبەسـتی گـرتنەوەی بەشـێک لە شوێنەکانی خۆی کە پێش هاتنی داعش بەدەستییەوە بوو، هێرشی کردە سەر کەرکوک و دوزخورماتوو، کە بەهۆیەوە بەشێکی زۆر لە هێزەکانی

پێشـــمەرگە پاشەکشـــەیان کـرد و تەواوی کەرکـوک و دوزخورمـــاتوو و چەندین ناوچەی دیکە چۆڵکران و بە هەزاران کەسیش ئاوارەبون.

پاشـــان لە ناوچەکـــانی دیـــکەی مەخمـــور و شـــەنگال و رەبـــیعەش هێزەکانی پێشمەرگە پاشەکشەیان کرد و بەو جۆرە نیوەی خاکی هەرێمی کوردسـتان لەدەسـتدرا و هەرێـم گەڕایەوە بـۆ ئـەو شـوێنانەی کـە سـاڵی (٢٠٠٣) کـە بـە هێڵـی سـەوز ناسـراوە، بەبـێ ئەوەی وڵاتـانی دراوسـێ و ناوچەکە و جیهان هیچ هەڵوێستێکیان هەبێت، جگە لە پشتیوانی کردن لە عێـراق بـۆ جێگیرکـردن و سـەپاندنی دەسـەڵاتی فیـدراڵی خـۆی لە نـاوچە کوردستانییەکانی دەرەوەی هەرێم.

## بارزانی بایکۆت کراوە

هاوکـــات لە چەنـــد رۆژی رابـــردودا، ریکـــس تیلەرســـۆن، وەزیـــری دەرەوەی ئەمەریکـــا بەســـەردانێکی چـــاوەڕوان نەکـــراو گەیشـــتە بەغـــدای پایتەخت و لەگەڵ سەرۆک وەزیران و سـەرۆک کۆمـاری عێراق کۆبووەوە، بەڵام ئەوەی چـــاوەڕوانکرابو، پـــێچەوانەی جارەکـــانی پێشـــوو، وەزیـــری دەرەوەی ئەمەریکـــا ســـەردانی هەرێمـــی کوردســـتانی نەکـــرد، کە پێدەچێت یەکەم بەرپرسی باڵا نەبێت کە بۆ لەمەودوا سەردانی بەغدا بکات و دواتر راستەوخۆ بگەڕێتەوە و ئامادە نەبێت بێتە هەولێر.

بەپـــێ زۆربەی ســـــــەرچاوەکانی هەواڵ، لەدوای بەڕێوەچـــــوونی ریفرانـدۆمەوە وڵاتـانی دراوسـێ و ئەورووپـا و ئەمەریکـا و تـاران و بەغـدا بایکۆتی هەرێمی کوردستان و بەدیاریکراویش مەسعود بارزانیان کردوە، تەنانەت رۆژی سێشەممە رۆژنامەی شەرقولئەوستی چاپی لەندەن بڵاوی کـــــردەوە، کە حەیـــــدەر عەبـــــادی ســـــەرۆک وەزیرانـــــی عیـــــراق ، دەستپێشخەرییەکی پاشای ئوردنی رەتکردوەتەوە، ئامادەنەبووە چاوی بە

مەسعود بارزانی بکەوێت، لەکاتێکدا عەبادی لەدوای ریفراندۆمەوە سەردانی سعودیە و میسر و ئوردن و تورکیای کردووە و بەمنزیکانە دەچێتە تارانیش.

توندکردنەوەی فشارەکانی سەر هەرێم وایکرد، کە حکومەتی هەرێمی کوردستان درەنگانێکی شەوی چوارشەممە بەیاننامەیەک دەربکات و تێیدا سڕکردنی ئەنجامدانی ریفراندۆم رابگەیەنێت و هەروەها دوای دەستکردنەوە بەگفتوگۆ دەکات لەگەڵ بەغدا.

## کارتی بەهێزی ریفرامدۆم سوتێنرا

بەرای چاودێرانی سیاسی، کارتی ریفراندۆم و دەوڵەتی کوردی، بەبێ ئەوەی هیچ زەمینەسازییەکی ناوخۆیی دەرەکی و ئابوری و ئەمنی بۆ بکرێت، بۆ دەیان ساڵی دیکە پرسی دەوڵەتی کوردستانی بردەوە دواوە، هەربۆیە بەپێویستی دەزانن ئەو سەرکردایەتییە سیاسییەی کە بارزانی سەرکردایەتی دەکردن و ئەوانی دیکەش پشتیوانیان دەکرد، دەستبەجێ دەستلەکاربکێشنەوە.

تەنانەت بینالی یەڵدرم، سەرۆک وەزیرانی تورکیا لەسەر سڕکردنی ئەنجامی ریفراندۆمی هەرێم ڕووی دەمی کردە بەرپرسانی کوردستان و وتی: مادام دەگەیشتنە ئەو ئەنجامە، بۆچی سوربون لەسەرکردنی ئەو هەڵەیە؟.

چارەسەرکردنی شکستەکانی هەرێم دور لەئەقڵو لۆجیک بەرپرسانو حوکمڕانانی کوردستان لەدوای ئەو هەمو شکستو نەهامەتیەی بەسەر خەڵکی کوردستاندا هێناویانە، هەرگیز بیریان لەوە نەکردۆتەوە پێداچونەوە بەسیاسەتی شکسخواردویاندا بکەنەوە، هەرگیز بەلای ئەوەدا نەچون هۆکارەکانی شکستو فەشەلی سیاسیو حکومڕانیان

لەناوخۆدا، لەگەڵ شارەزایانو پسپۆراندا چ هی ناوخۆو چ هی دەرەوە، ئەوانەی دور لەبەرژەوەندی کەسی خۆیان ئامادەی هاوکارین بۆ چارەسەری کێشەکان، شرۆڤە بکەنو دەست بخەنە سەر خاڵەکان، ئەوانەی بونەتە هۆی ئەو هەموو شکستە یەک لەدوا یەکانەی هەر لەشکستی حکومرانیاندا لە ٢٦ ساڵی رابردودا، لەشەڕی ناوخۆدا، لەوێرانکردنی سەرخانو ژێرخانی هەرێمدا، لەتالانکردنو بەهەدەردانی سامانی سەرزەمینو ژێرزەمینی کوردستاندا، لەپێشێلکردنی ئازادیو ئیهانەکردنی کەرامەتی هاوڵاتیاندا، لەسەرکوتکردنو تیرۆرکردنی چەندین دەنگو قەلەمی ئازاددا، لەهەژارکردنی زۆرینەی زۆری خەڵکو خۆدەوڵەمەندکردنی لەرادە بەدەری خۆیاندا، لەبڕینی موچەی فەرمانبەرو خاوەن پێداویستی تایبەتداو لەدوا شکستی کەمەر شکێنی مێژوویی خەباتی رزگاریشدا کە بەسەر هەرێمو خەڵکەکەیدا هێناویانە، ئەویش لەدەستدانی نیوە زیاتری خاکی کوردستان بو دەرئەنجامی ریفراندۆمە بێ بەرنامەو بێ پلانو پڕغرورو حساب نەکردووەکەیان بۆ هیچ هێزێکی ناوچەییو جیهانی.

لەبەرامبەر ئەو هەموو شکستەدا ، بۆ تەنها جارێک دانیان بە هەڵەی خۆیاندا نەناوە ، تەنها جارێک داوای لێبوردنیان لە خەڵک نەکردوە ، لەوپەڕی وێرانەیی نیشتیماندا ، خۆیان بە ئەندازیاری ئاوەدانی لەقەڵەم داوە ، لەوە پەڕی فەشەلی سیاسەتی حکومرانییاندا ، خۆیان بە سەرکەوتوو و سیاسەتی ئیدارەیان بە حەکیمانە لەقەلەم داوە ، لەناوخۆشدا لەبەرامبەر هەموو دەنگێکی نارازی و داواکاری ئازادی و ماف و خزمەتگوزاریدا ، لە بەرامبەر داوای چاکسازی و سەروەری

یاسادا، ئەوپەڕی توند و سەرکوتگەر بوون و هەمیشە مۆتەکەی شەڕی ناوخۆ چەکێکی ئامادەساز بووە بە دەستیانەوە.

لەدوای شکستەکانی پاش ریفراندۆم و داگیرکردنەوەی زیاتر لەنیوەی خاکی کوردستانی باشور لەلایەن سوپا و حەشدی شەعبییەوە، رەوشی ئێستای هەرێمی کوردستان لەوپەڕی لاوازی و بێهێزیدایە ، حکومەت و دەسەڵاتدارانی هەرێم ئامادەی جێبەجێکردنی سەرجەم داوا و فرمانەکانی حکومەتی ناوەندن . لە دوا پەیامیدا، سەرۆکی حکومەت ئامادەیی تەواوی دەربڕیوە بە پێدانی سەرجەم داهاتەکانی نەوت و گومرگی سنورەکان و ناوخۆ لەبەرامبەر دابینکردنی بودجە و موچەی فەرمانبەرانی هەرێم، لە بەغداش حکومەت لەوپەڕی غرور و لوتبەرزی و خۆبەسەرکەوتووزان، زۆر خەمساردانە وەلامی هەرێم دەداتەوە و مەرجی زیاتر دەسەپێنێت . لە کاتێکدا ساڵانێک لەمەوبەر ئەو غرور و لوتبەرزییە لە دەسەڵاتدارانی هەرێمدا بەدی دەکراو ئامادەی گفتوگۆ نەبوون، لەناوخۆدا دەنگێکی زۆر هەبوون کە باشترین رێگە بۆ دوورخستنەوەی هەرێمی کوردستان لە دارمانی ئابوری و نەمانی موچە و نەوەستانی پرۆسەی ئاوەدانی و کارگەکان و رێگری لە مۆتەکەی بێکاری و .... هتد رێکەوتنێکی هاوسەنگە لەگەڵ ناوەندا، دەرهێنانی هێلکەکانە لەناو سەبەتە تاریک و نادیارەکەی تورکیادا ، باشترین رێگە راگرتنی پەیوەندییەکی هاوسەنگە لەگەڵ ولاتانی دراوسێدا ، نەک خۆنیشاندان وەک مەئمورێکی ملکەچ بۆ لایەک و کردنی لایەکی تر بە دوژمنی وەهمی.

لەئێستاشدا، سەرباری ئەو هەموو شکستە سیاسی و سەربازی و ئابوری و مۆرالیانەی بەسەر هەرێم و خەڵکەکەیدا هێناویانە ، هێشتا لەسەر سیاسەتی هەڵەیان، هەڵە تا ڕادەی خۆکوژی و هەموانکوژی

بەردەوامــن و دەیانەوێــت بەرێــگەی هەڵە بە هەڵە ، فەشــەل بە فەشــەل چارەســەری کێشــەکانی هەرێـم بـکەن ، بەوەی هـێلکە پیسـبووەکانیان لەم ســەبەتەیەوە دەرکەن و بـیخەنە ســەبەتەیەکی تــاریکتر و پـر کارەســاتی دیکەوە.

بە پێی هەندێک سەرچاوەی نـاوخۆیی و دەرەکی، مەسعود بـارزانی، سەرۆکی پارتی دیموکراتی کوردستان ، لە نامەیەکیدا بۆ قاسم سـولەیمانی ، پەشیمانی خـۆی و حزبەکەی دەربڕیـوە بەوەی کە لە سـاڵانی رابـردوودا چۆتە نێو بازنەی سیاسـەتی ئەمریکی و لەدەرەوەی بـازنەی سیاسـەتەکانی ئێرانیـــدا بـــووە، لە نامەکەیـــدا خوازیـــاری باشـــبوونی پەیوەنـــدیەکانی هەردوولایە تــارادەی گەڕانەوە بــۆ پەیوەنــدییەکانی ســەردەمی زێڕینــی سـاڵانی حەفتاکـان و هەشـتاکانی سـەدەی رابـردوو . مەسـعود بـارزانی لە نامەکەیـدا بـۆ قاسـم سـولەیمانی ، کە بە سـیداد بـارزانی برایـدا رەوانەی کردوە بە مەبەستی دەربڕینی دڵتەنگی و پرسە بۆ کۆچی دوایـی " حـاجی حەســەن ســولەیمانی " بــاوکی قاســم ســولەیمانی، پەشــیمانی خــۆی لە ئەنجامـدانی راپرسـی و سیاسـەتی رابـردووی هەرێـم لە هەمبەر ئێـران و پاڵـدانە ئەمریکـا دەربڕیـوە و ئومێدی باشـبوونی پەیوەنـدییەکانی هەرێمـی لەگەڵ ئێرانـدا خواسـتووە ، بـۆ ئەم مەبەسـتەش خوازیـاری ئەوەیە ئاغـای ســولەیمانی لە ســۆنگەی بەرپرســیارێتی و پــێگەی خــۆیەوە بەو رۆڵە هەستێت. بەلای هەنـدێک لە چـاودێرانی سیاسـی، نـاردنی نـامەیەک بە وەهـا نـاوەڕۆکێکەوە چـاوەڕوان نەکـراو بـووە و مـایەی سەرسـوڕمانە، بەڵام بە لای زۆرێک لە چاودێران و بەتایبەتی چاودێرانی سیاسی ناوخۆ و میدیای نـاحزبی لە هەرێـم، کە شـارەزای سیاسـەت و کەسـێتی سـەرۆکی پـارتین ، نـاردنی وەهـا نـامەیەک کـارێکی ئاسـاییە ، لە رابـردوودا بـۆ دەربـازبوونی

خودی خۆی و بنەماڵەکەی و تا رادەیەکیش حزبەکەی لەو تەنگەژانەی تێی کەوتوون، بارزانی پەنای بۆ زۆر دەریچەی ترسناکتر لە ناوەڕۆکی ئەو نامەیە بردووە.

هەڵەی گەورەی دەسەڵاتدارانی ئەم هەرێمە، ئەوەیە هەرگیز دان بە هەڵەی خۆیاندا لەبەردەم هاوڵاتیانی خۆیاندا نانێن، هەرگیز گوێ بە رەخنە و خواستی ناوخۆ نادەن، هەرگیز بڕوایان بە هێزی ناوخۆیی نیە، تەنانەت بڕوایان بەو هەموو پێشمەرگە و هێزە چەکدارەش نیە کە لەسەر بنەمای حزبی نەک بنەمای نیشتیمانی ساز و ئامادەیان کردوون، خۆیان لە سەروو هەموو شتێکەوە دەبینن و نیشتیمان وا دەبینن کە بەبێ ئەوان نەگبەتییەکی بێناو و بێئایندەیە* . لەئێستاشدا لە هەنگاوێکی ترسناکدا بۆ خۆ دەرباز کردن لە تەنگەژە و شکستەکانیان ، چارەسەرکردنی هەڵەکانە بە هەڵەی گەورەتر، ئەویش گۆڕینی ئاراستەی هاوپەیمانی و پەیوەندی گوماناویە لە باکورەوە بەرەو رۆژهەلاتی هەرێم و پشتکردنە سیاسەتی ئەمریکا و هاوپەیمانەکانی. لە هەموو ئەو هاوکێشانەشدا عەقڵ و لۆجیک غائیبە. چونکە ئەوان وەک هەموو سەرۆکەکانی هاوشێوەی خۆیان، هەرگیز جگە لە دەنگی خۆیان گوێ بۆ هیچ دەنگێکی تر شال ناکەن.**

* لیبیا بە بێ من نەگبەتییەکی بێناو و بێئایندەیە . " لا ١٠٤"

**من ناتوانم بە باشی گوێ بۆ هیچ دەنگێک شل بکەم . هەرگیز جگە لە دەنگی خۆم گوێم بۆ هیچ دەنگێکی تر شل نەکردووە " لا ١٠٧ " .. موعەمەر قەزافی ئاوەها لەگەڵ خودی خۆیدا دەدوێت لە رۆمانی (دواهەمین شەوی سەرۆک . نوسینی یاسەمینە خەزرا . وەرگێرانی ئازاد بەرزنجی ).

کورد و خەنجەرە خۆکوژییەکەی نەبوونی گوتارێکی نەتەوەیی و نیشتمانی شادەمارو گرێ کوێرەی سەرجەم گرفتەکانی هەرێمی کوردستانە، ئەوەش بێگومان لە سەرەتای قۆناغی خەباتی رزگاری خوازی گەلی کوردەوە تادەگاتە ئەمڕۆمان گرتووتەوەو کۆمەڵێ گرفتی بەدوای خۆیدا پەلکێش کردووە، کەگرنگترین و دیارترینیان شەڕی ناوخۆ و براکوژییە کەلەشەستەکانەوە تا دەگاتە مەترسییەکانی دووبارە بوونەوەیان لە ئەمڕۆماندا رووبەڕومان بووەتەوە، ئەفسوس ئەوەش زیاتر بۆ قبوڵ نەکردنی رای جیاواز و نەبوونی دیموکراسی راستەقینە و پەیڕەو کردنی سیاسەتی حیزبی ژمارە (١) یەک و حیزبی براگەورە کەباڵی بەسەر کوردستاندا کێشاوە و سەرکردەو حیزبە دەسەڵاتدارەکانی کوردستان بەهەموو تواناییێکیانەوە لەسەرەتای سەرهەڵدانی بزافی رزگاری خوازی گەلی کوردەوە کاریان لەسەری کردووە، لەپاڵ نەبوونی گوتاری نەتەوەیی و نیشتمانی نەبوونی کاریزما و سەرکردەیەکی نەتەوەیی بەدەر لەسەرکردەی حیزبی کەهەموو نەتەوەی کوردی کوردستانی باشوور لەدەور خۆیدا کۆبکاتەوە هۆکارێکی تری سەرجەم کێشەو گرفتەکانی هەرێمی کوردستانە . سەرەڕای ئەوەش لەدوای راپەڕینی بەهاری (١٩٩١) وە تادەگاتە ئەوڕۆمان نەبوونی دەستوور لە هەرێمی کوردستاندا هۆکارێکی گرنگ و دیاری ترە لەو ناسەقامگیری و سەرجەم ئەو گرفت و تەنگەشە ناوخۆییانەی کە رووبەڕووی کوردو هەرێمی کوردستان بوونەتەوە، ئەوەش بەتەنها بەرژەوەندی تەسکی حیزبی و پەرستنی سەرکردەی تاک و هەتا هەتایی لە نیو حیزبە بالادەستەکانی کوردستان لەمپەڕە لەبەردەمیدا، بەداخەوە هەردوو حیزبە باڵادەستەکەی کوردستان لەماوەی پتر لەچارەکە سەدەیەک لە حوکمڕانی

خودی کوردی تەنها لە دیدو بەرژەوەندی حیزب و چەند کەسێکەوە وڵاتیان بەڕیوە بردووە و هەرگیز نەیانتوانیوە ئەو دیدە تەسکە بەجیبهێڵن و کار بۆ بەرژەوەندی باڵای نەتەوەیی بکەن. شەڕی ناوخۆو ئەزموونی تاڵی دوو ئیدارەیی لە هەرێمی کوردستاندا پەڵەیەکی رەشە لە مێژووی نوێ کوردستان و هەردوو حیزبە باڵادەستەکەی کە تائەم دەمەش مەترسی دووبارە بوونەوەیان لە هەرێمی کوردستاندا بوونی هەیە . سەرەڕای ئەوەش دەستی دەرەکی و بەرژەوەندی و لەپاڵیەوە دژایەتی کردنی هەژموونی خۆبەڕێوەبردنی کوردی لە هەرێمی کوردستاندا لەلایەن وڵاتە هاو سنوورییەکانی کوردستانی باشوور هەژموونی ئەم هەرێمەی لە هەڵوەشاندنەوەو لەباربردن نزێک کردۆتەوە ، لەو بوارەشدا دەستی ئێران لەناوچەکانی زۆنی سەوزو دەستی تورکیا لە ناوچەکانی زۆنی زەرد ئاشکراو حاشاهەڵنەگرە، سەرەڕای بەرژەوەندی و دژایەتیکردنی هاو سنوورییەکانمان، کە لەزۆر کاتدا یەکانگیردەبن لەگەڵ بەرژەوەندی خودی بەرپرسە پلەباڵاکانی کوردستان و حیزبە باڵادەستەکانیان بەمەبەستی دژایەتیکردنی رکەبەرەکانیان ، لەو پێناوەشدا هەریەک لەلایەنە دەسەڵاتدارەکەی کوردستان ئامادەییان تێدا هەیە بەمەبەستی سەپاندنی خۆی و دەسەڵاتەکەی پەلەکێشی هاوسنوورییەکەی خۆی بەمەبەستی وەدەرنانی لایەنەکەی تر بکات لەو بوارەشدا هەژموونی شەڕی ناوخۆ لە ساڵی ١٩٩٤ تا ٣١ / ٨ / ١٩٩٦ دیارترینیانە و بوونی هیزی سەربازی تورکیا لە ناوچەکانی زۆنی زەرد ئەوەمان بۆ ئەسەلمینی.

خەونی چەندین ساڵەی گەلی کورد لە بەدەستهێنانی ئازادی و سەربەخۆیی تەنها کوردستانی باشووری نەگرتووەتەوە و لەو بوارەشدا کوردستانی باکور و رۆژهەڵاتیش رۆڵ و خەباتی خۆیان لەپێناو

بەدەستهێنانی ئامانجە نەتەوەییەکانی خۆیان و خەونی گەورەو لەمێژەی کوردستانی گەورە و ئازاد و سەربەخۆدا هەبووە کە هەر چوارپارچە لەتکراوەکەی کوردستان بگریتەوە، لەو پێناوەشدا بەدرێژایی مێژووی خەباتی رزگاریخوازی گەلی کورد لە هەر چوارپارچەکەی کوردستان ، لەهەر پارچەیەکیان شۆڕش هەڵگیرسابی کوردانی پارچەکانی تر بەشدارییان لەو شۆڕشەدا کردووەو خوێنیان لە پێناویدا رژاندووە، زیندووترینیشان بەشدارێکردنی کوردانی کوردستانی باشوور لە کۆماری مهاباد و هەروەها بەشداریکردنی کوردانی هەر سێ پارچەکەی تر لەشۆڕشی ئەیلولە.

بەڵام بەداخەوە لەمرۆماندا و بەهۆی ئەوەی لەکوردستانی باشوردا و لەژێر چەتری حکومەتی هەرێمی کوردستاندا تائەم دەمە حیزبە باڵادەستەکان پەیرەوی سیاسەتی (حیزب القائد) ئەکەن و بەهەموو تواناییکیانەوە کار بۆ دەستێوەردان لە شۆڕشەکانی پارچەکانی تری کوردستان ئەکەن، بەڵام بەداخەوە وەک ئەو مافە بەخۆیان ئەدەن بەڵام بۆ حیزب و شۆڕشەکانی پارچەکانی تری کوردستان ئەو مافە هێڵی سوورە و تەنانەت مافی ئەوەشیان نیە کاری حیزبی لەکوردستانی باشووردا بکەن وەیا لایەنگریان لە نێو کوردانی کوردستانی باشووردا هەبێت، وەیا رای ئازاد لەسەر ئەزموونە تاڵەکەی ئەم هەرێمە کوردستانیە دەرببڕن، هەڵوێست وەرگرتن و دژایەتیکردنی شۆڕشی کوردستانی باکور و رۆژئاوا لەو ئاستەدا نەوەستا بەڵکو گەیشتە ئەو رادەیەی سنووری هەرێمی کوردستان بەرووی کوردانی رۆژئاوادا دابخەن و تەنانەت رێنەدەن بریندارەکانیان بەمەبەستی چارەسەر کردن بێننە ناو ئەم هەرێمە بەناو کوردستانیەوە.

ناکۆکی و دژایەتیکردنی سیاسی و سەربازی یەکتر لەلایەن هەردوو حیزبە باڵادەستەکەی کوردستانی باشوور تەنها لە سنووری هێڵی (٣٦)ی پانتایی گۆی زەویدا نەمایەوە . ئەوەبوو دوای روخاندنی رژێمی لە ناوچووی بەعس لەساڵی ٢٠٠٣ دا و بەهۆی ئەوەی ئەو دوو حیزبە هیچ رێکەوتن و گوتارێکی یەکگرتوویان لەمەڕ مامەڵەکردن لەگەڵ قۆناغی دوای سەدام و چارەسەرکردنی کێشەی کەرکوکدا نەبوو ، لەو کاتە هەستیارەدا دەبینین سەرجەم ناکۆکی و دژایەتیکردنی یەکتریان گواستەوە نێو شاری کەرکوکی بەناو (قودس و دڵی کوردستان) ، دەسپێکی ئەوەش لەوەدا بوو کە هەردوو حیزبەکە بە دوو پارێزگارەوە روویان لە شاری کەرکوک کرد ، وەک هەردەم بەمەبەستی چارەسەر کردنی ئەو گرفتە چەندین کۆبوونەوەیان ئەنجامدا بەڵام ئەمیشیان هیچ دەرئەنجامێکی نەبوو . یەکێکی تر لەو هەڵانەی کەسەرکردایەتی کورد لەشاری کەرکوکدا کردی ئەوە بوو لەسەرەتای ئازادکردنی شاری کەرکوک پێشنیاری ئەوەیان بۆ نەتەوەکانی تری کەرکوک کرد کە ئەنجوومەنێک لە (٢١) ئەندام بۆ پارێزگای کەرکوک پێک بێنن و تێدا نەتەوەکانی کوردو تورکمان و عەرەب هەریەکەیان (٦) کورسی و کلد و ئاشوریش ببنە خاوەن (٣) کورسیان لەو ئەنجوومەنەدا هەبێت، ئەو پێشنیارە پێچەوانەی مافە مێژوویی و جوگرافی و نەتەوەیی کورد لەم شارەدا بوو ، خۆشبەختانە ئەو دابەشکردنەی کورسییەکانی ئەنجوومەنی پاریزگای کەرکوک ماوەیەکی زۆری نەخایاند و لەسەر پێشنیارێکی (هێزە هاوپەیمانەکان) بڕیاری زیادکردنی کورسییەکانی ئەو ئەنجوومەنە درا ، ئەو پێشنیارەش زەمینەی خۆشکرد بۆ دەربازبوون لە کێشەی دەستنیشان کردنی پارێزگار بۆ شاری کەرکوک و بۆ یەکەمین جار هەردوو حیزبە باڵادەستەکەی کوردستان

ڕێککەوتـن لەسـەر دەسنیشـانکردنی بەڕێـز "عەبـدولڕەحمان مسـتەفا" بـۆ پاریزگـاری کەرکـوک و هەروەهـا لەڕێی ئەو پێشنیارەشـەوە کـورد تـوانی ڕێژەی کورسییەکانی خۆی لەو ئەنجوومەنەدا زیادبکات .

ئەوەنـدەی حیـزبە کوردسـتانیەکان بەگشـتی و هەردوو حیـزبە باڵادەستەکە شەڕ لەسەر پۆست و کورسی دەسەڵات و داهات لە هەرێمی کوردسـتان و بەغـدادا ئەکەن نیـوەی ئەوە لە سـاڵی ٢٠٠٣ وە شـەڕیان لەسەر گەڕانەوەی کەرکوک بۆ ئامێزی کوردستان بکردایە ئێستا بێگومان دەمی بوو ئەم شارە دێرینەی کوردستان گەڕابووەوە بۆ سەر هەرێمی کوردسـتان . بەداخەوە هەڵە کوشـندەکانی سـەرکردایەتی کـورد لە باشووری کوردستاندا هەموو پێوەرەکانی شکاند و گەیشتە ئەو ڕادەیەی لە بری کارکردن بۆ بەدستهێنانی ئازادی و مافی چارەی خۆنووسین ئەم جارەیان کار بۆ ئەوە بکەن چوار پارچە لەتکراوەکەی کوردستان بکەنە پێـنج پـارچە... نـازانین ڕۆژگـاریش چەنـد لەتبـوونی تـری لە جەسـتەی کوردستاندا بۆمان هەڵگرتووە!

## ریفراندۆم وەکو دوا کارتی بارزانی!

چوار ساڵی رابردوو بۆ بارزانی، پڕ بوو لە ئیحراجی گەورە و حەزی زۆری ئەو سەرکردەی کورد بۆ دەسەڵات، سەرجەم بەڵێنە بێ کردارەکانی بەرای گشتی خەڵک ناساند. ئەوەش ڕاستە پێشتریش نەیتوانیوە، نە بینای سیستەمێکی باش بۆ هەرێمی کوردستان دەستەبەر بکات و نە لەپەنا ئەو هەموو دەسەڵاتە رەهایە، شانازییەک بۆ یەکخستنی پێشمەرگە و رەواندنەوەی تەمی شەڕی ناوخۆ و ریفۆرم و چاکسازی و سزادانی تاوانباران و سەروەربوونی یاسا و دەیان پرسی گرنگی تر بە باڵای خۆی ببڕێت.

ڕێک بە پێچەوانەوە بارزانی بۆ خۆ سەپاندن بەسەر کورسییەکەیدا، مێژووی خۆی بەهەدەردا، کە پەکخستنی پەرلەمان و بڕینی مووچەی خەڵک بەناوی پاشەکەوت و متمانەنەمان بە یاسا، بەقەدر مێژووی رەشی شەری براکان، بووە خاڵی لاواز بۆ مێژووی دوای خۆی، کە هیچ پاساوێکی لۆژیکیان نەبووەو نییە.

تەنگاوبوونی سەرۆکی هەرێم و پەلەکردن بۆ هەنگاونان بۆ ریفراندۆم ، دەرخەری ئەو راستییانەیە کە بوونەتە ئیجراجی سیاسی بەرامبەر دۆستانی کورد لەدەرەوەی وڵات، کەچی بەشێکی زۆر لە حزبەکانی کوردستان، وەکو ئاگاداری ئەم واقعە نەبن، بێ هیچ مەرجێک، پەیمانی ریفراندۆمیان بۆ بارزانی واژۆ کرد. پەیمانێک کە گومانی تێدانییە، گەر بارزانی گرەنتی سەرۆکی هەتا هەتایی بۆ دەستەبەر نەکرێت، هەموو هەرێمی کوردستان دەخاتە ریسک و مجازەفەوە.

لە تاڵەبانییەوە تا نەوشیروان مستەفا و حزبە ئیسلامییەکان چەندان دەرفەتیان بە بارزانی بەخشی، بەو هیوایەی هەرێمی کوردستان رووەو

ئاراستەیەکی باشتر وەرچەرخێنێت، کەچی بارزانی، هەر وەکو سەرۆکی خێڵەکەی خۆی و سەرۆکی پارتی رەفتاری کرد، تا ئەو جێگایە هەرگیز نەتوانێ خۆی لە گرێ کوێرەی دووبەرەکی دەرباز بکات و وەکو دەوڵەتمەدارێک رەفتار بکات.

لە کاتی پەیمانی نێوانی "بارزانی و نەوشیروان مستەفا" بۆ چوار ساڵ ئارامی لە ٢٠١٣ دا، سێ جارو دوو دووبەدوو نەوشیروان بە بارزانی وتووە، با دامەزاوەکانی وڵات وەکو حزبەکان لێ نەکەین، با بۆ کورِو کەسە نزیکەکانی خۆمان و کەسانی شایستە جێیان بهێڵین، ئەگەرچی بارزانی ئەو بەلێنەی سێ جار بە نەوشیروان داوەو لەسەر ئەم بناغەش چوارساڵی ئارامی خراوەتە پرۆژەوە، کەچی سەرئەنجام لە حوزەیرانی ٢٠١٥، بارزانی جارێک فازڵ میرانی و جارێکیش نێچیرڤان بارزانی دەنێرێتە، لای نەوشیروان کە دووساڵ ماوەی سەرۆکایەتی هەرێم درێژ بکرێتەوە، ئەگەرچی ئەمە بێ بەڵێنی بارزانی بووە لە پێناو مانەوەی لە کوردسییەکەی. بەڵام نەوشیروان رەتی نەکردۆتەوەو وتویەتی ئالیەتێک بدۆزنەوەو لەرێگای پەرلەمان چارەسەری بکەن، کە دواتر لە جیاتی دۆزینەوەی میکانزم و ئالیەت، پەرلەمانی پەککست.!

لەو تەمەنە درەنگەدا، سەرەڕای دەیان دەلاقەی گەورە لەو بێ بەڵێنییەکەی بارزانی بەرامبەر خەڵکی کوردستان کردوونی و بەرپرسیارەتی مێژووی لەسەرشانە، دەستی بردووە بۆ کارتی ریفراندۆم بەو هیوایەی:

١- خۆیان گوتەنی وەکو کارتی فشار بەرامبەر بەغدا بەکاری بهێنن.

٢- بە ئەمریکی و کۆمەڵگای نێودەوڵەتی بڵێن کە خەڵک متمانەی بە بارزانی ماوەو لەگەڵیدان.

٣- وای وێنا بکات کە خەڵک ئاشتدەکاتەوەو شەرعیەت لە ئەوان وەردەگرێت.

٤- ئەو هەموو فشارە گەورەیەی خەڵک و نارازییەکان بۆ ماوەیەک کپ بکات.

٥- ئەو خۆسەپاندنە لەبیر خەڵک بباتەوە کە لە پەنایەوە پەرلەمان پەکخراو بەزۆر دەستیان گرت بەسەر مووچەو بژێوی خەڵکدا.

٦- هەر دەنگێک نارازی بە ئەجندای دەرەکی و بەتایبەت ئێران وێنا بکات، لەکاتێک ئاماژەکان ڕوونن کە چەندان سەبقەی نهێنی لەنێوان بارزانی و ئێران لە بوارەکانی سەربازی و ئەمنی و هەوڵگری هەن .

٧- ئەمانەو دەیان هۆکاری تر، کە هەموویان دەکەونە خزمەتی بارزانی و سەرئەنجامیش خەڵکی کوردستان هەروەک چۆن لە ٢٠٠٩ بە نزیکەی لە ٧٠٪ دەنگیان بەبارزانی دا، کەچی بارزانی نەک هیچی بۆ خەڵکی کوردستان نەکرد، بەڵکو لە ڕووداوێکی تەمومژاویدا پشتی لە ئێزیدییەکان کردو بۆ داعش بەجێهێشتن.

**ریفراندۆم، گەورەترین خیانەتە لە مێژووی سیاسیی کورددا!**

ریفراندۆم، مافێکی ئازادانەی هەر گەل و نەتەوەیەکە وەکو میکانیزم و پرۆسێسێکی دیمۆکراسیی بۆ بڕیاردان لەمافی چارەی خۆنووس Self determination، بە جیابوونەوە یان مانەوە لەناو یەک وڵاتدا، جێکەوت بکرێ. ئەم مافە دەبێ دەستووریی، قانونیی و مرۆیی بێت بۆ سەرجەم گەل و نەتەوە جۆراوجۆرەکان، تەنانەت بۆ سێکتە نەژادیی، دینیی و کولتوورییەکانیش، بەڵام دەبێ هەلومەرجی عەقڵانیی، واقیعیی، نێوخۆیی و نێودەوڵەتیی لەبەرچاو بگیرێن. بەتایبەتیش، ئەم ریفراندۆمە، گەمەیەکی موخابەراتیی تورکیا بوو، دواتر لۆبییە زایۆنییەکان، ئاراستەی

ریفڕاندۆمیان بەلاریدا برد و لە کۆنترۆڵی ئەردۆغانیان دەرکرد و لێرەوە تورکیاش، دەهریی بوو. هەزارانی وەکو ئێمە، بانگەوازی ئەوەمان دەکرد، ئەم ریفراندۆمە موجازەفەیەکی زۆر خراپە، دەبێ نەکرێ، چونکە کێشەی سیاسیی کورد بۆ دواوە دەگەڕێنێتەوە، کەس گوێی نەگرت و لە خیانەتی عوظما و مورتەزیقەیی خۆیان، بەردەوام بوون .

ئەگەر ریفراندۆم بۆ ئەو درۆ گەورانە بوو کە بانگەشەیان بۆ دەکرا، دەوڵەتی عێراق بودجەی بڕیبوو! دەستوری پێشێل کردبوو، مافە سیاسییەکانی گەلی کوردستانی پێشێل کردبوو!، دەوڵەتی کوردستان بەڕێوەیە، عێراق نەیدەهێشت نەوتی کوردستان بۆ خەڵکەکەی بێت، ئەوە بەس مەگەر فاشییە ئیخوانیی و سەلەفییەکان، نەژادپەرستە راسیستەکان بە تایبەت ئەوانەی فاشیزمی کوردایەتیی لاقەی مێنتالێتیی و بییرکردنەوەیانی کردبوو، لەگەڵ ئەو چەپە رەشۆکییانەی بەگەلوگوونی رووتەوە کەوتنە ناو زێرابەکانی ناسیۆنالیزمەوە، خۆیان گێل بکەن و هێشتا باوەڕیان بەو سەفسەطە نەتەوەییانە و بەو مەوادی موخەدیرەی کوردایەتیی هەبێت. بە پێچەوانەوە، ریفراندۆم بۆ مۆنۆپۆلکردنی بیزنسی نەوت بوو، بۆ ئەوە بوو کە پیاوێکی ناشەرعیی، ناقانونیی و نادەستوریی، وڕکی لە کورسیی دەسەڵات گرتبوو، خۆی و حیزبەکەی دەیانویست مۆنۆپۆلی تەواوی ئابووریی کوردستان بکەن بە شەراکەتیی لەگەڵ تورکیا و کۆمپانیا چاوچنۆکە قاچاغەکانی دونیادا. دیارە بە شەریککردنی یەکێتیی و ئەو قیادییانەی وەلائیان بۆ پارتیی، بەهۆی رەیع و صەفەقاتی چەند میلیارد دۆلارییەوە، ساغ کردبووەوە .

ئێمە، پێمانوایە گەورەترین خیانەت لەمێژووی مرۆڤی کورددا، ئەو ڕیفراندۆمە بوو کە کرا، چونکە کوردبوون و پرسی سیاسیی "کورد"ی

وەکو قەضییەیەکی رەوا، سەد ساڵ بۆ دواوە گەڕاندەوە، کەچیی هەزاران مۆبی نەژادیی جاهیل هەن، تا ئێستایش پێیانوایە ئەو ڕیفراندۆمە کارێکی زۆر باش بوو! ئەوەی نەیهێشت سەربگرێت بە عەقلییەتی نەتەوەپەرستانەی خۆیان، خیانەتی عوظمای! ١٦ی ئۆکتۆبەر بوو! بێئاگا لەوەی ١٦ی ئۆکتۆبەر بەرەنجامی حەتمیی، قەسریی و جەبریی خیانەتە گەورەکەی ڕیفراندۆم بوو! بێئاگا لەوەی چەند ماڵی تاڵەبانیی، کۆسرەت، بەرهەم صالح، پارێزگاری راونراوی کەرکوک و ئەو مەسئولە یەکێتییانەی بەهۆی پارەی رەیعەوە کڕدرابوون، بەشدارن لە خیانەتی ریفراندۆمدا، ئەوە ماڵی بارزانیی و پارتیی، بەرپرسی یەکەمی ئەو خیانەتانەن کەبەسەر تەواوی کوردستانی عێراق، سوریا و تورکیاشدا، هێنایان .

کورد لە کوردستانی عێراقدا، کێشەی نەتەوایەتیی نەمابوو. ماددەی سەد و چل کە جێبەجێ نەدەکرا، ئەگەر بەشێکی بەهۆی عینادیی حکومەتی عێراق و سیاسییە عێراقییەکانەوە بووبێت، نۆ لەسەر دەی بەهۆی ئەوەوە بوو، پارتیی هەرگیز نەیدەویست کەرکوک بۆ سەر هەرێمی کوردستان بگەڕێتەوە، چونکە بالانسی هێزی یەکێتیی، گۆڕان و کۆمەڵ( ئەوکات، نەوەی نوێ نەبوو)...تاد، زیادی دەکرد. دواتریش بەهۆی دەست تێکەڵکردن لەگەڵ داعش و تورکیادا، زیاتر بۆ نەوت، کۆنترۆڵی کەرکوکیان کرد. لەو چەند ساڵەدا، بەس نەوت و غازی کەرکوک دزراوە و شارەکەیان، ئەوەندەی تر وێران کرد.

وێڕای ئەوەی ناشیرینترین وێنەی حوکمی میلیشیایی و چەتەگەرییان، پێشانی عەرەبەکان، تورکمانەکان، مەسیحییەکان و دونیا دا. کۆمەڵێ پیاوکوژ، چەقۆکێش، مافیای نەوت و پیاوی موخابەراتی

ولاتان، کەرکوکیان زەوت کردبوو، سامانە سروشتییەکانیان دەدزیی و تەنانەت، منداڵی دەوڵەمەندە کوردەکانی کەرکوکیشیان دەفڕاند و بە پارەی زۆر، بە خاوەنەکانیان، دەفرۆشتنەوە .

ریفراندۆم، بۆیە خیانەتێکی زۆر گەورە بوو، چونکە کارتی نەتەوەیی، ئیحساساتی بێ دەوڵەتیی و بێ شوناسیی، هەموویان لە پرۆسێسێکی ئیستیحماریی سۆسیۆ(ئابووریی و سیاسیی) دا، بۆ ئەجێندای کۆمەڵێ مافیای تێرنەخۆری کوردایەتیی و گەمەی موخابەراتیی هێزە ئیقلیمیی و لۆبییە زایۆنییەکان، خرانە گەڕ. گەورەترین بازرگانیی بە قەضییەی سیاسیی کوردەوە کرابێت لە مێژووی بزوتنەوەی سیاسیی کورددا لە هەرچوار پارچەکەی کوردستان، ئەم عەمالەتە ئیقلیمییەی ریفراندۆم بوو. ریفراندۆمێکی پۆغڵ کە زۆرترین ساختەکاریی تێدا کرا، بەڵام هێشتا نیوەی خەڵکی کوردستان، بایکۆتیان کرد یان "نا=نەخێر"یان بە تەنگەی جامبازەکانی کوردایەتییدا، دا. لە کولتووری کوردەوارییدا کە لە گەلانی ترەوە وەرگیراوە، دەگوترێ، کێ زۆر کەرە؟ وەڵام ئەوەی سواری ماتۆڕ دەبێت. لەو کەرتر کێیە؟ ئەوەی لە پشتی ماتۆڕسوارەوە، سوار دەبێت! لە واقیعیشدا، ئەحمەقترین سیاسییەکانی کورد ئەوانە بوون کە کەمپەینی ریفراندۆمیان، بەڕێخست، لەوانیش ئەحمەقتر ئەوانەبوون کە نەیاری سیاسەتەکانی پارتیی و یەکێتیی بوون، بەڵام بیانوویان دەهێنایەوە و دەیانگوت، ئەمە مەسەلەیەکی نەتەوەییە و پێوەندیی بە ئاییندەی نەوەکانمانەوە هەیە، مرۆڤ ناتوانێ بە سەربەخۆیی! بڵێ نا، سەرەنجام ئەم مۆبانە هەموویان، دەنگیان بە حەماقەتی بەڵێدا .

ئەگەر بە مانا خاکییەکەی، خیانەت( درێغیی ( treason =لە ئاستە باڵاکەیدا ئەوە بێت کەسانێک یان حیزبێک، لە پێناوی بەرژەوەندییە

شەخصـیی، بنەمـاڵەیی و حیزبییەکـانی خۆیانـدا، کەرامەتـی نەتەوەیـی و شکۆی سیاسـیی گەلێـک یـان دەوڵەت و نیشـتمانەکەی خۆیـان شـکاندبێت، ویسـتبێتیان بەهـۆی دەسـت تێکەڵکـردن لەگەڵ دەسـگای موخـابەراتیی دەرەوە، بنکـۆڵی دەسـەڵاتێکی شـەرعیی بـکەن ( لێـرەدا عێـراقە کە خۆیـان بەشـێکن لە عێـراق) ئەوە ئەم ریفرانـدۆمە، لە خـانەی خیـانەتی عوظمـادا دادەنرێت. بەدەر لەوانەیش، بەکارهێنانی شعوری خەڵکی کوردستان، بۆ قەرصـەنەیەکی بنەمـاڵەیی، ئـابووریی و موخـابەراتیی، ئەمەیشـیان هەر خیانەتێکی گەورەیە کە بۆ دزیینی دەیان ملیارد دۆلاری تر و برسییکردن و رەزیلکردنی ئینسانی کورد، بوو .

کـاتێ، تەواوی دونیـا دژت بێـت، ئێـران کە لە ئەمێریکـا زیـاتر خاوەنـداریی عێـراق دەکـات، دژت بێـت، زۆرییـنەی رەهـای ئەو نـوخبە عەقڵانییانەی رەخنەیان لە ریفراندۆم دەگرت، تکایان دەکرد ئەم حەماقەتە مەنغـــۆلییە لە سیاســـەتدا مەکەن، تەواوی سیاســـییەکانی عێـــراق و حیزبەکانیـان، دەیـانگوت، دانیشـن بـا شـتێ نەشـکێنن، تەنـانەت ئێـران بە راستەوخۆ ئۆکەی بۆ ئەوە کردبوو با کەرکوک لەژێر هەیمەنەی یەکێتیی و گۆڕاندا بێت، بەڵام نـابێ تورکیا مەلەفی سیاسیی و نەوتی بەدەستەوە بێت. ئـێ تورکیـاش یـانی پارتیی و داعـش، بەڵام تـاجیرە چاوچنۆکەکـانی یەکێتیی، فاشیلەکانی کوردایەتیی و ملیاردێرەکانی بنەماڵە سیاسییەکان لە گەڵ مۆبەکـانی ناسـیۆنالیزمی نەژادیـی و طـائیفیی کوردییـدا، لەسـەر کەرەکەری ریفرانـدۆم، سـووربوون. ئـاخر، ئەم شـێتخانەیەی کـوردایەتیی چۆن دەچێتە سەر، لە کاتێدا ئێران، تەشـەبوثی دونیای پێکردن، کەرکوک بـۆ ئەوان خەتێکـی ئێجگـار سـوور و تـۆخە و رێـگە نـادەن تورکیـا و ئیسـرائیل، بێـنە نـاو عـومقی سـتراتیژیی ئێـرانەوە، بەڵام گوێیـان نەگـرت؟

راستییەکەی ئێران، دۆستانە دەیویست کەرکوک وێران نەبێت و بۆ ئەو حیزبە کوردییانە بێت کە تەفەهومی ئەمنی قەومیی ئێران دەکەن، بەڵام تورکیا، فاشییانە و دوژمنکارانە، مەراقی بوو کەرکوک وێران بێت، شەڕی کورد و عەرەب، کورد و تورکمان و سەرەنجامیش شەڕی کوردی سوننە و ( عەرەب و تورکمانی شیعە) هەڵگیرسێت.

کاتێ گوێ ناگریت و بەهۆی تیجارەتی چەند ملیارد دۆلارییەوە، چاوت سوور دەبێت و پەنجەی موغامەرات لە دونیا رادەوەشێنێت، کاتێ یەکێتیی، وەلائی بۆ ماڵی بارزانیی دەبێ و مەلەفی ئاڵۆزی کەرکوک بە فشقیات وەردەگرێ، ئەوە قاسمی سولەیمانیی، میلیشیای جەڕاڕی حەشدی شەعبیی دەنێرێتە سەر میلیشیای برسیی و بێ پارەی پێشمەرگە و لە چەند سەعاتێکدا، تا هەولێر و سلێمانیی، خۆیان ناگرنەوە. پێشتر لەگەڵ هۆگر بیتوێنییدا، بە کاملی قەناعەتەوە، دەستخۆشییمان لەوانە کرد کە نەیانهێشت ئەو شەڕەی تورکیا و پارتیی لەگەڵ ئەجێنداکانی حیلفی سوننیی-عەرەبیی و زایۆنیزم، دەیانویست لە کەرکوک بەرپابێت و کەرکوک بە حەڵەب بکەن، بە کشانەوەی هێزەکانیان و تەنسیقکردن لەگەڵ حکومەتی فیدراڵدا، نەیانهێشت ئەم وێرانکردنەی کەرکوک سەربگرێ. ئەوەی کارەساتە ئەم کوڕگەلەی بنەماڵەی تاڵەبانیی، ئەوەندە شەهامەتیان تێدا نییە لەبەرامبەر تەخوینەکانی مەرجەعی کوردایەتیی و پرۆکسییەکانی تورکیادا، بچووکترین داکۆکیی لەو کارەیان بکەن. ئەصڵەن، یەکێتیی دەبووایە سەرمایەگوزاریی لەسەر ئەمە بکردایە، بەڵام یەکێتیی و تەواوی ئەوانەی ئەنتی پارتییشن، جورئەت ناکەن رەخنە لەسەرجەم خیانەتی ریفراندۆم و گوتاری فاشییانەی کوردایەتیی بگرن، بەڵکو دەچن وەکو مۆبەکانی پارتیی، رەخنە لە ١٦ی ئۆکتۆبەر دەگرن و بە

خیانەتی دەزانن. هەموو ئەمانەیش، ئەو حەقیقەتە دەردەخەن کە فاشیزمی کوردایەتیی، چەند دەستێکی باڵای لە تەخوینکردن و صەنعەتی تەخویندا هەیە و چۆن تەواوی یەکێتیی، گۆڕان، کۆمەڵ و ئەو نوخبە و کەسایەتییانەی بە حیساب، "سەربەخۆ"شن، بەهەمان مێنتالێتیی و کەرەستەکانی پارتیی، وەکو بەبەغای دەبەنگ، تەخوینەکانی کوردایەتیی، دەچڕنەوە .

بالادەستیی ئێران بەسەر عێراقەوە، بە ئەمێریکا چارەسەر ناکرێ، کەچیی قاچاغچییەکانی کوردایەتیی دەیانویست تەواوی کەیسی سیاسیی کورد بکەن بە کارتێک و بیدەنە ئەردۆغان و حیلفە سونییەکەی بۆ ئەوەی شەڕەقۆچی لەگەڵ ئێرانی شیعییدا پێبکەن. بە کورتییەکەی مافیاکانی کوردایەتیی بەهۆی بیزنسی نەوتەوە، دەیانویست کورد بکەن بە گژ شیعە و ئێراندا بۆ ئەوەی ئەجێندای پۆغڵەواتی حیلفە نەیارەکەی شیعە (ناسیۆنالیزمی عەرەبیی-سوننیی-تورکیی) سەرکەوتن بەدەست بهێنێت. لە مێژوودا، چەند جارێک دەسەڵاتە شاهەنشاهییەکانی ئێران بە خراپیی، شکانی کوبرەیائی خۆیان و ئێرانیان لەسەردەستی عەرەبەکان و تورکەکان، بینیوە. یەکەمین تێکشکانیان بەهۆی فەتحی ئیسلامییەوە بوو کە راشیدییەکان سەرپەرشتیان دەکرد و ئەمەوییەکان، بەهۆی تەعداکردن، تەعریبکردن و داگیرکارییەوە، ستەمکارییەکان زیاتر کرد. دواتر شەپۆلی تورکە کۆچبەرەکان و جەنگی تورکە مەنغۆلییەکان دژی ئێرانییەکان بە گەورەترین قەصابخانەکانی مێژوو ئەژمارد دەکرێن. جەنگی تورکە مەنغۆلییەکان، بەڕادەیەک ژمارەی ئێرانییەکانی کەم کردەوە کە تا ئێستایش، ئەو بارەیان لەبەرامبەر تورک نەژادەکاندا راست نەبووەتەوە. دواتریش لە شەڕی چاڵدێراندا، عوثمانییەکان بەهۆی جاشایەتیی کوردە

طـائیفیی و مەذهەبییەکـانەوە( سـوننییەوە) توانیتیـان کوبرەیـائی ئێرانـی صـەفەویی بشکێنن. لە هەشتاکانیشدا، ناسیۆنالیزمی عـوروبیی و بەعثیـی، زەبرێکـی گەورەیـان لە ئێرانـی ئیسـلامیی دا. هەمـوو ئەوانە لە مێـژووی ئێرانییەکاندا، وا دەخوێنرێنەوە کە پێویستیان بە سارێژی درێژخایەن هەیە و نابێ رێگە بە دووبارەبوونەوەیان، بدەن .

کەرکـوک و هەرێمـی کوردسـتان(بەتایبەتترییش لە قەنـدیلەوە بـۆ خـانەقیین) بە قـولایی پێدەشـتەکانی کەرکوکـدا، عـومقێکی سـتراتیژیی زۆر گرینگە بۆ ئێران. ئەجناسی کوردایەتییش، بەهەموو نـاعەقڵانییەتی سیاسیی خۆیـانەوە، دەیانویسـت کەرکـوک بە جیۆگرافیـا و نەوتەوە، لەبەرکـی تورکیـای ئەردۆغـانیزم و نیۆعوثمـانیزم بکەن. کـاتێکیش بـاجەکەی دەدەن، دەڵێن لە ١٦ی ئۆکتۆبەردا خیانەت کرا؟! ئەگەر شەریکە دزەکانی یەکێتیی، لەبری ئەم هەموو تەنازولاتەی بۆ پارتیی کردیان، جەریئـانە و عەقڵانییانە تەفەهومی هاوکێشە سیاسیی و عەسکەرییەکانیان بکردایە و ریفراندۆمیان رەت بکـــــردایەتەوە و بە جـــــورئەتەوە، تەحەدای درۆ و دەلەســـــە ناسیۆنالیسـتییەکانی پـارتیی و فاشـیزمە طائیفییەکەیـان بـدایەتەوە، ئێسـتا نەدەکەوتـــنە دۆخـــێکەوە کە پـــارتیی و بـــارزانیی بەهەمـــوو مێـــژووی حیزبەکەیـان خەریکـی خیـانەت بـوونە، کەچیـی ئێسـتا ئەوان باڵادەسـتن و وەطەنیـیەت و قەومیـیەت، بەو هەمـوو دزیـی و تـاڵانییەوە، بەو هەمـوو وێـرانەیەی کوردسـتانەوە، لەبـازاڕ دەنـێن و یەکەمیـن کەسـانێکیش ئەم تەخوینانە دەکرن و لەدوای پارتییەوە دووبارەی دەکەنەوە، خودی قیادییە هەزیلەکانی یەکێتیی و نوخبە موهەڕیجەکانی کوردایەتیین( کە خۆیشیان بە نەیاری پارتیی دەزانن).

ئەم هەویـرە، ئـاو زۆر دەکێشـێ و ئەم باسـە، لەبەشـی سـێیەمدا، درێژەی دەبێت.

بەر لە ڕیفراندۆم بەغدا داوای چیی لە کورد دەکرد و ئێستا کورد داوای چی لە بەغدا دەکات؟

بەر لە ریفرانـدۆم حکـومەتی عێـراق داوای لە هەرێـم دەکـرد بەپێـی دەسـتور دانووسـتان لەگەڵ بەغـدا بکـات کەچـی هەرێـم داواکەی بەغـدای پشت گوێ دەخست، بەڵام ئێستا هەرێم داوای دانووستان لە بەغدا دەکات و بەغدا داواکەی هەرێم بە جدی وەرناگرێت.

پێشتر بەغدا داوای لە هەرێم دەکرد وەفد ڕەوانەی بەغدا بکات بۆ دانووستان لەسەر پرۆژە یاسـای بودجە و نەوت، بەڵام ئێسـتا هەرێم داوا لە بەغدا دەکات ئەگەر تەنیا پشـکی لەسـەدا ١٧ی بەشـە بـودجەی هەرێـم بنێرێـت ئەوا ئامـادەن نەوت و دەروازە سـنوورییەکان و فڕۆکەخانەکـان رادەسـتی بەغدا بکەن، کەچی بەو هەمـوو پاشەکشێیەشـەوە هێشـتا بەغدا داواکانی هەرێم بە جدی وەرناگرێت.

هەوڵەکـانی کـورد بۆسـەربەخۆیی بەسـەرخۆیدا شـکایەوە و ڕووداوەکـانی دوای ١٦ی ئۆکتـۆبەر و لە دەسـتدانی یەک لە سـەر پێنجـی ئەو ناوچـانەی لە ژێـر کـۆنترۆڵی کـورددا بـوون پاشەکشـێیەکی پـڕ لە شـورەیی بـوو بـۆ سـەرکردایەتی کـورد لەو هەوڵانەی چەنـدین سـاڵە بـۆ سەربەخۆیی دەیاندا.

لە ساڵی ٢٠١٤دا لە دوای هاتنی داعش بـۆ عێراق کورد سـودی لەو ناسەقامگیرییە وەرگرت و ئەو ناوچانەی کۆنترۆڵکرد کە ماوەیەکی دوور و درێژە سەرکردایەتی کورد بە زەوی باوباپیرانی کوردی زانیوە و جگە لەوەی لە ڕووی نەوتەوە دەوڵەمەنـدن بەڵکـو نـزیکەی نیـوەی زەوی

کشتوکاڵی عێراقیش پێکدەهێنن، بەڵام لە دوای ریفراندۆمەکەی مانگی ئەیلول کورد بە خێرایی هەموو ئەو ناوچە دەوڵەمەندەی لە دەستدا.

بەر لە ریفراندۆم پێچەوانەی ویستی عێراق حکومەتی هەرێم راستەوخۆ گرێبەستی لەگەڵ کۆمپانیا نەوتییەکان ئەنجامدەدا لەوانەش کۆمپانیای ئێکسۆن مۆبیل کە ئەوکات رێکس تیلەرسن وەزیری دەرەوەی ئێستای ئەمریکا بەڕێوەبەری کۆمپانیاکە بوو.

چۆن ئەمریکا و تورکیا و ئێران سەبارەت بە ریفراندۆم هاوهەڵوێست بوون و هەر سێ وڵاتەکە ئیدانەی ریفراندۆمیان کرد، بەپێی بابەتەکە تورکیا نیگەران بوو لەوەی جوڵەی تاک لایەنەی کورد لە عێراق و گەشەسەندنی کورد لە سوریا مەترسی بۆسەر تورکیا دروست بکەن بەوەی ببێتە هۆی هاندانی دانیشتوانی کوردی تورکیاش.

لە دوای ریفراندۆم تورکیا و ئێران پشتگیری بەغدایان کرد بۆ ئەوەی فشاری زیاتر بخاتەسەر سەرکردەکانی کورد و مەسعود بارزانیش کە لەساڵی ٢٠٠٥وە سەرۆکی هەرێم بوو دەستی لە پۆستەکەی کێشایەوە.

## فەشەلی پارتی لە حکومرانیدا

لەماوەی ٢٤ ساڵەی حکومەتی هەرێمی کوردستاندا، هیچ کاتێک وەک ئێستا قەیران بەرۆکی خەڵکی کوردستانی نەگرتوە، تەنانەت ئەو کاتانەشی کەشەری خۆکوژی کورد لەناوخۆیدا گەشتە ئەوپەری توندوتیژی لە ٣١ی ئابی ١٩٩٦.

**حاڵی حازر ئەم قەیرانانە ژیانی ئاسایی هاوڵاتی لەم هەرێمە دەهارێت:**

**١ .قەیرانی دەستووریی**

كەخۆی لە نەبوونی دەستوور و ململانیی مەسەلەی هەڵبژاردنی سەرۆكی هەرێم و گۆڕینی سیستەمی حوكمرانی هەرێم دەبینێتەوە.

**٢ .قەیرانی سیاسی**

كەخۆی لە قووڵبونەوەی كێشەكانی نێوان هەرێم و بەغداد دەبینێتەوە.

**٣ .قەیرانی دارایی**

كەخۆی لە برینی بودجە ونەبوونی موچە و پەككەوتنی جوڵەی بازار و وەبەرهێنان تا سەرەگرتنی چەند كیلۆمەتری بۆ بەنزین دەبینێتەوە ئەمە سەرباری ئەو كێشە گەورە و كاریگەرانەی كە لەرووی كۆمەڵایەتی و دەروونی یەوە وەك درێژكراوەی قەیرانەكانی سەرەوە رۆژانە دووبارە و چەند بارە دەبنەوە.

هەموو لایەك بەهێزە سیاسییەكانەوە زور باش ئەم قەیرانانە و دەرهاویشتەكانی دەزانن، و هەرلایەك بەپێی توانای خۆی دەیەوێت لەبەردەم هاوڵاتیاندا خۆی لێبێبەری بكات یان كەمترین بەرپرسیاریەتیەكە بخاتە سەرشانی خۆی. بەڵام بەجدی كێ و كام لایەن بەرپرسی یەكەمن لەم دۆخە نالەبارەی هەرێم؟؟

بەرلەوەی كەس پێمبڵێ دەزانم كە یەكێتی بەشداری لە حكومەتدا كردوەو ئێستاش جێگری سەرۆك و پێنچ وەزیری هەیە، هەروەها ئەوەش دەزانم كە ساڵانی رابردوو لایەنەكانی دیكە بە ئیسلامی و كەسایەتیەكانی گۆران بەشداربوون لە حكومەتدا، بەڵام كە سەیری هەیكەلی دەسەڵات و شێوازەكانی وەرگرتنی بڕیاری سیاسی و ئیداری دەكەین و ئەوەی

کەدەسەلاتی یەکەمینی تیا کۆبوەتەوە، جگەلە پارتی کەسی دیکە نادۆزیتەوە، چونکە:

**١ .پارتی خاوەنی ئەم دەسەلاتانەیە بەتایبەتی لەدوای ٢٠٠٣ وە:**

یەکەم: سەرۆکی هەرێم بۆ ماوەی زیاتر لە ١٠ ساڵ

دووەم: سەرۆکی حکومەت جگە لەکابینەی ٦ کە تەمەنەکەی ٢ ساڵ بوو

سێیەم: وەزیری سامانە سروشتیەکان بە درێژایی بوونی وەزارەتەکەی

چوارەم: سەرۆکی ئەنجومەنی ئاژانسی ئاسایش و پاراستنی کوردستان

پێنجەم: وەزیری پلاندانان بەدرێژایی بوونی وەزارەتەکە لەکابینەی یەکگرتنەوە

شەشەم: بەرێوەبەرایەتی فەرمانگەی پەیوەندیە دەرەکیەکانی حکومەت، کە رەسمی سیاسەتی دەرەکی هەرێم دەکات.

**لە ئێستاشدا:**

حەوتەم: پارێزگار و سەرۆکایەتی ئەنجومەنی پارێزگای هەولێر بە دەسەلاتی رەهاوە

هەشتەم: پارێزگار و سەرۆکایەتی ئەنجومەنی پارێزگای دهۆک بەدەسەلاتی رەهاوە

٢. لەگەڵ بوونی ئەو دەسەلاتە زۆر و زەوەندانە ، لەماوەی ١٠ ساڵی رابردوودا پارتی خاوەنی ئەم سیاسەت و پرۆژانەیە کە ئێستا بوونەتە مۆتەکە بەسەر کوردەوە

یەکەم: بەهۆی پێداگری پارتی لەسەر سەرۆکی هەرێم کێشەی دەستوور هەیە و تائێستا هەرێم دەستووری نیە و سیستەمی حوکمرانی نەگۆراوە بۆ پەرلەمانی و کێشەی لەسەرە.

دووەم: پارتی خاوەنی پرۆژەی فرۆشتنی نەوتی سەربەخۆ و ڕێکەوتنی پەنجا ساڵە لەگەڵ تورکیا و دوورکەوتنەوە بووە لە حکومەتی ناوەند هەربۆیە بێ پێچوپەنا پارتی فەشەلی یەکەمی حکومرانیەتی ئەمرۆی کوردستانە و بەرپرسی یەکەمی ئەو قەیرانانەیە کە دروستبوون.

## لاوازی و شکستی کورد لە چارەسەری ناوچە سنوریە کێشە لەسەرەکاندا

کە لە ساڵی ٢٠٠٣ دا ڕژێمی بەعس ڕوخا لایەنە سەرەکیەکانی عێراق لەسەر سیستەمی فیدرالی ڕێککەوتن و مۆری دەستوریان کرد. سەرانی پارتی و یەکێتی واژووی مانەوەی باشوری کوردستانیان لە چوارچێوەی عێراقدا کرد. بەمجۆرە باشوری کوردستان دەستوریانە لە چوارچێوەی ئێراقدا مایەوە و چارەسەری کێشەکان خرانە ئەو چوارچێوەیە. ئەو ڕێکەوتنە لەگەڵ یاسا و پرەنسیپە نێونەتەوەیەکان سەبارەت بە کێشەی لەو جۆرە، تێگەیشتن و گونجاوی نێونەتەوەیی هەبوو. چارەسەری ناوچە کێشەلەسەرەکانی نێوان عێراق و باشوری کوردستان بەپێی دەستور بڕگەیەکی تایبەتی بۆ داندرا و لەڕێگەی بڕیاری ١٤٠ەوە جۆری چارەسەرەکە بڕیاری لەسەر درا. بەپێی دەستور دەبوایە تاکو کۆتایی ساڵی ٢٠٠٧ کۆتایی بە چارەسەرەکە بهێندرێت. واتە ئاسەوارەکانی بەعەرەبکردن نەهێڵدرێت، ئاوارەکان بگەڕێنەوە، موڵکە داگیرکراوەکان بۆ خاوەنەکانیان بگەڕێندرێتەوە، دامەزراوەکان بە هاوبەشی ڕێکبخرێنەوە، پاشان ریفراندۆم لەسەر چارەنوسی ئەو ناوچانە بکرێت و سنور دیار بکرێت. لە دیدێکی کوردستانیانەوە ئەو بڕیارە کەموکوری هەبوو و ڕەخنەش زۆر گیران. هەرچۆنی بێ ماددەی ١٤٠ گرنگی خۆی هەبووە و بۆ چارەسەری کێشەیەک داندرابوو کە بەدرێژایی تەمەنی دەوڵەتی عێراق هەبووە و بێ چارەسەر مابووەوە.

بۆ ئەوەی کورد بتوانێ لە ئاست جێبەجێکردنی کێشە ئاڵۆز و سەختە نەتەوەیەکانیدا بێ، دەخوازێ بەر لەهەر فاکتەرێک کورد خۆی خاوەنی نوێنەری رەوا و بەهێز بێت، لە هاوکێشە هەرێمی و نێونەتەوەیەکان بگات و لە چوارچێوەی تێگەیشتنە دانپێندراوە نێونەتەوەیەکاندا خاوەنی ستراتیژی ناسیۆنالیستانەی مۆدێرن بێت.

کێشەی سنور گرنگترین کێشەی نێوان عێراق و باشوری کوردستانە، بۆیە دەبوایە لەپێشترین خاڵی نوێنەرانی کورد بێت و بە کاریگەرانەترین شێوە کار بۆ جێبەجێکردنی بکرێت. ئەرکی دەسەلاتدارانی هەرێم بوو بەگەرموگوڕی و هۆشیاری زۆرەوە هەوڵی جێبەجێکردنی خاڵ بەخاڵی ماددەی ١٤٠ بێ دواکەوتن بدەن، بێ ساردبوونەوە تواناکانیان بۆ جێبەجێکردنی ماددەکە بخەنەگەڕ، رێگەی سستی نەدەن و هەڵوێستی توند بەرامبەر هەر پێشێلکاریەکی دەسەلاتی بەغدا بنوێنن و جەخت لەسەر چارەسەریە دەستوریەکان بکەنەوە.

لەبەرئەوەی باشوری کوردستان نە خاوەنی نوێنەری بەهێز بوو، نە هوشیاری و تێگەیشتنی سەردەمیانە و گونجاوی بۆ پرسێکی ئەوها گرنگ هەبوو، بەپێچەوانەوە سەرانی دەسەلاتی هەرێم، شێلگیرانە کاریان لەسەر جێبەجێکردنی ماددەی ١٤٠ نەکرد. کێشەی ناوخۆیی و دووبەرەکی نێوان بەرەی سەوز و زەرد رۆڵی لاوازکردنی گێڕا و هەوڵەکانی بەلاڕێدا برد، بۆ نمونە دوو بەرەیی ئاسایش و دوو ئاراستەیی لە کەرکوکدا، دابڕینی ناوچەکان و بەڕێوەبردنیان بەپێی بەرژەوەندیە حزبیە زەرد و سەوزەکان لەهەر زۆنێکدا، بەمجۆرە دوورکەوتنەوە لە هەنگاو و چارەسەری ستراتیژیانەی کوردستانیانە بۆ کێشەکە. لە بەرامبەری لاوازی نوێنەرانی کوردا دەسەلاتی بەغدا جگە لەوەی هەنگاوەکانی سست بوو، بەربەستی

دروستکرد، سیاسەتی پەراوێزکردنی کورد و جار جارە بەعەرەبکردنیش بەردەوامیان پێدرا.

وەکو دەرکەوت چارەسەری ماددەی ١٤٠ لەکارە لەپێشەکانی دەسەڵاتدارانی هەرێم نەبوو. لەجیاتی ئەوە هەر بەرەیە لەلایەن خۆیەوە ململانێی بەدەستهێنانی پلەوپایە و پۆست لە ئاستی عێراق و کوردستان بوو، هەروەها نایاسایانە خەریکی ئاواکردنی نەوت بە قاچاغ و هەڵکەندنی چاڵی نەوت بوون، خەریکی بەستنی کۆنتراکت لەگەل کۆمپانیای تورکی و بێگانە، خەریکی هێنانی بازرگانە تورک و عەرەبە گەندەڵەکان بۆ کوردستان بوون و هتد. بەکورتی هەوڵەکان لەگەلێ باردا نایاسایانە بۆ بەدەستهێنانی سەرمایەی زۆرو خێرا چڕکرانەوە. سەرانی دەسەڵاتی هەرێم ئامادەبوون لەسەر نەوت دژی بەغدا بووەستنەوە و بیگەیننە کەناری شەڕ، بەڵام تەنها بۆ یەکجاریش لەسەر سستی یان سڕکردنی ماددەی ١٤٠ هەڵوێستیان وەرنەگرت و لە بەغدا یاخی نەبوون.

لە جیاتی هەڵوەستە و بەخۆداچوونەوە، وە چارەسەری کێشەکانیان لەگەڵ بەغدا، دەسەڵاتدارانی هەرێم پەیوەندی و بازرگانیان لەگەڵ تورکیا بەهێزتر کرد، وردە وردە لە دەسەڵاتی بەغدا دوورکەوتنەوە، ناکۆکیەکان قوڵتر و نێوانیان فراوانتر بوو. ئەوەش کە ئاماژە بوو بە کێشە و بێمتمانەیی لەنێوان یەکەی فیدراڵ و دەسەڵاتی ناوەندا، ئاراستەکەی روو لە ناکۆکی زیاتر و دەرئەنجامی نادیار بوو. لەراستیدا رووکردنە تورکیا و سەیرکردنی تورکیا وەکو فریادرەس لە شەوەزەنگدا گرتنەبەری کوێرەڕێیەک بوو لە هەڵدێردا. ئەوەش گەورەترین و کوشندەترین هەڵەی مێژوویی بوو کە دەسەڵاتدارانی باشور تێیکەوتن.

لە ساڵی ٢٠١٤ دا هێرشەكانی داعش بۆسەر كوردستان دەستیپێكرد، كە تاوانی گەلكوژی شەنگال و تاوانی دیكەی جەنگ و دژ بە مرۆڤایەتی لێكەوتەوە. دوای ئەوە بەهاوكاری هاوپەیمانان و لایەنە كوردستانیەكان، هێزی پێشمەرگە توانی زۆربەی ناوچە كوردستانیە سنوریەكان كە گرنگترینیان شاری كەركوك بوو ڕزگاربكات و بیانخاتە ژێر دەسەڵاتی خۆی.

ئەو سەركەوتنە سەركەوتنێك بوو لە باری شەڕدا، وە ڕێكخراوی داعش دوژمنی هاوبەشی عێراق و باشوری كوردستان بوو. بۆیە ڕزگاركردنی ئەو ناوچانە لەچنگی تیرۆرستانی داعش، ڕزگاركردن لە دوژمنێك بوو كە وەكو یەك دژی كوردستان و عێراق بوون. ڕزگاركردنی ناوچە سنوریە كێشە لەسەرەكان واتای ئەوە نەبوو كە ئیتر ئەو ناوچانە بۆ كوردستان گەڕانەوە و عێراقیش وازیان لێدێنێ. بە پێی ڕێكەوتنە دەستوریەكە ئەو ناوچانە دەكەوتنە ژێر دەسەڵاتی عێراق تا ئەو كاتەی ماددەی ١٤٠ چارەسەر دەكرێت. هەموو ئەو گوتن و بۆچوونانەی كە پێیوابوو ئەو ناوچانە كوردستانین و نابێ بگەڕێندرێنەوە ژێردەستی عێراق، یا پێیوابوو ئیتر ئەو ناوچانە جارێكیتر ناچنەوە بندەستی عێراق، بۆچوونی سۆزدار و خۆشباوەڕانە و ناتاوتوێكراوبوون. ڕاستە لە دیدێكی كوردستانیانەوە ئەو ناوچانە كوردستانین، بەڵام لە دیدی عێراقیانەوە بەپێچەوانەوە عێراقین. لەو پرسەدا دوو لایەن هەن كە دوو دیدی دژ بەیەكیان هەیە، دیارە هەردوولا لەسەر چارەسەری كێشەكە ڕێكەوتنی دەستوریان كردووە. بێگومان بوونی ئەو ناوچانە لەژێر دەسەڵاتی حكومەتی هەرێمدا، پۆزیسیۆنی دەسەڵاتی هەرێمی بەهێزكرد و لە ئەگەری هەنگاوەكانی جێبەجێكردنی ماددەی ١٤٠ دا بێگومان زۆر سوود بەخش

بوو، وە دەیتوانی پرۆسەکە زۆر پێشخات. بۆیە ئەگەر تێگەیشتنی راشیونالانە زاڵبوایە دەبوایە ئەو سەرکەوتنە بۆ وەگەڕخستنی چارەسەری یەکجاری ماددەی ١٤٠ بەکاربهێندرێت.

کێشەناوخۆیەکانی باشووری کوردستان و قەیرانی پرسی سەرۆکایەتی و پەرلەمان، پرسی ڕیفراندۆمی قووتکردەوە، کە لەبنچینەدا لەلایەن سەرۆکی نایاسایی و ماوەبەسەرچوو مەسعود بارزانیەوە هێندرا و سەپێندرا. پێداگرتن لەسەر ڕیفراندۆم لە ناوچە سنوریە کێشەلەسەرەکاندا، بێ گوێ پێدان و بێ هیچ ڕێکەوتنێک لەگەڵ حکومەتی بەغدا، بە پشتکردن لە ئەمەریکا و داواکاریەکانی، بە پشتکردن لە ڕێکەوتنە دەستوریەکە، لەکاتێکدا هەنگاوەکانی دەسەڵاتی نایاسایی هەرێم لە ئاستی ناوەوە و دەرەوەدا لەسەر ئاستی بوارە گرنگەکاندا جێگەی پرسیاری زەق بوون، هەموو ئەوانە وایکرد سەرانی باشوری کوردستان خۆیان تەواو تەریککەن و بکەونە قوژبنێکی تەنگ و نالەبار. ئەو هەڵە کوشندانە وایانکرد بارەکە ١٨٠ پلە وەرگەڕێ و بگۆڕێ. حکومەتی عێراق هەڵەکانی دەسەڵاتدارانی باشوری قۆزتەوە و کەوتە سەنگەری دژ، داوای هاوکاری هەرێمی و نێونەتەوەیی کرد و گەمارۆکانی بەکردەوە دەستپێکرد، داوای دەستبەجێی چۆڵکردنی ناوچە ڕزگارکراوە کێشەلەسەرەکانی کرد. ئێران و تورکیا و عێراق لەسەر چۆکپێدادانی کورد کەوتنەکار. گوشارە ناوخۆیی و دەرەکیەکان بوونەهۆی مۆرکردنی کشانەوە و شکست لە ١٥ ی مانگی ئۆکتۆبەردا، نەک هەر ئەوە بەڵکو پەسندی ئەوەکرا کە عێراق کۆنترۆلی هەموو بیرە نەوتیەکان و خاڵە سنوریەکان دوای ٢٦ ساڵ دوورکەوتنەوە بکاتەوە. ناپاکی باڵێکی ناو یەکێتی دەرهاوێشتەی کێشە ناوخۆیەکان بوو کە دەسەڵاتداران نکۆڵیان لە بوونی دەکرد.

وەکو گوترا کێشەی ناوچە کوردستانییە سنورییەکان لە ڕێگەی دەستورەوە چارەسەری بۆ داندراوە، پێویست بوو لە ڕێگەی دایەلۆگ و دانوستان بەپێی دەستور چارەسەری ئەو کێشەیە بکرێت. دەستبەسەرداگرتن لەژێر ناوی کوردستانی بوونی ناوچەکاندا، بێگومان دەرگەی دایەلۆگ دادەخا و ڕێگە بۆ بەرەورووبوونەوە و شەڕ خۆش دەکات. بەئەگەری زۆر بەرەورووبوونەوەی چەکداری و شەڕ ڕوویان نەدەدا، ئەگەر دەسەڵاتدارانی هەرێم لەئاستی پێویستبان و دەستوریانە لەگەڵ کێشەکەدا جووڵابانەوە. بەرەورووبوونەوە و شەڕ و دواتر شکست و دۆڕان دەرئەنجامی ئەو ئاراستە چەوتە بوو کە لەدەیەی ڕابردوودا پیادەکرا.

ئەگەر کوردستان کێشەی ناوخۆیشی نەبوایە، خاوەنی سوپای بەهێزی نیشتیمانیش بوایە چارەسەری ئاشتیانە باشتربوو لە شەڕ و بە کوشتدانی مرۆڤ و وێرانکردنی وڵات. بەپێچەوانەوە لە کاتێکدا دەسەڵاتی سیاسی لاوازبوو و بە کێشەی ناوخۆیەوە گیرۆدەبووە، بەمجۆرە باشوری کوردستان ئەو پێگە بەهێزەی نەبوو، دەبوایە سەرنج تەنها لای چارەسەری دەستوریانە بێت.

لە باری ئێستادا و لە دوای ئەو کەوتن و دۆڕانەی کە ڕوویدا، ئەگەر باشوری کوردستان خۆی بگرێتەوە و دەسەڵاتێکی نوێ نوێنەرایەتی بکات، پێویستە شێلگیرانە بۆ چارەسەری دەستوریانەی ماددەی ١٤٠ بگەڕێتەوە. بوونی دەسەڵاتێکی ڕەوا و دیموکراسی بێگومان کوردستان هەڵدەستێنێتەوە و بەهێزی دەکات، بەپێچەوانەوە درێژەی پاشماوەی ئەو دەسەڵاتە دووبەرەییەی ئێستا کورد بە لاوازی دەهێڵێتەوە و ستاتوسی کورد لەهەر دانوستان و گفتوگۆیەکدا لاواز دەکات

## دەسەڵاتی کوردی و لاوازی پلانی بەدەوڵەت بوون

یەکێک لە سیما دیارەکانی بزاڤی سیاسی کورد بە درێژایی مێژوو بریتی بووە لە ناکۆکی و دووبەرەکی و خۆکوژی و بەدوژمن کردنی یەکتر و ئامادەبوونی گروپە جۆربەجۆرەکان لە ناو کۆمەڵگای کوردیدا بۆ دەست خستنە ناو دەستی دوژمن بۆ شکاندنی ئێسقانی براکانی، ئەمەش لە چەندان شۆڕشی یەکبەدوایەک و ئەڵقە جیاوازەکانی مێژووی خەباتی سیاسی کورددا بە ئاشکرا بینراوە، لە کاتێکیشدا کە هەلێکی مێژوویی هەڵکەوتووە کۆدەنگی نیشتمانی دروست نەبووە لەسەر قۆستنەوەی فرسەتەکەو لەبیر بردنەوەی ناکۆکیەکان و هەوڵدان بۆ دارشتنی پلانێکی ستراتیجی لە پێناو بنیات نانی ئەزموونێکی سەرکەوتوو پاشان هەنگاونان بەرەو دەوڵەت بوون، ئەمجارەشیان لەدوای راپەرین هەلێکی زێرینی مێژوویی تر هاتە ئاراوە، ئەویش بەهۆی شەڕی کوەیت و سەرەڕۆییەکانی رژێمی بەعسی عێراق و پاشانیش گۆڕانی دید و ستراتیجیەتی سیاسی ئەمریکا لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاست دا، ئەم هەلە مێژووییەی کە لەدوای راپەڕینەوە بۆ کوردستانی باشور دروست بوو بە درێژایی سەد ساڵی رابردوو هەلی وا نەهاتبووە ئاراوە، چونکە لەلایەک رژێمە سەرکوت کەرەکەی عێراق لەلای کۆمەڵگەی نێودەوڵەتی ئەرزشێکی نەما، لەلایەکی ترەوە کۆڕەو بوە مایەی دروستکردنی سۆزێکی نێودەوڵەتی و بەتایبەتیش ئەمریکی بۆ گەلی کورد، لەدوای ۲۰۰۳ هەلەکە دوو هێندە بووەوە کە کەرکوک و ناوچەکانی تریش رزگاربوون، عێراقێکی نوێ هاتە ئاراوە کورد لەم قۆناغە نوێیەدا دەیتوانی بە دید و تێڕوانینێکی نوێ و بە ویستی خۆی لە عێراقی نوێدا سیاسەت بکات و بتوانێت داواکاریەکانی خۆی لە دەوڵەتە نوێیەکەدا بچەسپێنێت و ئەمەش بکاتە حاڵەتی دیفاکتوی کورد لە

عێراقــی نوێــدا، واتە هێــزە سیاســیە کوردیەکــانی لەدوای ســاڵی ٢٠٠٣ دەیانتوانی بە پلان و ستراتیجیەتێکی نوێوە مامەڵە لەگەڵ دۆخە نوێیەکەدا بکەن، بەڵام ســەد مەخابن ســەرەڕای هــاتنە پێشــەوەی ئەو هەلە مێژووییە گەورەش جارێکی تر فاکتەرە ناوخۆییەکان ڕێگربوون لەسەر هاتنەدی ئەو خەونە و بەجێهێشتنی قۆناغەکەو هەنگاونان بەرەو قۆنـاغێکی تر، جارێکی تـر فاکتەرەکـانی پەرتەوازەیـی و بەرژەوەنـدی تـاک حیزبـی و تاکەکەسـی ڕێگربوون لەوەی کە بتوانێت بۆ دەرەوەی خۆیان هەنگاوێک بێنە پێشـەوە. لەم قۆناغەدا هێزە سیاسیە کوردەکان لە جیاتی هەنگاونان بەرەو داڕشتنی پلانێکی ستراتیجی بۆ بەهێزکردنی پێگەی کورد و چەسپاندنی مافەکانی لە دەوڵەتە نــوێیەکەی عێراقــدا. کــورد بەرەو بەغــدا گەڕایەوەو ســـەرقاڵی بنیاتنـانەوەی عێـراق بـوو، لەڕووی نووسـینەوەی دەسـتور و بنیاتنـانەوەی پێگەکــانی دەوڵەت و ژێرخــانە ئــابوریە داڕمــاوەکەی، لەدواجــاریش ئەو دەوڵەتە گەندەڵەی لێ دروست بوو کە ئێستا دەیبینین. کە لەسـەر ئاستی نـاوخۆ و دەرەوە شـەرمەزاریە بـۆ هەمـوو تـاکێکی عێراقـی بە عەرەب و هەموو پێکهاتە نەتەوەییەکانی ترەوە هەڵگری شوناسی ئەو دەوڵەتە بێت.

لە سـاڵی ٢٠١٥شـدا دروسـت بـوونی شـەڕی داعشـیش لە عێـراق و ئـاڵۆزیە نوێیەکـانی لە نـاوچە سـوننیەکان و شکسـتی سـوپای عێـراق لەم ناوچـانە و دەسـتگرتنی داعـش بەسـەر بەشـێکی زۆر لە نـاوچە سـوننە نشینەکانی هەلێکی تری بۆ کورد هێنایە ئاراوە کە ئەویش خۆی دەبینێتەوە لە گەڕانـدنەوەی نـاوچە جـێ ناکۆکەکـان و دەسـت گـرتنەوەی هێزەکـانی پێشـــمەرگەی کوردســـتان بەســـەر کەرکـــوک و دەوروبەری کە لەڕووی ئابوریشەوە جێکەوتەیەکی گرنگ بوو، بەشداری کورد لە شـەڕی داعش و چـوونە نـاو هاوپەیمـانیەتێکی نێودەوڵەتی بـۆ شـەڕی تیـرۆر و سـەردانی

بەردەوامی بەرپرسانی وڵاتانی یەکێتی ئەورووپا و ئەمریکا بۆ هەولێر زیاتر بووە هۆی ناسینی کورد و هێزی پێشمەرگە و ئاشنابوون بەو نەتەوەیەی کە بەهۆی ڕێکەوتننامەی (سایکس بیکۆ)وە کە هەر خۆیان ئەندازیاری بوون تووشی چ نەهامەتیەک بووە، بەڵام بەداخەوە لە جیاتی ئەوەی دەسەڵاتی کوردی لەڕووی پەیوەندی دیبلۆماسیەوە هەوڵی زیاتر جوانکردنی وێنەی کورد و سیستەمە سیاسیەکەی بدات و گەشە بە دیموکراتی بدات و بە بەرچاوی سەفارەت و قونسوڵیەکانی وڵاتانەوە ئەوە نیشان بدات کە گەلی کورد و دەسەڵاتە سیاسیەکەی نموونەی گەلێکی پێشکەوتوو و شارستانین و شایەنی هەموو کۆمەکی یارمەتیدانێکن بۆ بەدەوڵەت بوون، دەسەڵاتی کوردی لە ساڵی ٢٠١٥دا جارێکی تر ئەم هەلەشی لەدەستداو گەورەترین زیانی بە کورد و هێزە سیاسیەکان گەیاند و وێنەیەکی زۆر ناشیرینی دروست کرد و وای نیشاندا کە کورد و هێزە سیاسیەکانی زۆر بێ پلان و بەرنامەن بۆ ژیانی سیاسیان و ئەمانە هێزگەلێکن کە ناتوانن بە یەکەوە بژین و لەگەڵ دیموکراسی دا هەڵبکەن و ئەمانە هیچ ڕێزێک بۆ دەنگ و کەرامەتی هاوڵاتیانیان دانانێن و خاوەنی هیچ پلانێکی ئابوری و سیاسی نین بۆ ئایندە و ئەمانە بێجگە لە بەتاڵان بردن و برسی کردنی گەلەکەیان خاوەنی هیچ بەرنامەیەکی تر نین، لەڕاستیدا هەڵوەشاندنەوەی پەرلەمان و دەست خستنە ناو قوت و مووچەی فەرمانبەران و وێرانکردنی هەموو کەرتە جیاوازەکانی حکومەت لە تەندروستی و پەروەردە و هەموو بوارەکانی خزمەتگوزاری، بوە مایەی دروستکردنی ئەو وێنە ناشیرینە، لەم کاتەدا کە دەسەڵات لە هەرێمی کوردستان ئەو وێنەیەی دروست کردووە لەبەرچاوی کۆمەڵگەی نێودەوڵەتی و ئەو دەیان سەفارەت و قونسوڵیەی کە لە هەولێردا هەیە.

لەم کاتەدا دەسەڵاتی کوردی و بە بڕیارێکی سەرۆکایەتی هەرێمی کوردستان ئەنجامدانی ریفراندۆم لە ٢٥ی ئەیلول دا هاتە ئاراوە، بۆ ئەم مەبەستەش دەستەیەک لە پارتە کوردیەکان بە ئامادەبوونی خودی سەرۆکی هەرێم سەردانی یەکێتی ئەوروپا و ئەمریکا دەکەن و داوای پشتیوانی لە ریفراندۆم و دەوڵەتی سەربەخۆی کوردی دەکەن، هەموومان بینیمان کە ئەنجامی ئەو سەردانانی چی بوو، چەند بە بایەخێکی کەمەوە سەیریان کرد، ئەمەش مانای وایە کە ئەو وێنەیەی کە دەسەلاتی کوردی لە ئەزموونی ئێستادا نیشانی ئەوانی داوە. گومان و دوودڵی بۆ دروست کردون کە ئەم سەرکردایەتیەی ئێستای کورد بتوانن رابەرایەتی دەوڵەتێکی ئارام و دیموکرات و پێشکەوتوو بکەن و ببێتە مایەی خۆشبەختی بۆ هاوڵاتیەکانی خۆی و لەگەڵ دەوروبەرەکەشدا پەیوەندیەکی سیاسی هاوسەنگ بنیات بنێت، چونکە ئەوان لە زیاتر کردنی دەوڵەتێک بۆ نەتەوە یەکگرتووەکان بیر لەوە دەکەنەوە کە ئەم دەوڵەتە چەند ئارامی سیاسی لێ دەکەوێتەوەو چەند خزمەت بە گەلەکەی دەکات.

## جەوهەر نـامیق ئەو ئۆپۆزیسیۆنەی نێـو پـارتی زوو نەخـۆش کەوتـوو پـارتی لێـی دەربـاز بـوو چیرۆکـی نەخۆشـکەوتن و دیارنەمـانی سـەرکردە رەخنەگرەکانی نێو پارتی

تیـرۆری شـاراوە یەکـێکە لە مەترسـیترین و نهێنیتـرین ڕێگاکـانی کوشتن کە لەخۆرهەڵاتی ناوین بوونی هەبووە و تا ئیستاش لەنێو زۆرێک لە پارتە گەورەکان بوونی هەیە، بەجۆرێک زۆر سـەرکردەو دامەزرێنەری پـارتێکی دەسـەڵاتدار لەناکـاو دیـار نـامێنن یـان ئەوەتـا نەخـۆش دەکەون و هێدی هێدی لەمردن نزیک دەبنەوە. مەترسـی ئەو جۆرە تیرۆرە لەوەدایە کە کەسەکان خافڵکوژ دەکرێن یان ئەوەتا بەشێوەیەکی هێواش و دەخرێنە بەر مردنێکـی ئاشـتیانە کەدوای چەنـدین سـاڵ گومـان و پەی بەمردنـی کەسـەکە دەکرێـت، هەر ئەو گومانـانەش وا لەئەردۆغـان دەکـات داوای لێکۆڵینەوەی لە تەرمی سەرۆک وەزیرانێک (تورگوت ئۆزال)بکات کە زیاتر لە ٢٥ ساڵە مردووە.

لە مێـژووی پـارتە سیاسـیەکانی کوردسـتان گومـان لەمـردن و دیارنەمـانی هەنـدێک سـەرکردەیە هەیە، جـا ئەو سـەرکردانە یـان ئەوە بەنهێنی ژەهرخوار و میکرۆبایی کراون یان ئەوا خافڵکوژ کراون، گومانی گەورەش لەسەر ئەو سەرکردانەیە کە ویستویانە بەشێوازێکی تر لە پارتی بـنەڕەت سیاسـەت بـکەن یـان ئەوا بیـر لە دروسـتکردنی ئۆپۆزیسـیۆن بکەنەوە.

لەگەڵ دروسـتبوونی ئۆپۆزیسـیۆنێک لە یەکێتـی بەسەرپەرشـتی نەوشیروان موستەفا لادان لەو ڕێرەوەی یەکێتی کەکاری لەسەر دەکات و

پاشان دروست بوونی بزووتنەوەی گۆران، دەنگۆی ئەوە دروست بوو هاوشێوەی یەکێتی لەنێو پارتی دیموکراتی پارتێکی ئۆپۆزیسیۆنی جیابێتەوە، سەرکردە دیارەکانی نێو ئەو ڕەوتەش (جەوهەر نامیق) و (فەلەکەددین کاکەیی) بوون، خودی "جەوهەر نامیق" لە ساڵی ٢٠٠٩ لەگەڵ چەندین چاودێری سیاسی و کەسایەتی لە ماڵەکەی خۆیدا دانیشتووەو باسی زەرورەتی دروستکردنی پارتێکی ئۆپۆزیسیۆنی کردووە، "جەوهەر نامیق" لای وابووە کە تەنیا بەدروستکردنی ڕەوتێکی وەها دەتوانرێت شکڵی سیستەمی دەسەلات لە زۆنی زەرد بگۆڕدرێت، هەر بەو شێوەیەش شەقامی گشتی لە هەولێر و دهۆک دەجوڵێنرێت. بەشداربوویەکی کۆبوونەوەکە و نزیک لە"جەوهەر نامیق" ئاماژەی بەوە کرد کەوا زۆر سەرکردە لەبادینان و تەنانەت کە بنەماڵەی بارزانیش پشتگیری لەو جوڵانەوانە کردووە لەوانە "نیهاد بارزانی" و خزمانی "سلێمان موعینی".

## جەوهەر نامیق و ئۆپۆزیسیۆنێکی لەدایک نەبوو!

ناکۆکیەکانی "جەوهەر نامیق" لەگەڵ پارتی دیموکراتی کوردستان لەسەر پۆست و سیادە نەبووە، بەڵکو ئەو سەرکردەیەی پارتی لایوابوو کە پێویست دەکات سیسیتەمێکی ئیداری و سیاسی لە هەرێمی کوردستان گۆرانکاری بەسەردابێت، دەسەڵاتی قۆرخکاری تاک لایەنی کۆتاییی پێبهێنرێت و چیتر زۆرینە نەبێتە قوربانی سیستەمێکی دۆگما و تۆتالیتاری، سەرجەم ئەو گۆرانکاریانەی "جەوهەر نامیق" نیازی بەرپاکردنی هەبوو لە نووسین و لێدوانەکانی دیاربوون، بەڵام پارتی هێدی هێدی ئەو پیاوەی لە دەسەڵات دوور دەخستەوە.

"د. وشیار علی" زاوای "جەوهەر نامیق" تەئکید لەسەر ئەوە دەکاتەوە کەوا "جەوهەر نامیق" مەبەستی بوو ئۆپۆزیسیۆنێکی چالاک لە زۆنی زەردا دروست بکات، لەدوای هەڵبژاردنەکانی ٢٠٠٩ ویستی بەرەسمی ئەوە ڕابگەیێنێت، بەڵام مەکتەبی سیاسی پارتی و تەنانەت خودی "مسعود بارزانی" لەگەڵی کۆبوونەوە.

باس لەوە دەکرێت دوا کۆبوونەوەی "جەوهەر نامیق" لەگەڵ "مەسعود بارزانی"دا بووە" ئیدی دوای ئەوە لە کۆتایی ٢٠٠٩ "جەوهەر نامیق" دەچێتە ئەوروپا لەوێ لەگەڵ سیاسیە کوردەکان کۆدەبێتەوە، هەر لە ئەوروپاش سەردانی ستافی کوردستان پۆست دەکات و لەوێ باس لەدروستکردنی ئۆپۆزیسیۆن دەکات.

زاواکەی "جەوهەر نامیق" دەڵێت " پارتی بەرەسمی داوای دانیشتنی لە "جەوهەر نامیق" کرد، دواتر "مەسعود بارزانی" لەگەڵی کۆبوویەوە، ئیدی دوای ئەو کۆبوونەوەیە "جەوهەر نامیق" چوویە ئەوروپا و نیازی گەڕانەوەی نەبوو، بەڵام زروفیماڵیان و هەندێک هۆکاری تر ئەویان ناچار بەهاتنەوەی کرد".

"موستەفای حسن گەورە، چاودێری سیاسی پێوایە "جەوهەر نامیق" هاوشێوەی "نەوشیروان موستەفا" نیازی دروستکردنی ئۆپۆزیسیۆن و جیابوونەوەی لە پارتی هەبوو، بەجدیش کاری لەسەر ئەوە دەکرد، پرس و ڕاویژی بەزۆر کەس کردووە، تەنانەت سەردانی ستافی کوردستان پۆست و "کەمال موختاری، لە ئەوروپا کردووە.

"موستەفای حسنە گەورە" دەڵێت "جەوهەر نامیق ویستی هەنگاوێکی لە شێوەی "نەوشیروان مستەفا" بهاوێت.. ئۆپۆزسیۆنێک دروست بکات بۆ ئەو مەبەستەش سەردانی چەندین لایەن و حیزب و ستافی کوردستان پۆستیشی کرد.. دەیویست ڕاو سەرنجی هەموان وەر بگرێت..بەلأم هەر زوو پارتی بەمەی زانی و کەوتنە دژایەتی کردنی و لە کۆتایشدا نەخۆشیان خست و کۆتایی پێهات".

"جەوهەر نامیق" وەک کارەکتەرێکی بالأی بزافی شۆرشگێری رۆڵێکی بالأی هەبووە" تەنانەت لەنێو پارتی دیموکراتی کوردستانیش کەسێک بووە کە پێگەیەکی بەرزی هەبووە, بەلأم ئەو هاوشێوەی خەڵکە نارازیە لە ئەدای سیستەم و حکومڕانی دەسەلأت ڕازی نەبووە، هەر بۆیەشە بە ئاراستەی دروستکردنی ئۆپۆزیسیۆن هەنگاوی ناوە، "د. وشیار" زاواکەی "جەوهەر نامیق" ئاماژە بەوە دەکات کە زۆر زوو "جەوهەر نامیق" نەخۆش کەوت، ئەو لەدوا ساتەکانی ژیانیشدا ئومێدی دەکرد بتوانێت بژێت و داوای لەخودا دەکرد کە ٥ ساڵی دیکە تەمەنی پێ بدات بۆ ئەوەی بەرنامەکانی بۆ گۆڕانکاری بخاتە مەیدانی جێبەجێکردنەوە، چونکە ئەو کەسێکی زۆر بوێر بوو لەنێو پارتی گەر جیابووبایەوە بێگومان هەموو دەنگە نارازیەکانی لێکۆدەبوونەوە بەلأم لەگەڵ نەخۆشکەوتنی ئەو ئۆپۆزیسیۆنەش نەخۆش کەوت.

## گومانی تیرۆر و خافڵکوژی لەنێو سەرکردایەتی پارتی:

لەگەڵ دروستبوونی پارتی و گەشەسەندنی ئەو پارتە سیاسیە هەمیشە تیرۆری شاراوە یان خافڵکوژیش هەبووە، لە شۆڕشی ئەیلول خودی "مەلا موستەفا" لە تیرۆرکردن ڕزگاری دەبێت و چەندین جاریش هەوڵی تیرۆری سەرکردەکانی تر دراوە.

لە شەستەکانی سەدەی ڕابردوو چەند سەرکردەیەکی کاریگەری شۆڕشی ئەیلول و پارتی دەکەونە بەر تیرۆر، تیرۆر لەبزافی شۆرشگێریدا بوونی هەبووە، جا تیرۆرکردنە یان دەستێکی خۆماڵی، یان بیانی بەهاوکاری دەستی ناوەوە، زۆر جاریش تیرۆرکردنەکە ئەوەندە شاراوە بووە کە لەگوماندا دەمێنێتەوە.

لەسالآنی ١٩٦٠ دوو سەرکردەی باڵای شۆرشی ئەیلول و پارتی بەناوی (سلێمان موعینی و خەلیل شەوباش ) تیرۆر دەکرێن، ئێستاکەش گومان لە نەخۆش کەوتنی دوو سەرکردەی پارتی دەکرێن کە زیاتر لە دوای پرۆسەی ئازادی عێراق وەکو دوو رەخنەگری بەهێز (جەوهەر نامیق، فەلەدین کاکەیی) دەردەکەون و دوای ماوەیەک نەخۆش دەکەون و دونیای رەخنە لەنێو پارتیدا لەگەڵ ئەوان ماڵئاوایی دەکات.

"د. وشیار" زاواکەی "جەوهەر نامیق" باس لەوە دەکات کە خودی خۆی گومانی لە نەخۆشکەوتنی "جەوهەر نامیق" وا زوو کەوتنی هەبووە" بەڵام برایەکی ئەو کە لەنەخۆشخانە لەگەڵیدا بووە وەها ئەوانی تەئکید کردۆتەوە کەوا پشکنین بۆ "جەوهەر نامیق" کراوە و دەرکەوتووە نەخۆشی ئەو شێرپەنجە بووە.

"موستەفا حسن گەورە" چاودێری سیاسی لایوایە گومان لە نەخۆشکەوتنی هەندێک سەرکردەی پارتی هەیە, بەوەی ئەوانەی رەخنە دەگرن و لە رێی پارتی و بنەماڵە لادەدەن لەپڕ دیارنامێنن یان ئەوا نەخۆش دەکەون و دەمرن.

"موستەفا حسن" دەڵێت "پارتی و مێژووەکەی پێمان دەڵێن،کە پارتی بەدرێژایی تەمەنی هەرگیز بەبێ تیرۆر نەبووە، هەر لەشەستەکانی سەدەی رابوردەو کە بە تیرۆری "سلێمانی موعینی و خەلیل شەوباش" دەست پێدەکات تا ئێمرۆشی‌لەگەڵدا بێت درێژەی هەیە.. پارتیی هەم بە ئاشکرا نەیارانی سیاسی خۆی بە تیرۆر و پیلانی قێزون تیرۆر کردەوە، هەم بە نهێنی کردویەتی. پارتی حیزبی بنەماڵەیە، هەرکاتێک هەرکەسێک هێڵی سوری بەرامبەر بنەماڵە بەزاندبێ و بوبێتە مەترسی بۆ سەر بەرژەوەندیان لەناویان بردووە، بەشێکیش لەم تیرۆرانەی پارتی؛ بۆ خاتری داگیرکەرانی کوردستان بووە، زیاتر تێکۆشەرانی پارچەکانی تری کوردستان وەک، رۆژهەلات و باکور ئێستاش رۆژئاوای کردۆتە ئامانج. هەندێکیشیان ئەندام کادیری خۆی بوون بەجۆرێک لە جۆرەکان لەسیاسەتی پارتی و بنەماڵە هەڵگەڕاونەوە، هەر ئەندامێکی بالآی پارتی کاتێک دەیەوێ لە پارتی بێتە دەر یاخود هەنگاوێکی تر بهاوێت، یاخود بچوکترین دژایەتی سیاسەتی بنەماڵەی بارزانی بکات. ئەوا دوای ماوەیەک نەخۆش ئەکەوێت و دواتر ئەمرێت. داخەکەم ئێمە لە دەڤەرێکدا دەژین کە پارتی تێدیا حاکمە بچوکترین لێکۆڵینەوە بۆ ئەو جۆرە تیرۆرە شاراوانە ناکرێت. پارتیش هەموو جارێک وەک بەرزەکی باناب بۆی دەردەچێت، هەڵبەتە گەلێک شتی هەن، تەواوی ئەو راپۆرتو بابەتانە کەلە سایتی

كوردستان پۆست و كەناڵەكانی تری ڕاگەیاندن بڵاوكرانەوە، ڕاستی ئەوە دەسەلمێنن كە بنەماڵەی بارزانی سەردەشتیان تیرۆر كردەوە بە بیانووی ئەوەی كە گوایە سەردەشت باسی ناموسی بنەماڵەی بارزانی كردووە، هەموو بەڵگەكان دژی بنەماڵەی بارزانین لەسەر پرسی تیرۆر كردنی سەردەشت عوسمان، بەڵام لەم هەرێمە كێ دەستی بە بەڵگە ڕادەگا. لەوڵاتێكدا یاسا سەروەر نەبێت و شەفافیەت نەبێت، دەرگای دادگاو فەرمانگەكان كراوە نەبن بە ڕوی میدیا و ڕۆژنامەنوس چۆن بەڵگەت دەست دەكەوێت.. كاتی خۆی لە سایتی كوردستان پۆست تەنانەت شێوەی كوشتنەكەی و ناوی بكوژەكیمان بڵاو كردەوە.. دواتر ئەو كەسەی كە سەردەشتی فراند، لە شاری موسڵ هەر بەدەستی پاراستن تیرۆر كرایەوە... تەوای ئەو بەڵگانە لە كوردسستان پۆست پارێزراون".

دەركەوتنی "جەوهەر نامیق" وەكو كاراكتەرێكی ڕەخنەگر و هەنگاونان بۆ دروستكردنی یەكەم ئۆپۆزیسیۆن ئەوەندە كاریگەریان دەبوو كە "نەوشیروان موستەفا" بەسەر یەكێتیدا هێنا، بۆیە پارتی لەجوڵەی ئەو و هاوشێوەكانی دەترسا، بەڵام تا ڕێگا كە پارتی لەو ترسە دوورخستەوە نەخۆشكەوتنی خودی "جەوهەر نامیق" بوو كە مەجالی ئەوەی پێنەدا بەرنامە و هەیكەلی ئەو ئۆپۆزیسیۆنە ئاشكرا بكات، پرسیار ئەوەیە ئاخۆ ئۆپۆزیسیۆنەكەی كە دەیویست لەپارتی جیابێتەوە هەر "جەوهەر نامیق" بووە یان ئەوە دەیان سەركردەی تربوون، بەڵام هێشتا بوێری ئەوەیان نەبووە وەكو "جەوهەر نامیق" بكەن، یان ئەوە ئەو ئۆپۆزیسیۆنە ڕۆژێك خۆی دەردەخات گەر ئاكامی ئەویش نەخۆش كەوتن نەبێت.

# سەرچاوەکان


## کتێب:

١. **فێدرالیزم لە وڵاتانی فرە نەتەوەدا**، ناوەندی لێکۆڵینەوەی ستراتیژی حیزبی دیموکراتی کوردستانی عێراق، پاییزی ٢٧١٢.

٢. **کۆنفیدرالیزمی دیموکراتیک**، لە بڵاوکراوەکانی کۆنگرەی گەل، ن: ماهر ئاتەکان، و/ لوقمان عبدالله، ٢٠٠٨.

٣. **فیدرالیزم و ئۆتۆنۆمی**، (لێکۆڵینەوەیەکی بەراوردکار)،بڵاوکراوەی مەکتەبی بیر و هۆشیاری،٢٠٠٢.

٤. **خێڵ و نەتەوە لە تەرازووی دەسەڵاتی کوردیدا**،نەوزادی موهەندیسی،٢٠١٢.

٥. **ریفراندۆمی کوردستان بەپێی یاسا نێو دەوڵەتیەکان(ڕیفراندۆمی ڕاستەقینە و ڕیفراندۆمی عەبەسی)**، ناوەندی توێژینەوەی ستاندەر، ئایار،٢٠١٧.

٦. **لەبڕیاری ڕیفراندۆمەوە بۆ شازدەی ئۆکتۆبەر**، (تویژینەوەیەکی مێژوویی سیاسیە)، ناوەندی توێژینەوەی ستاندەر، کانوونی یەکەمی، ٢٠١٨.

٧. **ناسنامەی کەرکوک و ناوچە دابڕێنراوەکان بەپێی بەڵگەنامە نێودەوڵەتیەکان**، مەسعود عبدالخالق، پێداچوونەوەی زیرەک ئەحمەد رەحمان، چاپخانەی موکریان، هەولێر، ٢٠١٣.

٨. **دەوڵەتی سەربەخۆی کوردستان لەناوەوە بونیادنان، لەدەرەوە دانپیانان**، د.بورهان أ. یاسین، د.سەردار عەزیز.

## چاوپێکەوتن:

١. **فەرماندەی هێزەکانی هەشتا کە نەیویست ناوی بڵاوبکرێتەوە**، میحوەری پێنجی ڕۆژئاوا، ناحیەی پردێ، ئاڵتون کۆپری، ٢٠١٧/١١/١٠.

٢. **چاوپێکەوتن لەگەڵ وەستا ڕەسول**، گوندی مەرزیخە، ناحیەی شوان، ٢٠١٧/١١/٧، چاوپێکەوتن لەگەڵ هیوا ڕەش، ناحیەی تەق تەق،٢٠١٧/١١/٦.

٣. مەسعود بارزانی لەچاوپێكەوتنێكدا ناسنامەی میلەت لە گۆڤاری نیوزیوک وەریگرتووە دەڵێت" ئەوەی لەناوچەكانی كەركوكدا ڕوویدا بەمەبەستی گۆڕینی دیمۆگرافیا بوو، كە هەمیشە ناتوانرێت ناسنامەی ئەو شارە بگۆڕن و كشانەوەمان بۆ ئەوە بووە خوێن نەڕژێت، ئەو هێرشە لەژێر فەرماندەی ئێرانیەكاندا بووە.

٤. چاوپێكەوتن لەگەڵ حەمە ڕێگر، میحوەری پێنجی ڕۆژئاوا، ناحیەی پردێ، ئاڵتون كۆپری، ٢٠١٧/١١/١٠.

٥. **چاوپێكەوتن لەگەڵ مام سیامەند**، ناوی تەواوی حەمە رەزا فەتاحە لەدایكبووی ١٩٥٧ی گوندی تیمارۆكی دەشتی كۆیە، لەساڵی ١٩٨١ پێشمەرگەیە، ئێستا فەرماندەی لیوای ١٢٦ی هێزەكانی حەفتای ی.ن.ك. كۆیە، ٢٠١٧/١١/٢٥.

٦. **چاوپێكەوتن لەگەڵ وەستا ڕەسول**، گوندی مەرزیخە، ناحیەی شوان، ٢٠١٧/١١/٧، **چاوپێكەوتن لەگەڵ تالیب مام فاروق**: گوندی ئیلنجاغ، ناحیەی شوان،٢٠١٧/١٠/٢٤، هـ‌م.ف، فەرماندەی پێشمەرگە لەباشووری كەركوك، ناحیەی شوان، ٢٠١٧/١٠/٢٧، یاسین دەربەندی، گوندی ئیلنجاغ، ناحیەی شوان، ٢٠١٧/١٠/٢٤.

٧. **فەرماندە لاهوری شێخ جەنگی دەڵێت**: ماكگۆرك پێی وتین دەستپێشخەری شەڕ دژی سوپای حكومەتی عێراقی مەكەن، تا چواری بەیانی لەگەڵ ماكگۆرك لەسەر هێل بووم ()، وتەی لاهوری شێخ جەنگی لەڕێگەی تەلەفۆنەوە، تەلەفیزیۆنی ئاسمانی گەلی كوردستان، ٢٠١٧/١٠/١٦.

٨. **چاوپێكەوتن لەگەڵ یاسین دەربەندی** (یاسین مەولود عولا، لەدایكبووی ١٩٧٦ی گوندی دەربەندی سەر بەناحیەی دێگەڵەیە، فەرماندەی فەوجی سێ لە لیوای ١٤ی هێزەكانی حەفتایە، گوندی ئیلینجاغی ناحیەی شوان،٢٠١٧/١٠/٢٤.

٩. **چاوپێكەوتن لەگەڵ وەستا ڕەسول**، (رەسول عومەر لەتیف لە گوندی مەرزیخەی ژوورو لە ساڵی ١٩٦٢ لەدایك بووە، چەندین پلەی فەرماندەی لە

نێـو ڕیزەكـانی ی.ن.ك. دا بینیـوە، لـە ئێسـتادا ئەنـدامی سـەركردایەتی و فەرماندەی میحوەری چواری باشوری كەركوكە، گوندی مەرزیخە، ناحیەی شوان، ٢٠١٧/١١/٧.

١٠. **چاوپێكـەوتن لەگـەڵ حەمـە ڕێگـر**، (حـاجی محمـد لەسـاڵی ١٩٦٩ لەقـەزای چەمچـەماڵ لـەدایك بـووە، لـە مـانگی ١٢ی ١٩٨٥ پەیوەنـدی بـەڕیزەكانی پێشمەرگەوە كردووە، ئێستاش جێگری میحوەری پێنجی ڕۆژئاوای كەركوكە، میحوەری پێنجی ڕۆژئاوا، ناحیەی پردێ، ئاڵتون كۆپری، ٢٠١٧/١١/١٠.

١١. س.ح.ن. ،گوندی ئیلنجاغ، ناحیەی شوان،٢٠١٧/١٠/٢٤.

١٢. **دیداری تایبەت لەگەڵ بەڕێز سەرۆك كۆمار جەلال تالەبانی.**

١٣. **چاوپێكەوتن لەگەڵ هیوا ڕەش** (هیوا عەبدوڵلا ئەحمـەد لـە ١٩٦٤ لەگوندی تـەق تـەق لـە ناوچـەی قـەزای دبس لـەدایك بـووە، لـە ١٩٨٦ وە بێ دابڕان پێشـمەرگەی یـەكێتی نیشـتمانی كوردسـتان بـووە، ئێسـتا جێگری میحـوەری چواری كەركوكە، ناحیەی تەق تەق، ٢٠١٧/١١/١٦.

١٤. **تاریق كانی ڕەشی** (تاریق نامق سلێمان لەساڵی ١٩٧٣ لەگوندی كانی ڕەشی دەشتی كۆیە لەدایك بووە، ئێستا جێگری فەوجـە لـە لیـوای ١١٤ی هێزەكانی پێشمەرگە، گوندی ئیلنجاغ، ناحیەی شوان، ٢٠١٧/١٠/٢٤.

١٥. **سلاح زانا:** پێویستە دیوە باشەكەی ریفراندۆم بنرخێنرێت، پێگەی ئەلیكترۆنی هەشـــــتە، تشـــــرینی دووەم٢٠١٧، بڵاوكراوەتـــــەوە، ئێمـــــە لـــــە .www.standard.kurd.net. ٢٠١٨/١١/١٨

١٦. **چاوپێكـەوتن لەگـەڵ عوسـمان بانیمـارانی** (نـاوی تـەواوی عوسـمان عبدالله قادرە) لەساڵی ١٩٥٤ لەگوندی ئیلنجاغی دەشتی كۆیە لەدایك بووە و لەساڵی ١٩٨٢ پێشـــــمەرگەیە، ئێســــتا خانەنشـــــینی پارلـــــەمانی كوردســــتانە، كۆیە،٢٠١٧/١١/٢٥.

١٧. **چاوپێكەوتن لەگەڵ تالیب مـام فـاروق:** (تالیب فـاروق محمد عـەلی لەسـاڵی ١٩٦٨ لەگوندی تولكی ناوچەی شـێخ بزێنی ناحیـەی شـوان لـەدایك بـووە لـە ١٩٨٣/٩/١٣ پەیوەنـدی بـە هێزەكـانی پێشـمەرگە لـە تیپـی ٢١ كەركوكـەوە

کـردووە تـا ئێسـتا جێگـری لیـوای ١١٤ی هێزەکـانی پێشـمەرگەیە، گونـدی ئیلنجاغ، ناحیەی شوان، ٢٠١٧/١٠/٢٤.
١٨. **چاوپێکـــەوتن لەگـــەڵ ئـــاڵا تاڵـــەبانی**، تەلـــەفزیۆنی ئاســـمانی گـــەلی کوردستان،٢٠١٧/١٠/١٦.

19.www.washgtonpost.com%2famphtmk%2world%2middle east %2 firaqis-seize-military.base-oilkurdish forces near kerkok 25/11/2017

20.miletpress.com/Detail.aspx.jimare=50102.18/11/2017

21.www.nrttv.com/details.aspx.jimare89168,18/11/2018

22.www.hawpshti.com/ku/?p=14681

23.www.livinpress.com/n/dreja.aspx?/hawal.18/11/2017

24.www.gulanmedia.com/19/11/2017

25.www.radionawa.com/Arabic/wiew.aspx20/11/2017

26.www.rudaw.net/sorani/middleeast/Iraq/2017/12/16

27.www.mtmana.com/43491?p-2017/12/16

28.http://www.skurd.net/old1/index.php/2014-07-26-15-02-03/888-2014-11-17-15-12- 33>
http://www.kportal.co/detailsWtar.aspx?NusarID=40&Jmare=80
http://www.nrttv.com/birura-details.aspx?Jimare=7231
http://skurd.net/2017/07/09/%D9%BE%D8%B1%D8%B3%D9%89-

%D8%B1%DB%8C%D9%81%D8%B1%D8%A7%D9%86%D8%AF%DB%86%

# ناوەرۆک